

# گۆزەی شکاو


نووسینی: محمد فەتحوڵڵا گولەن
وەرگێڕانی: دەستەی وەرگێڕانی دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان
چاپی یەکەم: حوزەیران - ٢٠١٥
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٣٦٤)ی ساڵی (٢٠١٥)ی پێدراوە
تیراژ: ٥٠٠٠

شوێنی چاپ
Neşe
Neşe Matbaacılık - İstanbul - TURKEY
+90 212 886 83 30
www.nesematbaacilik.com





دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان
www.irfanpublishing.com

گوندی ئینگلیزی خانووی ژمارە ٩ / هەولێر
+964 (0) 750 713 80 00

# پێڕستی بابەتەکان

**ناساندن**........................................ ١١

## ژیانی پەرستشمان

**نهێنی بەندایەتی** ........................................١٦
بێ چاوەڕوانی بوون لە پەرستشەکاندا ........................٢١
شیرك و ڕیا لە پەرستشدا..........................................٢٣
ماندوێتی ................................................................٢٤
بێ هەیەجان و خرۆشان، گەشتن بە قووڵایی مەحاڵە.............٢٥
دوو وتەی حەسەنی بەصری و ئەوەی هێنایە یادەوە...............٢٥
پەرستشی بەئیخلاس و دزەکانی گوێگرتن .......................٢٧

**نوێژ**........................................................ ٣١
چوارچێوەکان دەبێت هەڵگری واتا بن..................................٣١
خشوع و ملکەچی لە نوێژدا.........................................٣٣
دۆزینەوەی نوێژ.........................................................٣٥
دالآنی نوێژ ..............................................................٣٧
نوێژی بەکۆمەڵ ........................................................٣٨
جیاوازی نیشاندان لە نوێژدا ...........................................٣٩
یادگارییەك و هۆشیاربوون سەبارەت بە نوێژ...........................٤١
سوجدە و هەستانێکی پڕ لە هەست...................................٤٢
ناسکیی دڵ و نوێژ .....................................................٤٣
شەیتان و دزینی نوێژ ...................................................٤٩

**دوعا** ........................................ ٥٢
باوەڕهێنان بە دوعا ........................................ ٥٢
دوعا و تامەزرۆیی پەرستش ........................................ ٥٣
فاتیحە جوانترین دوعایە ........................................ ٥٧
یادی خوا و دوعاکردن ........................................ ٥٧
ئەی بەدیهێنەری بەخشندە و پەروەردگاری میهرەبانم! ........................................ ٦٢

**ئەوراد و ئەزکار** ........................................ ٦٧
فرە یادکردنی خوا ........................................ ٦٧
ئیسمی ئەعزەم ........................................ ٦٨
نابێت هەرزان مامەڵە بین بەرامبەر گەنجینە شاراوەکان ........................................ ٧١
دەربارەی "سەڵات و سەلام" ........................................ ٧٤
سەڵاوات دان ........................................ ٧٦
سەرمایەیەکی بچکۆلە ........................................ ٧٨
بوار نەدان بە بێ ڕێزی ........................................ ٨٠
ئوستاز و ئەوراد و ئەزکار ........................................ ٨١

## جیهانبینی

**بەرزکردنەوەی ناوی (الله) یاخود ئەرکە پیرۆزەکە** ........................................ ٨٨
ئەرکی پیرۆز ........................................ ٨٨
تەنها ئاواتەکەی ئاسۆی بیرم، تاقانە ئەوینەکەم ........................................ ٩٣
هەوڵی سەرسامکەری مسوڵمانە پێشینەکان ........................................ ٩٥
ئەوان دڵەکانیان فەتح کرد ........................................ ٩٧
حەزرەتی ئەبو ئەییوبی ئەنصاری ........................................ ٩٧

حەزرەتی ئەبو طەڵحە.......... ٩٨
ئوم حەرامی دایکمان.......... ٩٩
سەبارەت بە باوەڕدارانی ئەمڕۆ.......... ١٠١
هەستی صەحابە ئاسا.......... ١٠٢
ئەرکی بانگەواز و پاراستنی خوایی.......... ١٠٤
بانگەواز و گەیاندن بەرپرسیاریەتییەکی زۆر سەختە.......... ١٠٥
مەرجەکانی مەیدانی ئەرك.......... ١٠٧
مژدەی نێو ئایەتەکە.......... ١٠٩
سەروەرمان و میراتگرانی بانگەوازی پێغەمبەرایەتی.......... ١١١
بزاوتن و ژیانی دڵ.......... ١١٧

**ڕۆحی خۆتەرخانکردن.......... ١٢٢**
ئیخلاس و خۆتەرخانکردن.......... ١٢٢
ئامانج و ئیستیقامەت.......... ١٢٣
بزاوتی خۆبەخشان.......... ١٢٤
ئەو ئامانجەی لە پەروەردە و فێرکردن چاوەڕێ دەکرێت.......... ١٣٠
چۆنێتی بەکردەکردن و بەرجەستە کردن.......... ١٣٣
پاراستنی زیندوێتی ڕۆحمان.......... ١٣٧
کەسێتیی مەعنەویی.......... ١٤٦
هاوسەنگیی نێوان هەوڵدان بۆ پەیداکردنی ڕۆزی
لەگەڵ خزمەتکردنی ئاین.......... ١٥٥
دووبارە ڕێکخستنەوەی سفرەکان.......... ١٦٢
خۆزگە!.......... ١٦٢

## میکانیزمی نەفس و ویژدان

**ئایا دەکرێت نەفس بە تێپەڕبوونی کات بەهێز بێت؟**........................ ١٧٠
تەڵەکانی شەیتان........................................... ١٧٦
جەنگ لەگەڵ لاوازییەکانمان ........................................ ١٧٧
ئایا گوناه دەبێتە هۆکاری خێر؟......................................... ١٧٧
خەیاڵی جیاواز بوون لە شەیتانەوەیە ........................................ ١٧٧
ڕۆحە نەخۆشەکان........................................... ١٧٨
مرۆڤ و لاوازییەکانی ........................................... ١٧٩
ڕۆحە نەخۆش و بەدگومانەکان........................................... ١٨٠
دواکەوتنی سزاکان........................................... ١٨٢
ئارامگرتن، بەتایبەت گەر ئەو شتەی
داوای دەکەیت زۆر گەورە بێت........................................... ١٨٣
ئیرادە........................................... ١٨٣
دوو دیوەکەی تەقوا........................................... ١٨٤
هاوئاهەنگیی ژیانی دەروون و دەرەوە و هەڵوێست وەرگرتن
لە بەرامبەر گوناهدا ........................................... ١٨٦
لێپرسینەوە لەخۆمان، نەك لە کەسانی دی........................................... ١٨٨
فەراهەم نەکردنی مافی ژیان بۆ هەڵەکان........................................... ١٩٠
وەستانەوە لە بەرامبەر دارمانی دەرەکی ........................................... ١٩٢
شەیتان........................................... ١٩٥
غەیبەت........................................... ٢٠٠
شیرکی پەنهان........................................... ٢٠٣
بە شوێن گەشەکردنەوە بوون........................................... ٢٠٦

# ژیانی دڵ و ڕۆح

**خاكیبوون**........................................................ ٢٠٨
دڵنیایی ................................................... ٢٠٩
ئیستیقامەتی دڵ................................................ ٢١٠
ئاوێنەی مرۆڤ................................................ ٢١٥
"قەبض و بەسط" لەگەڵ "خەوف و ڕەجا"........................ ٢١٦
جێنەهێشتنی دەرگای ئیلاهی تەنانەت لە حاڵی قەبضیشدا....... ٢١٧
هۆشیاربوون لە قەبضدا .................................... ٢١٨
"قەبض و بەسط" و کەسایەتیی مرۆڤ ........................ ٢١٩
سنورەکانی قەبض و بەسط.................................... ٢٢٠
چەند مرواریەك................................................ ٢٢١
مەشیئەتی ئیلاهی و جیهانەکانی عەدەم......................... ٢٢٢
گومانباشی بەرامبەر پەروەردگارمان.......................... ٢٢٧
گومانی باش بردن و پەنا بردن بۆ ڕەحمەتی ئەو.............. ٢٣٠
ئاست ...................................................... ٢٣٣
ئارەزووی ڕومەمان............................................ ٢٣٦
واز لە دونیا هێنان لە دڵدایە، نەك لە دەستخستند ........... ٢٣٧
ڕۆزی لە دەستی خوادایە........................................ ٢٣٨
گۆزەی شکاو................................................... ٢٣٨
لە خۆ پرسینەوە و گومانی باش بردن.......................... ٢٤٢
گەنجینەی شاراوە (كنز المخفي) .............................. ٢٤٤
ئایا نەفسی ئێمە و نەفسی سەروەرمان هەریەك
خاوەنی تایبەتمەندی جیاوازن؟ ................................ ٢٤٥

ئایا دەکرێت بەسەر ئەم بارە سەختەدا سەربکەوین؟ ............... ٢٤٦
ماهییەتی مرۆڤ لە فریشتەکان باڵاترە........................ ٢٤٧
لا موجود الا هو ........................................ ٢٤٩
ئایا خوا لە دڵدا دەدۆزرێتەوە.............................. ٢٥٠
گەنجینەی شاراوە (کنز المخفي) .......................... ٢٥٠
لەم جیهانەشدا "حیکمەت - دانایی" لە پێش
"قودرەت - دەسەڵات و توانایی"دایە ....................... ٢٥١

**هەندێک لەو سەرچاوانەی سوودیان لێ وەرگیراوە.................. ٢٥٣**

# ناساندن

ئەو ژیانە سەختەی مامۆستا فەتحوڵڵا گولەن بە هۆی کێشەی تەندروستیەوە لە وڵاتی غوربەت و لەژێر چاودێریی پزیشکدا بەسەری دەبات، ئەوی لە خوێندنەوە و بیرکردنەوە و بەشکردنی بیروبۆچوونەکانی دانەبڕیووە. سەرباری هەموو نارەحەتییەك گەر تەنها بۆ چەند خولەك هەست بە باش بوون بکات، وەڵامی ئەو پرسیارانە دەداتەوە کە ئاڕاستەی دەکرێن.

ئەم وتارە پڕ بەرەکەتانە کە لە سەرەتادا لەسەر پەڕەکانی ئینتەرنێت بڵاوکرانەوە و بوونە مایەی گرنگی پێدانێکی زۆری خوێنەران، لە ژێر ناوی "گۆزەی شکاو"دا کۆکرانەوە. بۆچی گۆزەی شکاو؟ مامۆستا دیوانی شیعرەکەشی ناوناوە "سازی شکاو". لە ناخی ئەم چواندنانەدا خاکیبوونێکی قوڵ حەشاردراوە. لە سەرەتادا پێویستە ئەوە ببینین. پاشان ئازاری بیرێك کە خاوەنەکەی ناتوانێت بە تەواوەتی دەری ببڕێت. ئایا دەکرێت ئەو ئاوازەی بە سازێکی شکاو دەژەنرێت، ئەو هەستانە بە تەواوی دەرببڕێت کە لە قوڵترین گۆشەکانی دڵەوە هەڵدەقوڵێن؟ ئەوانەی لەمە تێدەگەن تەنها ئەو فاتیحانەی دڵن کە لەو گۆشە قوڵانەدا لە گەشت و گەڕاندان.

"گۆزەی شکاو" چواندنێکی زۆر گرنگە، سیمبولێکە پێویستە لەسەری بوەستینەوە و لێی رابمێنین... ئاماژەیە بۆ ئاوێکی حەیات کە تەنها دەست بە چۆڕاوێکی دەگات. لە ڕوانینێکی ڕووکەشدا تەنها چۆڕە ئاوێکی کەمە. بەڵام لە ڕاستیدا ئەمە نیشانەیەکە بۆ ئەو کەسانەی دەیانەوێت ڕێ بدۆزنەوە و بە حەقیقەت بگەن. جا کاتێك لەم ڕوانگەیەوە تەماشا دەکەیت، لە پشت ئەو سیمبولەوە کە نوسەر بە لەخۆبوردمیی و خاکیبوونەوە ڕازاندوویەتیەوە، پێویستی و ئاتاجیی خوێنەر بەدەر دەکەوێت.

ئەوانەی ئەهلی دڵن چاك دەزانن كە ئەو هەڵكشان و داكشانانەی لە قوڵترین گۆشەكانی دڵەوە هەڵدەقوڵێن، تەنها دەتوانرێت لە شێوازی هێما یاخود ئاماژەیەكدا كە گیانی گوزنگرەكەی دەهەژێنێت دەرببڕرێن. ئەوەتا ئەم خەمە موقەددەسە لەسەر زاری مەولانادا دەبێتە نەیەكی ناخسوتاو و ئەویش لە ڕێیەوە فووی حەسرەت بە ڕۆحی بوونەوەراندا دەكات. حەسرەتێك كە لە بنەڕەتدا ئارەزووی ویساڵە. شنەی دڵە و تامەزرۆیی گەڕانەوە بۆ "نیشتیمانی ڕاستەقینە" دەردەبڕێت. ئەم ژانە هەرگیز فەریادی جودایی نییە. سوارچاكانی ڕۆح، ئەوانەی ساتی دڵ شكان دەڵێن "دەردەكەم بۆم بووەتە دەرمان"، هەرگیز سكاڵا لە حاڵی خۆیان ناكەن. چونكە ئەم ناڵە موقەددەسە، ئاسوودەییە لەنێو خەمدا و ئازارە لەنێو دڵنیاییدا.

"گۆزەی شكاو" سیمبولێكی نوێی ئەو هەستانەیە كە بەتەواوی لە زارەوە باڵیان بۆ ناگیرێت و ناوترێن. ئەم كتێبە سایەی غوربەت باڵی بەسەردا كێشاوە. خۆی لە خۆیدا قۆناغێكی نوێی بەخشیوەتە ئەو ڕۆژە پڕ حەسرەتانەی لەگەڵ تێكچوونی باری تەندروستیی مامۆستادا دەستیان پێكردووە. كاتێك ئەم كتێبە دەخوێننەوە بەردەوام خۆتان لە نێو ئەو خەمەدا دەبیننەوە و ناختان دەهەژێت... وەك خوێنەرێك، "گۆزەی شكاو" هەندێك جار دەتبات بەرەو لای خوڕەی خەمگینی ڕوباری ڤۆلگا، گاهێك دەتباتە چیای ئەرەك و گوێت لە دەنگدانەوەی هاواری "دەعواكەم!"ی بەدیعوززەمان دەبێت ئەو كاتەی پێی هەڵدەكەوێت و خەریكە بكەوێت، گاهێكی دیش دەتباتە چیای ئارارات و ئەو ڕستەیە تێیدا دەنگ دەداتەوە كە سەعیدی منداڵ لە خەونیدا لە بەرامبەر سامی شەقبوونی چیاكەوە بە دایكی دەڵێت "دایە مەترسە! ئەمە فەرمانی جەنابی حەقە، ئەو میهرەبان و دانایە". لە لایەكی دیكەشەوە ئەم كتێبە لە باخچەی تەسەوفدا گوڵ دەچنێت و هەمووانیش بەرەو ئەو جوانە بانگ دەكات كە جوانیی بە گوڵانی ئەو باخچەیە داوە.

"گۆزەی شکاو" بە خراپە باسی هیچ بیرێك ناکات، گیرۆدەی بابەتە سادەکانی رۆژ نابێت.. بەڵکو کۆمەڵێك وتار و گفتوگۆیە لە ساباتی ئەو سەرچاوانەدا کە کرۆکی ئایین پێك دەهێنن، لە پێش هەمووشیانەوە قورئان و سوننەتی پیرۆزی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمْ). بابەتەکانیش بە جۆرێك باسکراون کە هەمووان بتوانن بە گوێرەی ئاست و ئاسۆی بیریان سوودی لێ ببینن.

ئەم کتێبە کە بەشێکە لە زنجیرەیەك کتێب بە ناوی "گۆزەی شکاو"، بۆشاییەکی گەورەی فیکریی لە ئەمرۆی جیهانی ئیسلامیدا پڕدەکاتەوە، رۆڵی رێبەرێك دەبینێت بۆ ئەو باوەڕدارانەی دەیانەوێت بە گیانی ئوممەتێکی مەزن و مێژوویەکی پڕ شانازییەوە لە جیهانی نوێی ئەمرۆ تێبگەن و دروست هەنگاو هەڵگرن.

"گۆزەی شکاو" نموونەی بیری میانڕەوە. بە دەربڕینێکی ڕوونتر نموونەی بەرجەستەبووی "ڕێگە ڕاستەکە"مان دەخاتە پێش چاو. بانگمان دەکات بۆ ئەوەی لە سەر تا پێ چاو بە خۆدا بخشێنینەوە و موحاسەبەی نەفسمان بکەین.

لە لایەك بە مژدەکانی هەوێنی تاسەمەندیی خزمەت لە گیانماندا دەنێتەوە و لە لایەکی دیکەوە بیرمان دەخاتەوە و دڵمان ڕادەچڵەکێنێت کە دادگای ئیلاهی لێپرسینەوە لەگەڵ یەك بە یەکی مرۆڤەکاندا دەکات. ئەو مردن و زیندووبوونەوانەی لە نێوان ترس و ئومێددا بەسەرمان دێت، زیاتر لە پەروەردگارمان نزیك دەکاتەوە؛ ئەمانە دەبنە هۆی ئەوەی ئێمە پەناببەینە بەر شەفەقەت و میهرەبانی و کۆمەکی ئەو. ئەو ئاسودەییەی کە لە پەنابردنە بەر ئەوەوە دەست دەکەوێت لە نێو دێڕەکانی ئەم کتێبەوە دەڕژێت بەسەر دڵە برینداره‌کانماندا و بەرەو ئاسۆ نوێیەکان دەمانبات.

# نهێنی بەندایەتی

لە ڕووکردنە جەنابی حەق و پەرستش و دوعاکردندا نهێنییەك هەیە بە ناوی نهێنی بەندایەتی (سر العبودیة). واتە دەکرێت بەندە لەو واتایانەی لە پەرستشەکاندا هەیە تێنەگات، بەڵام تەنها لەبەر خاتری ئەوەی کە خواوەند فەرمانی پێکردووە هەڵدەستێت بە ئەنجامدانیان و بەم شێوەیەش نیشانی دەدات کە بەندەیەکی گوێڕایەڵ و ئامادەی فەرمانە. لە ڕێی ئەم بەندایەتییەشیەوە دڵ و ڕۆح و هەست و سیرڕی تێراو دەبێت و ڕەزامەندیی خوا بەدەستدەهێنێت. گەر مرۆڤ بیریش بکاتەوە دەتوانێت ببینێت لە ڕێی بەندایەتیکردنەوە کۆمەڵێك حیکمەت و سوودی دیکەش بێجگە لەمانە وەدەست خۆی و مرۆڤایەتی و بگرە جیهانیش دەخات.

بۆ نموونە، ژیری باش دەتوانێت دەرك بەوە بکات کە زەکات پردێکی ئیسلامییە بۆ بەیەکگەیاندنی دەوڵەمەندان و هەژاران و پتەوکردنی پەیوەندیی نێوانیان و ڕێگرتن لە دووبەرەکی و لێکترازانی کۆمەڵایەتی. یاخود ئەوەی حەج وەك گەشتێك و دەرفەتێك بۆ پاکبوونەوە، ئارامی دەدات بە مرۆڤ و سەرلەنوێ تاك بە تایبەتمەندییەکانی کەسێتیی خۆی ئاشنا دەکاتەوە. لە هەمان کاتیشدا حەج وەك کۆنگرەیەکی ساڵانەی جیهانی ئیسلامییە. یاخود دەتوانێت ئەوە ببینێت

کە ڕۆژوو نەفس فێری گوێڕایەڵی دەکات و خۆپارێزیشە بۆ جەستە و مایەی تەندروستییەتی.

بەڵام باوەڕدار هەرگیز نابێت پەرستشەکانی بەم سوود و قازانجانەوە ببەستێتەوە، چونکە ئەوە دەزانێت کە بنەمای پەرستشەکانی "التعبدیة - تەعەبودییەت"ە، واتە ئەو بێ ڕەچاوکردنی ئەوەی حیکمەت و سوودەکانی ئەم کارە چییە، جا تێبگات لێیان یاخود نا، بەو شێوەیەی فەرمانی پێکراوە و بۆی ڕۆشن کراوەتەوە بەجێیاندەهێنێت و باوەڕیشی وەها دەبێت کە هێشتا زۆر حیکمەتی تر لەو کارەدا پەنهانە کە عەقڵی کۆتای ئەم پێی نەگەشتووە. گەرچی بۆ هەندێ بەشی تایبەتی نێو نوێژیش، هەروەك زەکات و ڕۆژوو و حەج، کۆمەڵێك حیکمەت بە بیردا دێن، وەك تایبەت بوونی نوێژەکان بە کاتێکی دیاریکراو و جیاوازیی ژمارەی ڕەکاتی نوێژەکان و جووڵە جیاوازەکانی وەك ڕکوع و سجود و هەستانەوە، بەڵام باوەڕدار پێش لێکۆڵینەوە لە هەر حیکمەتێك ئەمانە ئەنجام دەدات چونکە پەروەردگارمان بەم شێوەیە فەرمانی پێکردووین، لە واژەوانی فیقهدا بەم جۆرە تێگەشتنە لە پەرستش دەوترێت "تەعەبودییەت".

دیوێکی تری بابەتە تەعەبودییەکان ئەوەیە کە: لە نێوان ئەو کارەی ئێوە ئەنجامی دەدەن و ئەو شتانەی پاش ئەنجامدانی کارەکە لەلایەن جەنابی حەقەوە پێتان دەبەخشرێت، ناتوانرێت پەیوەندییەکی وەك پەیوەندی نێوان هۆکار و دەرەنجام "تەناسوبی عیلیەت" بدۆزرێتەوە، بۆ نموونە نوێژێك دەخوێنیت هێندە دەسکەوتی دونیایی و قیامەتی، قەلبی و ڕۆحی، عەقڵی و حیسی بەدەست دەخەیت کە خۆشت سەرسام دەبیت و دەڵێیت "ئەمە چۆن ڕوویدا؟!". لێرەدا خاڵێکی ناسك هەیە، تەعەبودییەت تەنها بۆ تەعەبودییەت کار دەکات. واتە هەمیشە کار لەسەر ئەوە دەکات کە ئەو هەستی پەرستش کردنە پەرەپێبدات کە تەنها لەبەر خاتری خودایە.

گەر بیر لە موعجیزەکانی پێغەمبەری سەروەرمان بکەنەوە، بۆ نموونە چۆن بە بەرزکردنەوەی تەنها پەنجەیەك لە زەوییەوە مانگ دوو لەت دەکات، چۆن بە ئاماژەی پەنجە درەخت بۆ لای خۆی دەهێنێت، یاخود چۆن بە هێنانی دەستی بەسەر خواردنێکدا بەرەکەت دەکەوێتە ئەو خواردنە و لە کاتێکدا تەنها بەشی دە کەس دەکات کەچی حەوت سەد کەس تێر دەکات!... لە تەواوی ئەمانەدا بە هۆی نەبوونی لێکدانەوەیەکی ژیرمەندانە بە گوێرەی بنەمای هۆکار و دەرەنجام، دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە خاوەند لوتفێکی تایبەتی لەگەڵ پێغەمبەری ئازیزدا نواندووە. هەر بەو شێوەیەش مرۆڤ کە تەماشای پەرستشەکانی دەکات و بەراوردی دەکات لەگەڵ دەرەنجامەکانیاندا لەمە تێدەگات و هەر جارێکیش درەخشانەوەی نیعمەت و لوتفەکانی خودا لەسەر خووڕەوشت و ڕەفتارەکانی و ژیانی قەلبی و ڕۆحی ببینێت، هەستی تەعەبودییەت زیاتر دەبێت.

لە ڕوانگەیەکی تریشەوە تەعەبودییەت بە هۆی ئەوەی ئەو هەستە لای مرۆڤ دروست دەکات کە چاوەڕێی هیچ شتێك نەبێت و، لە پشت پەردەی بەندایەتییەوە کارەکانی بە فەرمانی خواوە ببەستێتەوە و بەوپەڕی پاکی و دڵسۆزی ڕوو لە خوا بکات، خاوەنی گرنگییەکی مەزنە. بەڵێ، تەعەبودییەت هەستی تەنها بۆ ئەو ژیان و تەنها بە شوێن ڕەزامەندی و خۆشنوودیی ئەوەوە بوونمان لا دروست دەکات. ئەمەش نەك تەنها لە پەرستشە فەرزەکاندا بەڵکو ئەوە دەڕواتە ناو هەموو ئەو کایانەوە کە لە ژیانی کەسی و خێزانی و کۆمەڵایەتی تاکدا بوونیان هەیە. مرۆڤ دەتوانێت لە کاروبار و مامەڵەی سادەی ژیانیشیدا نیەتی ئەنجامدانی تەنها لەبەر ئەوە بێت کە فەرمانی پێکراوە. گەرچی لە کاروباری سادە و مامەڵەی ڕۆژانەدا زۆرتر تایبەتمەندی ئەو کارانە لە بەرچاو دەگیرێت کە لەگەڵ عەقڵ و ژیری و داوەریدا دەگونجێن، بەڵام مرۆڤ تەنانەت

لەوانەشدا دەتوانێت "فەرمان پێکراوی کارەکان" بە بنەما بگرێت. وە بەندە ئەگەر پەرستشەکانی و کارە ئاساییەکانی ژیانی ڕۆژانەی بەستەوە بە تێبینی تەعەبودییەتەوە ئەوا خۆی ڕادەهێنێت لە سەر ڕۆحی بەندایەتییەکی دڵسۆزانە و بێ خەوش و خاڵ. دەتوانن ئەمە ببەستنەوە بەو وتەیەی مامۆستا بەدیعوززەمانەوە کە دەڵێت: گەر مرۆڤ هەندێك لە کارە ئاساییەکانی بۆ ڕەزامەندیی خوا ئەنجام بدات و بە نیەتێکی دروستیانەوە ببەستێتەوە، بۆ نموونە بە نیەتی پەیڕەوی کردن لە سوننەتی پێغەمبەری سەروەر، وەك ئەو بخوات و هەستێت و دانیشێت و لە تەواوی هەڵسوکەوتیدا هەوڵ بدات بچێتەوە سەر ئەو، ئەوا عادەتەکانیشی بۆ دەبن بە عیبادەت (کارە ئاساییەکانیشی بۆ دەبن بە پەرستش).[1]

دروشمی بنەمای تەعەبودییەت ئەوەیە کە خوای گەورە خاوەنی ڕاستەقینەی شتەکانە و هەر ئەوە کە مافی دەستێوەردان و ئاڕاستەکردنیانی هەیە. مرۆڤەکانیش بەندەی ئەو و موڵکی ئەون، خاوەن موڵك هەر چۆن ئارەزووی لێبێت موڵکەکەی بەکاردەهێنێت، بۆیە ئەو لە دیاریکردنی ڕەفتار و هەڵسوکەوتەکانی ئێمەدا فەرمانڕەوای ڕەها (حاکمی موتڵەق)ە، لەگەڵ ئەمەدا خواوەند واتایەکی خیلافەت (جێنشینی لە نێو شتە ئاساییەکانی ژیاندا) بە مرۆڤ بەخشیوە، مافی دەستوەردانی لە شتەکاندا پێداوە کە ئەمەش خاوەندارێتییەکی جوزئییە. مرۆڤەکان دەبێت لە گۆشەنیگای تەعەبودییەتەوە تەسلیم و شوێنکەوتەی "حاکمی موتڵەق" و "موتەسەریفی موتڵەق" بن. لەولاشەوە دەبێت لە کارە ئاساییەکان (عادیات) و مامەڵەکردن لەگەڵ شتە دونیاییەکاندا (أشیاء)، ئەو مافە هەندەکی (جوزئي) و زیادە (اضافي)یەی پێیاندراوە بەکاربهێنن، بەڵام لە کاتی بەکارهێنانی ئەم مافەشدا بزانن کە خاوەن موڵکی ڕاستەقینە "الله" یە.

---

١. بەدیعوززەمان سەعید نوورسی، بریسکەکان، بریسکەی یازدە.

خوای گەورە کۆمەڵێك یاسای لە گەردووندا داناوە کە دەتوانین بە "عاداتی سویحانییە" ناویان ببەین، وەك یاساکانی هەڵکشان و داکشان، یاسای لێکخشان و یاسای کێشکردن. بۆ نموونە دار و دەوەن تا خاکێکی لەبار بۆ گەشەکردنیان هەبێت و تیشکی خۆر بەریان بکەوێت و ئاویان هەبێت گەشە دەکەن و بەرهەم دەدەن. گەشەکردنی ڕووەکەکانیش بە هۆی ئاوەوە و میوە گرتن و بەرهەم بەخشینیان دووبارە یاسایەکی خواییە. لە بنەڕەتدا دروستکەری ئەو دەرەنجامەی لە ئاودانەوە دەبینرێت خوایە، بەڵام ئاوی وەك هۆکارێك بۆ ئەو کارە دروست کردووە. ئێمەش بە شارەزابوونمان لەو کارەدا و بە گوێرەی مەرجەکانی سەردەم و زانست و تەکنەلۆجیا و پێشکەوتنمان شێوازی جیاوازی ئاودان پەرە پێدەدەین. ئێمە دێین لێکۆڵینەوە دەکەین بۆ دۆزینەوەی ئەو ڕێکارانەی ناشتن و پەرەپێدانی تۆو کە باشترین بەرهەممان پێدەدەن.

بەڵام هەر لە کاتی ناشتنی تۆوەکەوە دەبێت بڵێین "ئەو کارەی من ئەنجامی ئەدەم تەنها گرتنەبەری هۆکارە بۆ گەشتن بە ویستی خوا، ئەوە خوایە کە بەرهەم دەبەخشێت، ئەگەر ئەم تۆوانە چەکەرە و گەشەیان کرد و گەورە بوون، ئەوە خوا ئەو کارانەی کردووە، ئەگەر بەرهەم یەك بە دوو، یەك بە دە ببەخشێت هەر کاری خۆیەتی و خۆی ئەنجامی داوە. بەڵام هۆکارەکانی کردووە بە پەردە بۆ عیززەت و مەزنییەکەی" ئێمە پابەندی ئەو بنەمایەین کە دەڵێت عەظەمەت (مەزنی) وا دەخوازێت کە هۆکارەکان پەردەداری دەستی قودرەت (توانا)ی خوا بن لە بەر چاوی عەقڵدا. تەوحید و جەلالیش وا دەخوازن کە هۆکارەکان دەستبکێشنەوە لە کاریگەریی ڕاستەقینە. بەڵێ گەر تەنانەت بابەتێکی لەم شێوەیەشمان بە تەعەبودییەتەوە گرێ دایەوە و بەو شێوەیە بەندایەتیمان ئەنجامدا، هەروەها پابەندبوونمان بە هۆکارەکانەوە هەر لەبەر ئەوە بوو کە خواوەند گەرچی

بە شێوەیەکی (اضافي)ش بوویێت مافی بەکارهێنانیانی پێداوین و بوونەوەرانی بۆ ڕام کردووین، ئەمەشمان تەنها لەبەر فەرمان پێکراویمان لە لایەن ئەوەوە ئەنجامدا، ئەوا هەستی بەندایەتیی ڕاستەقینە بەدەست دەخەین.

## بێ چاوەڕوانی بوون لە پەرستشەکاندا

بەڵێ، کە باوەڕدار لە نهێنی بەندایەتی و پەرستش گەیشت ئیتر هەموو کارەکانی بە خۆشنوودی خواوە دەبەستێتەوە و هەوڵ دەدات تەنها لەو دەرگایە بدات کە بە ڕووی ڕەزامەندیی خوادا دەکرێتەوە، دەیەوێت تەنها بەو داڵانەدا تێپەڕێت کە خوا پێی خۆشە. ئەگەر جەنابی حەق هێزی خۆی بە ڕۆحی ببەخشێت و لە هەمان کاتدا بەرزی بکاتەوە بۆ ئاستی ژیانی قەلبی، ئەوە وەك لوتفێکی جیاوازی حەزرەتی ڕەحمان و ڕەحیم لێی دەڕوانێت. گەر دەرئەنجامێکی وەهای دەستکەوێت یان نا، ئەو مەبەستی بۆ ئافرێنەری مەزن یەکلا دەکاتەوە و لەسەر بەندایەتی سوور دەبێت. تەنانەت لە بەرامبەر هەندێك لە شتە دەراساکاندا، بە ڕەفتارێکی خالیسانەوە وەك مەردانی خوا دەڕوانێت و دەڵێت "ئەمە شایەنی من نییە ئیلاهی، ئەم لوتف و چاکەیەت هۆکاری چییە! من داوای مەزنترین و بەنرخترین شتم لێکردبوویت. من داوای تۆم کردبوو خوایا، تۆ ببە بە هی من. ئیتر گەر هیچی تریشم نەبێت گرنگ نییە. چونکە تەنها ئەو کاتە هەموو شتێکم دەست دەکەوێت و لە هەژاری ڕزگارم دەبێت کە تۆ بۆ من بیت." بەڵێ، ئەو کەسە ئەمە دەڵێت و لەوپەڕی هەستی بەندایەتیدا دەژی.

لەم ڕێ سەختەی ژیاندا تەنها کەسە بێ چاوەڕوانییەکان لە ڕێ جێنامێنن، ئەوانی تر هەردەم ئەگەری پێ هەڵخلیسکانیان هەیە. دڵی مرۆڤی بێچاوەڕوانی

هەردەم بەم وشانەوە لێ دەدات "پەروەردگارا، تۆ نیعمەتە نەبڕاوەکانی خۆتت بێ بەرامبەر بە من بەخشیوە، خۆ من هەرچی پاداشت هەیە پێشەکی وەرمگرتووە. بەخششی ژیانت پێمداوە و شەرەفمەندت کردووم بەوەی وەك مرۆڤ دروستت کردووم. بە نووری ئیسلامەتی دەروونمت ڕووناك کردووەتەوە و دەرفەتی ئاشنابوونت بە داڵانەکانی مەعریفەت و مەحەببەت پێ بەخشیوم. هۆکارەکانت بۆ فەراهەم کردووم تا خزمەت بە ئاین و گەل و نیشتمانەکەم بکەم. من هەموو ئەم پاداشتانەم پێشەکی لای تۆ وەرگرتووە و تۆش لە بەرامبەر ئەم هەموو بەخششەدا ڕاتسپاردووم بە ئەنجامدانی خزمەتگوزارییەکی پڕچێژ و ئاسان و سانای وەك بەندایەتی و پەرستش. جا ئەوەی ئێستا لەسەر منە بریتییە لەوەی ئەو چاکانەی پێت بەخشیوم بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی و خۆشنوودی تۆ بەکاربهێنمەوە و تا هێزم تێدایە بەندەی تۆبم پاشان پەنا بەرمە بەر ڕەحمەت و کەرەمی تۆ."

بەڵێ، لەبەر ئەم ڕاستییانەیە کە دۆستانی خوا زۆر جار لە دوعاکانیاندا بەم جۆرە پاڕاونەتەوە "پەروەردگارا، لە کاتێکدا ئێمە پێویستمان بە بوون، یاخود بە هەر شتێکی دی نەبوو، تۆ بوون و هەموو ئەو شتانەش کە پێویستمان نەبوو وەك نیعمەت پێت بەخشین. ئێستاکەش ئەوەتا پێویستیمان بە بەندایەتییەکی خالیسانە (دڵسۆزانە و بێ گەرد) هەیە. ئاتاجی لوتف و سۆزی تۆین، هەرگیزیش نەماندەتوانی بیر لە بوون بکەینەوە، بۆ نموونە مرۆڤمان هەرگیز بە خەیاڵدا نەدەگوزەرا، نەدەکرا بگوزەرێت. ئەمانە شتانێك نەبوون پێویست بن بۆمان. بەڵام تۆ بە کەرەمی خۆت پێتبەخشین. دەی لەمە بەدوا بۆ ئەوەی لەسەر پێ بتوانین بوەستین زۆرمان پێویست بە تۆیە، بۆ ئەوەی سەرسم نەدەین و نەکەوین زۆرمان پێویست بە تۆیە، بۆ ئەوەی لە سەر شاڕێی بەهەشت بمێنینەوە زۆرمان پێویست

بە تۆیە، بۆ ئەوەی پێمان لە تەڵەی لاوازییەکانمان نەگیرێت و بتوانین بەرەو ڕەزامەندیت هەنگاو هەڵبگرین زۆرمان پێویست بە تۆیە، ئەی ئەو پەروەردگارەی لوتفی ئەو شتانەت لەگەڵ کردین کە پێویستمان نەبوو، داوای ئەو شتانەش کە پێویستمانە لە تۆ دەکەین."

بەڵێ ناسینی جەنابی حەق لەو ئاستەدا کە پێویستە بیناسین زۆر گرنگە. ڕوانینمان لەو ئاستەی ئەو بۆمان دەڕوانێت و ڕووتێکردنمان بەو شێوەیەی ئەو ڕووی لە ئێمە کردووە زۆر گرنگە. چ بڵێم ئیدی، ئەمەش هەر لە دەرگانەی ئەو داوا دەکەم و دەڵێم "پەروەردگارا! خۆتمان پێ بناسێنە و مەعریفەتت بخە نێو دەروونمان و بە خۆشەویستیت ڕۆحەکانمان تێر بکە. ڕێ مەدە هەرگیز قیبلەنومای دڵمان توشی هەڵە ببێت، وە هێزی ئیرادەمان پێ ببەخشە تا بەسەر شەیتان و نەفسی ئەممارەماندا زاڵ ببین."

## شیرک و ریا لە پەرستشدا

زانایان فەرموویانە پەرستش کردنی کەسێك بە قوڵی و تێڕامان لە تەنهاییدا و ئەنجامدانی هەمان پەرستش بە شێوەیەکی سەرپێیی و سادە لە کاتی بوونی کەسانی دیکەدا ڕیایە، وە پەرستش کردن بێ گرنگی پێدان و تێڕامان لە تەنهاییدا و ڕازاندنەوە و قووڵ نیشاندانی لەبەردەم خەڵکیدا، شیرکە (هاوەڵ دانانە بۆ خوا). دەبێت تەماشای نێوان خۆت و خوا بکەیت. هەر کە تێڕوانینی مرۆڤەکانت بە بیردا هێنا ئەوە کارەکەت لەکەدار کردووە. ئێمە دەبێت ئاستی بەندایەتیمان بە گوێرەی باڵای خۆمان نیشان بدەین و خۆمان نەخەینە نێو نمایش و چاولێکەرییەوە.

لە پەنا ئەمەدا بیرکردنەوەیەکی لەو شێوەیەش هەڵەیە کە بوترێت "هەر کەسێك بەگوێرەی تێگەشتن و ئاستی مەعریفەتی پەرستش ئەنجام دەدات، ئاستی مەعریفەتی منیش هەر ئەوەندەیە کە پەرستشەکان بێ هیچ گرنگی پێدانێك بێت و پڕ لە خەوش و خاڵ ئەنجام بدەم." بەڵێ، بیرکردنەوەی لەم شێوەیە مرۆڤ بەرەو سادە گرتنی بابەتە جددییەکان دەبات. پێویستە ڕێز لە دڵمان بگرین، پێویستە بە گیانێکی پڕ لە هەستی بەندایەتییەوە مافی ئیرادەمان بدەین.

## ماندوێتی

ئێمە لە ژیانی بەندایەتیماندا زۆر ماندوو دیارین، هەموو دەڵێیت سەربازی ماندووین. وەك بڵێی لە پەرستش ماندوو بووین، بێزاری بەدی دەکرێت. ئێمە زۆر عەوامانە بۆ موسڵمانێتی دەڕوانین، لە دڵماندا زۆر سادە و سنووردارمان کردووەتەوە. بە درێژایی ڕەمەزان لە شاشەکانەوە قسەکرا و باسی ئاین کرا، بەڵام هیچ کام هێندەی گوتەکانی ژنێکی ڕەشپێستی تازە موسڵمان بوو واتادار نەبوون. ئەوە چ هەستێکی جوان و چ تێگەشتنێکی تەواو بوو بۆ شتەکان...

ئێمە زەبوونی دەستی ئولفەت بووین، بەهاکان لە چاوماندا ڕەنگیان پەڕیوە، تەڵخ بوون و ناتوانن لە ناخماندا خرۆشان بەدی بهێنن. ناتوانین وەك چێژبردن لە خواردنی شیرینی پەرستشەکان ئەنجام بدەین. چییە ئەم مەکری ئیلاهییە نازانم؟ بۆ هەستەکان ناخرۆشێن؟ بۆ هەیەجان نییە؟ ئەگەر چەند کەسێك لە نێو ڕیزی نوێژدا لە هۆش خۆ بچن ئەو کات ئەو تێڕامان و قوڵبوونەوە کارێك لەسەر دەروونەکان ئەنجام دەدات. بەڵام بۆ ئەوە نابێت؟ نازانم.

## بێ هەیەجان و خرۆشان، گەشتن بە قوولایی مەحاڵە

گەرچی خوێندنی قورئانی پیرۆز و ئەوراد و زیکرەکان بە شێوەیەکی سەرزارەکی و بێ هەستانە ئەوە نەبێت کە لێمان داوا کراوە، بەڵام گەر بەم شێوەیەش ئەنجامیان بدەین هێشتا کار لەسەر هەندێك لە هەستەکانمان دەکەن و سوودمان پێدەگەیەنن. ئومێدمان وەهایە کە ئەو ڕادە کەمەی هەوڵدانیش هەروەك دەنکۆڵەکانی باران ببنە هۆی چەکەرەکردنی تۆوەکانی ناخی زەوی. ئەوەی کە لەسەر مرۆڤەکانیش پێویستە سوود وەرگرتنێکی پڕماناتر و قوڵترە. مرۆڤ بۆ ئەوەی کە پەنجەرەی فراوانتری بە ڕوودا بکرێتەوە دەبێت هەندێك زیاتر فشار بۆ خۆی بهێنێت. دەبێت هەوڵ بدات هەموو وشە و دەربڕینەکان بە هەست و دەرکێکی باڵاوە لەسەر قوڵاییەکانی دڵی بنەخشێنێت. تێگەشتنێکی بە دەرك و هەست یەك دەکاتە هەزار، بەڵام بە بیانووی ئەوەی "ناتوانم بە دەرك و هەستەوە بخوێنمەوە" وازهێنانیش هەڵە دەبێت.

نەبوونی هەمان حاڵەتی بەرزی ڕۆحی لە هەموو کاتێکدا ڕەنگە لە حاڵی قەبض (دەروونی تەنگ)ەوە سەرچاوە بگرێت. لەڕاستیدا ئەم حاڵەتەش دەکرێت بە شێوەیەکی ئەرێنی سوودی لێ وەربگیرێت. چونکە حاڵی قەبض ڕێگای کرانەوەیە بەڕووی بسط (دەروون گوشادیی)دا، قەبض حەڵقەی سەر دەرگای بەسطە.

## دوو وتەی حەسەنی بەصری و ئەوەی هێنایە یادەوە

حەسەنی بەصری دەفەرموێت "ئەوەی کە زانستی لەوانیتر زۆرترە لەسەری پێویستە لە کرداریشدا لەوان لە پێشتر بێت." ئەو کەسانەی لە ئاستێکی باڵادا

خزمەتی گەل و نیشتیمان دەکەن دەبێت لە کەسانی ئاسایی زیاتر ئەوراد و ئەزکار بخوێنن. دەتوانین هۆکارەکانی ئەمەش لەم چەند خاڵەدا ڕیز بکەین.

١. ئەو کەسانەی بەرپرسیارێتی قورس لە ئەستۆیاندایە زۆرتر پێویستییان بە نزا و ئەوراد و ئەزکار هەیە.

٢. وەك پێویستی ئیمانێکی پتەو، دەبێت هەر کەس لە ئاستی خۆیدا پەرستش و بەندایەتییەکانیشی زۆرتر بێت، واتە: ئاستی قووڵی ئیمانی بەندە خۆی لە خۆیدا ئەو زیاتر پاڵ پێوە دەنێت بەرەو زیکری زیاتر.

٣. بەگوێرەی تەڵیسمی "أفلا أكون عبدا شكورا"[1] دەبێت بەندە بەردەوام دەستی بە پەرستشەکانەوە بێت تا ئەوەی بەندەیەکی سوپاسگوزاری لێدەردەچێت. چونکە ئەو کەسانەی بگەنە ئەو ئاستە لە بازنەی مەحرەمەکاندان، ئەوانەی بگەنە ئەو مەیدانە وەك ئەوانە لێیان ناڕوانرێت کە هێشتا لە دالانەکاندا بەرێوەن.

وتەیەکی دیکەش کە دەدرێتە پاڵ حەسەنی بەصری دەڵێت "ئێمە زانستمان بۆ دونیا ویست، ئەو ئێمەی بەرەو دواڕۆژ کێشکرد."[2] ڕەنگە ئەم وتەیە پێش ئەویش وترا بێت بەڵام دەدرێتە پاڵ ئەو، وەك بڵێی لەسەر زاری ئەو ناوبانگی پەیدا کردووە. ڕەنگە گەر بڵێین "شوێنکەوتووان لە زانست و پەرستشدا لە هاوەڵان لە پێشتر دیارن." ڕاست بێت. چونکە هاوەڵان نوێنەرایەتی دیوێکی دیکەی ئیمان و بەندایەتی بوون. ئەویش بابەتی پاراستنی ئاین و بەرگری لێکردن و گەیاندنی ئەمانەتی پێسپێردراو بوو بە ساغ و سەلامەتی بۆ نەوەی نوێ، سازدانی زەمینێکی گونجاو بوو بۆ زانست و پەرستش. گەر هاوەڵان

---

١. بخاري، تهجد ٦؛ صحيح مسلم، صفات المنافقين ٧٩ - ٨١

٢. ابن عبد البر جامع بيان العلم ٢٢/٢.

نەبوونایە. ئاینیش نەدەبوو، بۆیە چەرخی ئەوان باشترین چەرخە و ئەوان تا دونیا دونیایە لە چاکەی هەر کەسێك کە شوێن ئەم پەیامە دەکەوێت بەشدارن.

بەڵێ، سەردەمی شوێنکەوتووان، سەردەمی لوتکەی زانست و کار بە زانست بوو. لە فەرمووددا هاتووە کە "یەکەم شتێك کە لە زانست هەڵدەگیرێت (خشوع)ە"[1]، ئێستاش زانست خشوعی تێدا نەماوە، وە بە ونبوونی ئەویش وەك بڵێی هەموو شتێك تەواوبووە. چەند کەسێکم ناسیوە لە ژیانمدا، بۆ نموونە یەکێکیان هێندە بە لێبڕانەوە نوێژی دەکرد کە چەند کەسێك پێیان دەگوتم ''کە بە بەردەم دوکانی ئەو کەسەدا تێدەپەڕم گەر تەنها یەك جاریش تەماشای بکەم دواڕۆژم بیردەکەوێتەوە''. بەڵێ، باوەڕدار بە تایبەتی باوەڕداری خاوەن زانست دەبێت خەڵك لە بینینیدا خوایان بیربکەوێتەوە.

## پەرستشی بەئیخلاس و دزەکانی گوێگرتن

ڕەنگە مرۆڤ لە پەرستش و بەندایەتیدا، لە ئەوراد و ئەزکار و نزا و پاڕانەوەیدا بە دەرەنجامگەلێك بگات، گەرچی بەدەر لە ڕەزامەندی خوا تێبینی دیکەشی تێکەڵ بە کارەکانی کردبێت. ڕەنگە ئەوانەی خۆ بە جنۆکەکانەوە سەرقاڵ دەکەن و ئەوانەی نوشتە دەنووسن بە هەندێك دەرەنجامی نائاسایی بگەن، لە ڕێی هەندێك کارەوە کە لەو ڕێیەدا ئەنجامی دەدەن ڕەنگە هەندێك کەشف (دۆزینەوە) لە دونیای میتافیزیکدا بەدەست بهێنن. دەکرێت بە بینینی ئەو دەرەنجامانە بە عەقڵدا گوزەر بکات کە ئەمانە هێزیان بەسەر ڕۆحدا دەشکێت و لە جیهانی ڕۆحدا لە بەرزبوونەوەدان و بەرەو ئاسۆی ژیانی خولگەی لەتیفەی ڕەببانی

---

١. الترمذي، العلم ٥؛ سنن الدارمي ١/٥٩.

دەڕۆن و لە ئاستی نهێنییەکاندا دێن و دەچن. جا کە سۆفییە مەسیحییەکان و ڕاهیبە بوودییەکانیش هەندێك شتی دەراسا لە هەگبەیاندا بێت، براهمانیستەکان و ئەوانەی خۆیان بە تەواوی بە کۆزمۆسەوە بەستۆتەوە بتوانن دەستیان بەو دەراسایانە بگات و ئێمەش لەو ڕێیەوە بە هەندێك شت بگەین، ئیدی جیاوازی نێوان ئێمە و ئەوان چییە؟

جیاوازییەکی زۆر گەورە لە نێوان ئەم دوو شتەدا هەیە، قورئانیش ئاماژە بەم جیاوازییە دەکات، کاتێك وەحی بۆ ئێمە دێت، یاخود کاتێك فریشتەکان لە نێو خۆیاندا قسە دەکەن و ئەوەی کە لە خوای گەورەوە دەیبیستن بۆ یەکدی دەڵێنەوە، شەیتانەکان "استراق السمع" واتە "دزیی گوێگرتن" ئەنجام دەدەن، واتە بە دزییەوە گوێ هەڵدەخەن کە بزانن چ باسە. جا لە کاتێکدا شەیتان و هاوکارەکانی دزیی گوێگرتن ئەنجام دەدەن، بەشێك لە قسەکان دەدزن و ئەوی دیکەی بە وتەی بێ بنەما خۆیان پڕی دەکەنەوە، پاشان ئەم هەواڵە نیو ڕاست و نیو پوچەڵە بە شێوەی "هواجس - وەسوەسەی شەیتانی" دەگوێزنەوە بۆ دۆستە ئینسییەکانیان. فریشتەکان بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ لە لایەن خواوە هەواڵیان پێدەدرێت، مافی ڕەوای خۆیانە بەکاری دەهێنن و ئەو وشەی نهێنییەی وەك نیعمەتێك پێیاندراوە دەخەنە کار و ئەو دەرگایە دەکەنەوە و لێیەوە بەرەو ڕەزامەندیی ئیلاهی هەنگاو دەنێن. پاشان ئەم شتانە دووبارە لە ڕێی نێردەی ڕاستگۆوە وەك وەحی یاخود وەك ئیلهام بە مرۆڤەکان دەگەیەنرێت. وەك بڵێیت لە هەردوو بارەکەدا لە یەك دەرگاوە چوونە ژوورە دەبێت، بەڵام چوون لەیەکیاندا ئامانج ڕەزامەندیی خوایە و لە بازنەی مۆڵەتی خاوەنی ڕاستەقینەدایە، ئەوە پەسەند کراوە و ئەوی دیکەشیان لۆمەکراوە و ناپەسەندە.

بەڵێ باوەڕدارێکی سەرڕاست کە لە هەوڵی دەستگرتن بەسەر تواناکانی ڕۆح

و گەشتن بە پلەی ژیانی دڵ و ڕۆحدایە، بۆ نموونە دەیەوێت بە سەیر و سلوکی ڕۆحانی پلەکان ببڕێت، جا وتم باوەڕداری سەرڕاست، چونکە مەبەستم ئەوانەیە کە چاوەڕێی هیچ دەرەنجامێکی لابەلا نین لە پەرستشیاندا، بەڵێ ئەم باوەڕدارە ڕەزامەندی خوا دەکاتە ئامانج و لەم ڕێیەدا دەست بە ڕۆشتن دەکات. هەر بەو گیانەوە و بەهۆی ئەوەی ئەو ڕازییە لە دەرگایەکی نهێنی دەدات. جا لێرەدا کەس ڕێی پێناگرێت و دەست وەرناداتە کاریەوە، چون دوور بووە لە (دزیی گوێگرتن)، ئەرواحی طەییبەش (ڕۆحە پاکەکان) پێشی پێناگرن و شەهابی بەسەردا نابارێنن و توشی دەردیسەریی ناکەن. چونکە ئەو تەنها لە هەوڵی ئەوەدایە دەرگایەك بکاتەوە کە ڕۆشتنە ناوەوە پێیدا ڕێپێدراوە. ئەو هەوڵدەدات بە هۆکارێك ئەو دەرگا نهێنییە بکاتەوە کە هەر لە شێوازی بەکارهێنانی ئەو کلیلە یاخود وشە نهێنییەیە کە بۆ کردنەوەی هەر دەرگا یاخود جانتا یاخود گەنجینەیەك بەکاردەهێنرێت. هەرچی ئەوانی دیکەشە کارەکەیان ڕێك وەك "استراق السمع - دزیی گوێگرتن"ەکەی شەیتانەکانن و هەر بەو دزانە دەچن کە بانقەکان دەبڕن و پارەی خەڵکی دەدزن. جا چون کارێکی نایاسایی ئەنجام دەدەن هەر ساتێك ئەگەری ئەوە هەیە شەهاببباران بکرێن و دەستبەسەر ببن و بگیرێن. چونکە ئەو ڕێگەیەی پێیدا دەڕۆن نایاساییە و هەر لە بنەمادا مۆڵەتی ڕۆشتنیی لەو شێوەیەشیان نییە.

جا بۆ ئەوانەی ڕەزامەندیی خوایی ئامانجی سەفەریان نییە و لەو ڕێیەدا بەو جۆرەی مۆڵەت دراوە و بەو جۆرەی پێویستە بڕۆن ڕێناکەن، لە کاتێکدا نیازی بەدەستهێنانی هێزی ڕۆحییان هەیە کەچی لە ڕێ جێدەمێنن و بگرە لە ڕۆحیشیان دەبن. نموونەگەلی تاڵ و پڕ عیبرەت لەم بوارەدا هەیە. ئەمانە بۆ نیشاندانی هێزی پەیوەست بە مێتافیزیك خۆ لە قەرەی ئەزموونە ڕۆحییەکان دەدەن. بەڵام چون خاڵی دەستپێك و ڕێی سەفەر و ئامانجی گەشتنیان یەك

نایەتەوە لەگەڵ مۆڵەت و ڕەزامەندیی جەنابی اللە (جَلَّ جَلالُهُ) دا، بۆیە بە تێپەڕبوونی کات لە شیرازە دەپچڕێن. لە سەرەتاوە شەیتانەکان چەند هەواڵێکی ڕاستیان بۆ دەهێنن. بۆ نموونە دەڵێن "ئەمڕۆ لە فلانە شوێنەوە ئەم کەسانە دێن." پاشان هەواڵێکی دیکە و دواتریش هەواڵێکی دیکە و هەواڵێکی دیکە. دەڵێن "ئاوی ڕوباری فلان تا ئاستی مەترێك دەکشێتەوە، بڕۆن تەماشای بکەن. کە دەڕۆن تەماشای دەکەن، هەر لە ڕاستیدا ئاوی ڕوبارەکە دەکشێتەوە." دەڵێن "ئەمڕۆ لەو فلان جێیە ئەوەندە کەس دەسووتێنرێن و خۆڵەمێشەکەشیان بە با دەدرێت." ئەمەش هەر ڕاست دەردەچێت. هەشت نۆ جار بەم شێوەیە دەکەن و پاشان ڕۆژێك دێن و دەڵێن "دەزانی، تۆ موجەددیدیت؟!" ماوەیەك تێدەپەڕێت، چەند هەواڵێکی دیکەی ڕاست دەهێنن و پاشان دەڵێن "تۆ هەروا موجەددیدێکی سادە و ئاسایی نیت، تۆ مەهدیت." پاش ماوەیەکی دیکەش باوەڕی پێدەهێنن کە ئەو ڕزگارکەری چاوەڕوانکراوە و، پێی دەڵێن "تۆ مەسیحی مەوعودیت." وە لەم ڕێ چەپەڵەدا کە تا گێژاوی (خلول) درێژدەبێتەوە لوتی لە زەوی دەدەن.

وەك دەبینرێت ئەوانیش هەمان کلیل و هەمان وشەی نهێنی دەدۆزنەوە و بەکاریدەهێنن. هەمان دەرگای بە وشەی نهێنی کراوە دەکەنەوە و دەڕۆنە ژوورەوە. دەڕۆنە ژوورەوە بەڵام چون مۆڵەتی خاوەنماڵیان نییە و بەو شێوەیە ڕەفتار ناکەن کە ئەو مۆڵەتی داوە، وەك دزێك مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێت. وە وەك سزای "استراق السمع - دزیی گوێگرتن" بە پێچەوانەی ئامانجەکەیانەوە زللە دەخۆن و هەروەك زەکات و ڕۆژوو و حەج تووشی خەسارەتمەندیی دەبن. هەم مێژوومان و هەم ئەمڕۆمان شاهیدی چەندین نموونەی مرۆڤی لە شیرازە دەرچوو بووە و دەبێت، کە بە هۆی مەحرومییەتیان لە تێگەشتنی ئیسلامییانە بە ڕێگەی بێ بنەما خەڵەتاون و بوونەتە قوربانی سیستەمگەلی جۆراوجۆر.

# نوێژ

## چوارچێوەکان دەبێت هەڵگری واتا بن

ئەوەی ئەسڵە لە پەیوەندیی نێوان بەندە و خوای خۆیدا، واتایە، کرۆك و ڕۆحی کارە. بەڵام ئەوەی ئەمانە هەڵدەگرێت، واژە و شێوە و چوارچێوەکانن. ئەو واتا و کرۆکانەی بنەما و مەبەستن دەبێت لە لایەن ئەو چوارچێوانەوە هەڵبگیرێن. هەر بۆیە ناکرێت بوترێت شێوەی دەرەکی کارەکان و توێکڵ و چوارچێوەیان ناپێویست و زیادەن. بگرە داوەریی دەرەکی (ئەحکامی ظاهیری) لەسەر ئەوان هەڵدەچنرێت. بەڵام ئەو نوێژەی کرۆکی کارە و داخوازی خوای کردگارە، نموونەی میعراجی ڕەسووڵی نازدارە (صَلَّى اللهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). ڕۆژوویەك کە ڕووکەشی نەخواردنی ئاو و نانە لە کرکۆکدا هەڵکۆڵینی خەزێنەکانی دڵە و دۆزینەوەی گەوهەری یادگاری یارە، بۆیە خوای بەرز و بڵند دەفەرمووێت: قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ۝ الَّذِينَ...[1] "باوەڕداران سەرفرازبوون"، ئەو باوەڕدارانەی کە... صیلەی ئیسمی مەوصولی ئەم ئایەتە (تەواوکەری تەواوکراوی ئەم ئایەتە) بەمشێوەیە هێندراوە: هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ[2] "ئەوانەی کە بەردەوام لە نوێژەکانیاندا خشووعیان هەیە" نافەرمووێت: هُمْ يُصَلُّونَ

---

١. المؤمنون: ١.

٢. المؤمنون: ٢.

"ئەوانەی نوێژ دەکەن". دەستەواژەیەك بەکاردەهێنێت کە ئاماژە بۆ دامەزراویی و بەردەوامیی دەکات، واتە دەفەرموێت "سەرفرازان ئەوانەن کە نوێژەکانیان لە هەرکاتێکدا بێت بە خەشییەتەوە ئەنجام دەدەن و بەردەوام عەودالّی خشوعن."

ئێمە تەنها بە ڕوانین بۆ نوێژی موسوڵمانێك ناتوانین ئەوە دەستنیشان بکەین داخۆ عەوداڵە بەشوێن خشوعدا یاخود نا، ئەمە بابەتێکە لە نێوان ویژدانی بەندە و خوای خۆیدا، هەر بۆیە ئێمە خۆمان پابەندی گومانی باش دەکەین، بەڵام هەندێك هێندە شل و شێواوانە مامەڵە لەگەڵ نوێژ و ڕۆژووەکانیاندا دەکەن، هێندە بێ کۆت و بەند لە گوزەر و بازاڕەکاندا پاکیزەییان پامالّ دەکەن کە مرۆڤ چەند گومانی باشیش بەرێت، ناتوانێت ئەو هەڵسوکەوتانەی بە چاوی سەر شاهیدیانە بخزێنێتە نێو چوارچێوەیەکی ئیسلامییەوە، بۆ نموونە کاتێك کەسێك لە چاوتروکانێکدا نوێژ دادەبەستێت و پێش ئەوەی تۆ بگەیتە نیوەی فاتیحە ئەو دەگاتە نیوەی ڕکوع، لێرەدا چەندە زۆر بۆ خۆشت بهێنیت ناتوانیت بڵێیت ئەو کەسە نوێژی ئەنجام داوە، بەگوێرەی هەندێك فوقەها مانەوە لە ڕکوعدا بە هێندەی حەقی خۆی و وتنی جارێك "سبحان ربي العظيم" و بە جوانی دانان بە یەك بەیەکی وشەکاندا مەرجە بۆ قەبوڵبوونی ئەو ڕکوعە، گەر بە پەلەپروسکێ بوترێت واتایەکیان نامێنێت، بگرە بە گوێرەی هەندێك لە فوقەها دەبێت بەلایەنی کەمەوە سێ جار ئەو ڕستەیە بوترێتەوە، بۆیە دەبێت لە ڕکوع و سوجدەدا بە لایەنی کەمەوە سێ جار بە شێوازێکی لەسەرخۆ و بە دەربڕینی ڕەوانی وشەکانەوە ئەم زیکرە بڵێینەوە، گەر کەمتر لەوە بڵێین سەختی بۆ کەسانی دی دروستدەکەین سەبارەت بە بیرکردنەوەی ئەرێنییان دەربارەمان، بەم شێوازە هەندێك لە چوارچێوەکان ناتوانن هەڵگری ئەو واتا و کرۆکە بن کە ئێمە دەمانەوێت بینوێنین، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی ئەوانەی دەربارەمان گومانی باش دەبەن، گومان باشییان بەرامبەر وەهم و ناڕاستی بوویێت.

ئەو فاتیحەیەی زۆر کەس بە پەلەپروسکێ دەیخوێنن قورئان نییە، چونکە قورئان بەو شێوەیە دانەبەزیوە، ئەو نوێژەی فاتیحەی بەو پەلەپروسکێیە تێدا دەخوێنرێت نوێژ نییە، ئەوە قورئان خوێندن نییە، کە خوێنەرەکەی هەموو خەمی ئەوەیە بە یەك هەناسە تا کۆتایی فاتیحە بخوێنێت و ئەگەر هەناسەشی لێبڕا بەپەلە نێوانە هەناسەیەك هەڵبکێشێت و بەردەوام بێت، بەم شێوەیە فەرزی قیرائەت بەجێ نەهاتووە، واژەکان چوارچێوەی واتاکانن بەڵام پێویستە چوارچێوەکان بە باڵای واتاکان بگونجێن، دەشێت بەسطی زەمان ڕوویدات ئەوە شتێکی ترە، یەکێك پێی وتم "لە پێنج دەقیقەدا چل یاخود نەوەد ڕەکات نوێژی ڕێك و پێك و حەقپێدراوم ئەنجامدا" لە ڕوانگەی عادەتی خواییەوە ئەمە هەموو کاتێك ڕوونادات، بۆ کەسێکیش کە جارێك بۆی دەست داوە ئەگەر بە ناوی خۆدەرخستنەوە باسی لێبکات ئەوە جارێکی تر بۆی نالوێتەوە.

## خشووع و ملکەچی لە نوێژدا

دەستەواژەی "چاکسازیی بنەما ناوەکییەکان - تعديل الأركان" بۆ نوێژ زۆر بەکارنەهێنراوە، ئەمە دەکرێت وەك دەربڕینێك سەبارەت بە خشووع و ملکەچی بەکاربهێنرێت، خشووع و ملکەچی پابەندن بە کرۆکی نوێژەوە، تکام وایە، باسکردنمان دەربارەی خشووع و ملکەچی لە نوێژدا بە زۆر مەزانن، ئیمان و نوێژ دوو برای دوانەن، هێندە هەیە کە ئیمان کەمێك پێش نوێژ لە دایکبووە، بەدیعوززەمان لەو جێیەدا کە دابەشکردنی نوێژ بۆ پێنج کات (دیاریکردنی پێنج کات بۆ نوێژەکان) شیدەکاتەوە، شیکردنەوەی دەربارەی واتای ئەوەش داوە.[1] موحیددین ئیبن عەرەبی لە "فتوحاتی مەککییە"دا دەربارەی واتای نوێژ دوواوە.

---

١. بەدیعوززەمان، وتەکان. وتەی نۆهەم.

شا عوبەیدوڵڵای دەهلەوی بە باسكردنی چەندین تایبەتمەندی نوێژ سەرنجی بۆ لای گرنگی بابەتەكە ڕاكێشاوە. لەبەر ئەو گرنگییە بوو من تكام كرد كە هەر چۆنێك بووە هەندێك لە برایانمان نوێژێكی ڕێكوپێك ئەنجام بدەن و ببنە نموونە بۆ ئەوانی دی. وە گەرنا، لە نێو ئەو كەسانەشدا كە خۆیان بە بەشێك لەم كارە دەبینن نوێژ بە واتای ڕاستەقینەیەوە ئەنجام نادرێت، موسوڵمانان ڕۆژانە پێنج جار خۆ بە زەویدا دەدەن و هەڵدەستنەوە، بەڵام نوێژ ئەنجام نادرێت.

ئینجا ئەوەی لە "فَوَيْلٌ لِلْمُصَلِّينَ"[1]دا باسدەكرێت، تەنها بابەتی سەهوو نییە، ئەوەندە كەموكوڕیمان لە نوێژەكانماندا هەیە، هەر مەپرسە. بۆ نموونە، بابەتی ئەوەی كە ئایەتەكە بەم شێوەیە "وَإِذَا قَامُوا إِلَى الصَّلَاةِ قَامُوا كُسَالَىٰ يُرَاءُونَ النَّاسَ وَلَا يَذْكُرُونَ اللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا" واتە "كاتێك بۆ نوێژ هەڵدەستن، تەمبەڵ تەمبەڵ لێی هەڵدەستن..."[2] وەسفی دەكات، یەكێكە لەمانە. لە فەرموودەكاندا ئەو جۆرە نوێژكردنانە لە دەرەوەی ڕەفتاری مرۆڤانە هەژمار كراون. نوێژ مامەڵەیەكی مرۆڤانەیە بەڵام ئەگەر لە چوارچێوەی داواكراودا ئەنجام نەدرێت، ئەوا جووڵەكان بە جووڵەی ئاژەڵی دەچوێنرێن. بۆ نموونە سەروەرمان دەربارەی ئەو كەسەی پێش ئیمام دەڕواتە ڕكووعەوە دەفەرموێت "دەتانەوێت كە لە ڕكوع هەستانەوە خوا شێوەتان بخاتە سەر شێوەی گوێدرێژ؟!"[3] ئەمە پێمان دەڵێت كە جووڵان لە پێش ئیمامەوە، واتای دەرچوون لە هێڵی بەندایەتی دەگەیەنێت، یان دەفەرموێت "با كاتێك كەسێكتان سوجدە دەبات وەك كەڵەشێر دەنووك لە زەوی نەدات"[4] تەماشا بكەن ئەوە ڕەفتارێكی ئاژەڵییانەیە، سەركێشان بە زەویدا و یەكسەر بەرزكردنەوەی،

---

١. الماعون: ٤.

٢. النساء: ١٤٢.

٣. البخاري، الاذان ٥٣؛ مسلم، الصلاة ١١٥.

٤. أحمد بن حنبل، المسند ٣١١/٢؛ الطيالسي، المسند.

ڕەفتارێکی ئاژەڵیانەیە. یاخود دەفەرموێت "با وەك سەگ دەستەکانی دانەنێت لە سەر زەوی!"[1] وە بەم شێوەیە ئاگادارمان دەکاتەوە کە دەبێت تەواوی جووڵەکانمان لە وەستانەوە بۆ ڕکووع، لە ڕکووعەوە بۆ سجوود، لە سجوودەوە بۆ دانیشتنمان هەموو لە جووڵە و ڕەفتاری ئاژەڵانە جیاواز بێت.

پێغەمبەری خوا بەم فەرمایشتە پیرۆزانەی بانگهێشتمان دەکات بەرەو پێکهاتەیەکی تەواو لە ڕەفتاری مرۆڤانە. بەڵێ خشووع و ملکەچی تەنها و تەنها لەو چوارچێوانەدا جێیان دەبێتەوە و خۆیان نیشان دەدەن. دەبێت کاتێك دەڵێین "من لە خشووع و ملکەچیدام" ئەو چوارچێوە ئاژەڵیانەت تێپەڕاندبێت. مەدالیای خشوع و ملکەچی خوایی تەنها ئەو کەسانە دەتوانن هەڵیبگرن کە شایەن بوونیان بەو مەدالیانە نیشانداوە.

## دۆزینەوەی نوێژ

جا ڕۆح و واتای نوێژ ڕەنگە یەکسەر نەدۆزرێنەوە و خۆنیشان نەدەن. ئەو کەسەی ڕۆحی نوێژی دۆزیوەتەوە جۆرێکی لێ دێت کە لە ناوەڕاستی خۆشترین کاردا ئارەزووی نوێژ لە سەری دەدات و حەز دەکات بڕوات نوێژ بکات. وە لەو نوێژەش کە دەیکات، چێژ دەبینێت. گەر هەموو جارێکیش نەبێت زۆر جاران دەڵێت "خۆزگە ژیان تەواو نەبووایە و من هەر بەم شێوەیە بە پێوە بوەستامایە". بەڵام بۆ دۆزینەوەی ئەمە مرۆڤ هەندێکجار پێویستی بە ٢٠، ٣٠، یاخود هەندێکجار ٤٠ساڵ دەبێت. چل ساڵ کەمەربەستەی پەرستش دەبێت و لەبەر ئەو دەرگایەدا دەوەستێت. ئەوجا نوێژ ڕوخساری دڵڕفێنی خۆیت نیشان دەدا و دەیدۆزیتەوە. جا

---

١. هەمان شوێنی پێشوو.

وێنەی ئەو کاتەی گیان و چێیەتی نوێژ دەدۆزیتەوە وەك ئەوە وایە تۆ تا ئەو کاتە بەشوێن شادەماری ئاڵتوونی نوێژدا لە نێو تۆز و خۆڵدا گەڕابیت، بەڵام هەر کۆڵت نەدابێت و بەردەوام وتبێتت "ئەم دەمارە بەرەو گەنجینەکە دەڕوات" هەر ڕۆشتویت و ڕۆشتویت، هەتا ڕۆژێك خۆت لە نێو ئەو گەنجینەیەدا بینیوەتەوە. جا ئایا تەواوی هەوڵەکانی تا ئەو کاتەت نرخی ئاڵتوون پەیدا دەکەن یان نا؟

لە ئایەتێکی پیرۆزدا هاتووە "وَتَبَتَّلْ إِلَيْهِ تَبْتِيلًا" واتە "بە دڵسۆزی و ملکەچییەوە ڕووی تێ بکە"[1]، چونکە کردارەکە لە بابی "تفاعل" دایە، واتای زۆر لەخۆکردنێك دەگەیەنێت، خوای پەروەردگار لە سەرەتاوە بەمجۆرە لەگەڵ پێغەمبەرماندا دەدوێت. بەڵام سەروەرمان بە تێپەڕینی کات جۆرێکی لێدێت کە دەفەرموێت "ئەو چێژەی ئێوە لە خواردن و خواردنەوە و سەرجێیی کردن دەیبینن، من لە نوێژدا تامیدەکەم"[2] بە هەمان شێوەش گەر تۆ لەمبارەوە هێندەی پێویست کۆڵنەدەر بیت و ئارام بگریت، وە چاوەڕێی لاچوونی پەچەی سەر ڕووخساری دڵڕووبای نوێژ بکەیت لە کۆتاییدا دەگەیتە حاڵەتێك کە گەر پێت بڵێن "لە بەهەشت سفرەگەلی ناوازەت بۆ ڕازێنراوەتەوە،" تۆ دەڵێیت "با نوێژەکەم بکەم دوای ئەوە دێم، ناتوانم نوێژەکەمی بۆ بکەم بە قوربانی". کە عەزرائیل بێتە لات دەڵێیت "گەر مۆڵەت بدەیت نوێژەکەم ئەنجام بدەم، با نەفەوتێت، دوای ئەوە چی دەکەیت بیکە و ئازاد بە." حاڵەتێکی ڕۆحی وەهات لا دروست دەبێت کە تەنانەت لە سەرەمەرگیشدا هەوڵی بەجێهێنانی نوێژەکەت دەدەیت. ئیدی ڕەنگ و بۆی نوێژ دەگریت. دەتوانین لەو حاڵەتەی حەزرەتی خوبەیبیش کە پێش شەهیدبوونی هەموو شتێکی ڕەتکردەوە و تەنها داوای ئەنجامدانی نوێژی کرد بەو شێوەیە تێبگەین، بەڵێ نوێژ لای ئەو بوو بووە پارچەیەك لە ڕۆحی.

---

١. المُزمِّل: ٨.

٢. الطبراني، المعجم الكبير ١٢/٨٤.

## دالانی نوێژ

ئەنجامدانی نوێژ لە کاتی خۆیدا زۆر گرنگە، ئەنجامدانی لە دەستپێکی کاتی تایبەت بە نوێژەکەدا لە پێشترە. تەواوی زانایانی فیقهـ و فەرموودەزان و موفەسسیران جەختیان لەسەر ئەم خاڵە کردووەتەوە. لەبەر ئەمە دەبێت بەرنامەی ژیانمان وەها دابڕێژین کە نوێژەکان کاتی تایبەتی خۆیان وەربگرن و نەکەونە نێو کاتی کەراهەتەوە، وە هەوڵبدەین هەمیشە لەو کاتانەدا نوێژ و پەرستشەکانی پەیوەست بە نوێژ بە دڵێکی ئاسوودەوە ئەنجام بدەین. پێویستە بانگ بێت و قامەت بێت، هەریەك لەمانە دوعای تایبەت بە خۆیان هەیە. بە تێکڕا بۆ جێگیربوونی خەیاڵی نوێژخوێن لەسەر نوێژەکەی هەنگاوگەلێکی زۆر گرنگن. تەنانەت سفرەش ڕێورەسمێکی خۆی هەیە، سەبارەت بە ڕیزبەندی هێنان و چۆنیەتی دانانی خواردنەکان دەستوور و شێوازێکی تایبەتی هەیە. وە بۆ دەستکەوتنی چێژی تەواوەتی خواردنەکە ئەمانە یەك یەك پەیڕەو دەکرێن. جا بۆ دەسکەوتنی چێژی سفرەی ئاسمانیی نوێژیش دەبێت ئەوانە بە باشی پەیڕەو بکەین.

نوێژ، مامەڵەیەکە لە نیوان تۆ و الله (جَلَّ جَلَالُهُ)، هیچ شتێك نییە هێندەی نوێژ بتوانێت پەیوەندییەکی هێندە خێرا و نزیکت لەگەڵ خوادا بۆ ساز بدات. بۆ ئەمەش هەر لە سەرەتاوە دەبێت ئەم حاڵەتە لە ئاستە تیۆرییەکەیدا بگاتە بەهای ڕەسەنی خۆی. واتە هێشتا پێش ئەوەی تامی بکەیت و هەستی پێبکەیت و شنەیت بەر بکەوێت دەبێت لە بیری خۆتدا بڵێیت "ئەمە ئاوایە"، چونکە ئەم قەبوڵکردنە هەستی گەڕان بە شوێن واتای ڕاستەقینەی نوێژ لای تۆ دروستدەکات. ئەوەی ئەم هەستی گەڕانە ڕادەچەنێت و ئاماژەی داگیرسانی دەداتێ ئەم قەبوڵکردنەیە، گەر هەستێکی وەهات نەبێت، بیر و خەیاڵت سەبارەت

بە نوێژ شتێکی لەم شێوە نەبێت ئیدی تۆ چی بە ئامانج دەگریت لەوەدا؟ بەڵێ، پێویستە لە سەرەتاوە تەژی ببین لەم هەستەی "پەروەردگارم دەرفەتی ئەوەم پێدەبەخشێت کە لێرە بەندەی ئەوبم. با منیش بە کەماڵی ئەدەب و کەمەربەستە بوون بە پەرستشەوە ئەم کاری بەندایەتییەی بۆ نمایش بکەم. ئەو چەندە مەزنە! من چەند بچکۆلەم، ئەو چەند بێپایان و من چەند هیچم ... کەواتە با بەگوێرەی ئەمە ئەم کارە بەجێبهێنم، ئەمە دەرفەتی نیشاندانی بەندایەتیمە، دەرفەتی ناڵەی بچووکی و، دەرفەتی بانگی گەورەیی ئەو..."

ئاسوودەیی دوو واتای هەیە: یەکەم، گەیشتنە بە چێژی ڕۆحانی، بۆ نموونە مرۆڤ دەتوانێت بیربکاتەوە و بڵێت "خۆزگە ببوایە..." بەڵام بە لای منەوە پێویستە چاوەڕوانی ئەوەش نەبیت. ئاسوودەیی دووەم، قەبوڵ بوونتە سەرباری بچووکی و هیچێتی و سفربوونی ماهییەتت. ساتی ئاسوودەیی و دەستخستنی دەرفەتی لەخۆدووان لە ئاسوودەییدا. بەنی بەندی ئەم ئاسوودەییەین و داواکاری ڕەزامەندی و ئاسوودەیی ئەوین.

## نوێژی بەکۆمەڵ

ئەنجامدانی نوێژی بەکۆمەڵ زۆر گرنگە، ناشێت بە هیچ جۆرێك پشتگوێ بخرێت، ئێمە لە مەزهەبی حەنبەلی نین بەڵام تێڕوانینی ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بۆ نوێژی بە کۆمەڵ شایەنی تێڕامانە. ئەو بە کۆمەڵ ئەنجامدانی نوێژ بە مەرجی دروستی نوێژ دەزانێت، تۆ بڕوانە پیشەوایانی پێشینمان لە شوێنکەوتووان چەندە گرنگییان بە نوێژی بە کۆمەڵ داوە، ئەعمەش "سولەیمانی کوڕی میهران" بە درێژایی حەفتا ساڵ هەرگیز تەکبیری دەستپێکی نوێژی لەدەست نەچووە. بۆ حەفتا ساڵ تاکە ڕکاتێکیشی نەکەوتووەتە قەزاوە. یەکێکیتریان بە

درێژایی ژیانی بێجگە لە ئیمام پشتی کەسی نەدیوە.

سەروەرمان بۆ دەربڕینی گرنگی نوێژی بە کۆمەڵ دەفەرموێت "زۆر جار لە ناخمەوە دێت، یەکێکتان قامەت بکات و یەکێکتان بێتە پێشەوە ئیمامەتی بکات و منیش بڕۆم ماڵی ئەوانەی نایەن بۆ نوێژ بەسەریاندا بڕوخێنم"[1] بەڵێ نوێژی بە کۆمەڵ زۆر گرنگە، گەر من لێتان بپرسم "لە ژیانتاندا چەند نوێژتان بە تەنها و دوور لە کۆمەڵ ئەنجام داوە؟" ئەوە ئەگەر وەڵامەکەتان لە دە نوێژ زیاترە وەڵام مەدەنەوە، عەیبەیە لە بەرامبەر خوادا. ئەو دە نوێژەش دەبێت لە ڕێدا، یان لە فڕۆکەخانەدا بووبن، واتە کاتێك بووبێت کە دەرفەتی ئەنجامدانی نوێژەکەتان بە کۆمەڵ بۆ نەڕەخسابێت.

ژیان دەبێت بە گوێرەی نوێژ ڕێکبخرێت، هەروەك ڕۆژژمێرێك دەبێت نوێژ باڵ بەسەر هەموو ساتێکی ژیانماندا بگرێت. بناغەی ڕۆژژمێری ڕاستەقینەی ژیان دەبێت لەسەر نوێژەکان بنیاتبنرێت و بنووسرێتەوە، کاتەکانی نوێژ دەبێت بەردی پایەی کارەکانمان بن، کارەکانی دی دەبێت بە گوێرەی ئەو پایانە ڕێکبخرێن، کۆن کە خەڵك بەڵێنیان بەیەك بدایە بۆ کارێك دەیانوت "پێش نوێژی بەیانی... دوای نوێژی نیوەڕۆ"، لە قورئانیشدا جەخت لەسەر ئەمە کراوە و دەربڕینانێك وەك "دوای ئەنجامدانی نوێژ..."[2]، "کە هەستان بۆ نوێژ..."[3]، "کە ڕاوەستان بۆ نوێژ..."[4] بەکارهێنراوە و شتەکانی دی بە گوێرەی نوێژەکان ڕێکخراون.

## جیاوازی نیشاندان لە نوێژدا

"ئاه و ... وای" کردن و ناڵە و دەنگ لێبەرزبوونەوە لە نوێژدا ئەگەر بێ

---

١. البخاري، الأذان ٢٩؛ مسلم، المساجد ٢٥١.

٢. الجمعة: ١٠.

٣. المائدة: ٦.

٤. المائدة: ٦.

ویستی نوێژ خوێن بێت ئەوە كێشەیەكی نابێت، ئەگەر ئەمە داخوازی پلەیەك و هەڵقوڵاوی جەزبەیەك بێت ناتوانم هیچ بڵێم لە بارمیەوە. واتە ئەوەی كە كەسێك حاڵێكی لێ دێت، خەریكە لە هۆش خۆی بچێت و بێ ئەوەی ئاگای لە خۆی بێت دەنگێكی لێ بەرزدەبێتەوە و دەناڵێنێت، دوایش كە پێی بوترێت ”تۆ وەهات كرد“، بڵێت ”بە ڕاست، من هیچم بیر نایەتەوە“، ئەگەر بەم شێوەیە بێت ئەوە جیایە، بەڵام ئەگەر وا نەبێت، نابێت نوێژخوێن لە خۆوە دەنگ دەربكات و ڕەفتاری جیاواز نیشان بدات، گریانیش هەر بەو شێوەیە. دەبێت تا دەتوانین پێشی پێ بگرین بەڵام ئەگەر نەتتوانی خۆت بگریت و بێ ویستی خۆت لە ناختەوە هەڵقوڵایە سەرەوە ئەوە كێشەیەكی نییە.

دەربارەی نوێژی بەدیعوززەمان و حاڵی لە نوێژدا دەگێڕنەوە كە چاوەكانی حاڵێكی سەیریان بەسەردا دەهات، دەنگی ئاوازێكی سەرسوڕهێنەری پەخش دەكرد، جا ئەوە پەیوەستە بە ئاستی ئەوەوە. (ئەو حاڵەتانە پەیوەستن بە مەقامی كەسەوە) جا كەسێك كە بەو ئاست و مەقامە نەگەیشتبێت، هەستێت و لاسایی ئەو حاڵەتانە بكاتەوە و هەندێك جوڵە دەربهێنێت و نمایشیان بكات، بە هیچ جۆرێك كارێكی دروست نییە.

لەو پەرستشانەدا كە لەگەڵ خەڵكی بە یەكەوە ئەنجامدەدرێن مەترسی تێوەگلان لە شیرك و ڕیا لە ئارادایە، ئەگەر كەسێك لە تەنهایی و پەنهانیدا نوێژەكانی دا بە سەریەكدا و بە شپرزەیی لە كۆڵیكردنەوە و، پاشان لە نێو خەڵكدا دەستیكرد بە نوێژ درێژكردنەوە و ڕێك و پێك نیشاندان و ڕازاندنەوە، ئەوە خوا بمانپارێزێت كەوتووەتە نێو شیركەوە. بەو دیویشیدا كاتێك كەسێك بە تەنهایی نوێژەكانی بە ڕێكی و جوانی و بە درێژی ئەنجام دەدات، بەڵام لە لای خەڵكیدا كورتیان دەكاتەوە و لێیان دەبڕێت ئەوە ئەویش ڕیای ئەنجامداوە،

چونکە ئەم ڕەفتارەش هەر سەنگ بۆ ڕوانینی خەڵکی دانان و گرنگی دان بە بیرکردنەوەی ئەوانی تێدایە. بۆیە مرۆڤ چۆن بە تەنهایی نوێژدەکات دەبێت لە ناو کۆمەڵیشدا هەر بەو شێوە بێت، نە لێی ببڕێت و نە پێوەی بلکێنێت. نابێت هیچ جیاوازییەك نیشان بدات. دەبێت هەروەك "نوێژی شوان" بێت کە بە لای مەڕەکانییەوە ئەنجامی دەدات، چواندنەکە هەڵە نەبێت، مەبەست ئەوەیە ئایا شوان ڕوانینی مەڕەکانی لە کاتی نوێژکردنیدا هیچ بە هەند وەردەگرێت؟ لە لایەکی تریشەوە مرۆڤ دەبێت هەمیشە لە هەوڵدابێت بۆ ئەوەی نوێژەکەی بگەیەنێتە ئاستی نوێژی کامڵ. نوێژ پەرستشی فریادڕەسی ئێمەیە، خوانەخواستە با بە مامەڵەی هەڵەمان لەگەڵیدا نەبێتە هۆی چەرمەسەریی دوارۆژمان.

## یادگارییەک و هۆشیاربوون سەبارەت بە نوێژ

یەکێك لەو کەسانەی هەرگیز لە یادم ناچن باوکی بەڕێز مامۆستا محمد کرکنچی بوو (خوا لێی ڕازی بێت)، بەڕێز کاك جەلال لە مەدینە موجاویر بوو واتە "ئەو کەسەی لە شوێنێکی پیرۆزدا دەچێتە گۆشەنشینییەوە و خۆی بۆ خزمەتی ئەو جێیە تەرخان دەکات و هەر لەوێ پەرستشەکانی ئەنجام دەدات" پیاوێکی زۆر بە نرخ بوو، هەر لە مەدینەش وەفاتی کرد و هەر لەوێش نێژرا، کە ڕۆشتم بۆ لای زۆر پیر بوو، سەرباری ئەو تەمەنە زۆرە و ئەو ناڕەحەتییانەی باری تەمەن بەسەری هێنابوو، هەرگیز لە نوێژەکانیدا کەمتەرخەمی نەدەنواند و تەنانەت نوێژە سوننەتەکانیشی بە پێوە ئەنجام دەدا. بەڵام چون لە هەستان و دانیشتندا سەختی دەچەشت، لە تەنیشتی قەرەوێڵەکەیدا نوێژی دەکرد، بۆ ئەوەی بشتوانێت هەستێتەوە سەرێ دەستی بە قەرەوێڵەکەیەوە دەگرت. دوای ئەوەی نوێژێکی بەو شێوەی کە باسمانکرد ئەنجامدا، ڕوویکردە من و وتی

"مامۆستا من کە نوێژ دەکەم، دەست بەقەرەوێڵەکەوە دەگرم بۆ ئەوەی هەستمەوە، ئایا نوێژەکەم دروستە؟" ئەو تابلۆیەم هەرگیز بیرناچێتەوە، ئەوە چ هەستێکی جوانە... سەرباری هەموو شتێك هەوڵت بۆ ئەوە بێت بەندایەتییەکەت بەو شێوەیەی پێویستە بەجێ بگەیەنیت، بەڵام هێشتاش کۆڵ نەدەیت و هەر بە شوێن باشترەوە بیت...

بەڵێ، نوێژ سەرمایەی ڕزگاربوونی ئێمەیە لە دوارۆژدا بۆیە دەبێت زۆر هەستیار بین لە مامەڵەکردن لەگەڵیدا. داوامان وایە خوای گەورە نرخ و بەهای نوێژ بە ڕۆحەکانمان ڕەوان بکات و سەرباری کەموکورتییەکانمان لێمانی قەبووڵ بفەرمووێت.

## سوجدە و هەستانێکی پڕ لە هەست

دەتوانن لە سوجدەدا بێ وتنی هیچ وشەیەك بە تێڕامانێکی قووڵەوە چەندە دەتانەوێت بمێننەوە، گرنگ ئەوەیە مکوڕانە خۆمان بدەینە دەست شنەبای نوێژ، ڕەنگە یەك وشە بڵێیت، بەڵام وشەیەك کە هەڵتدەگرێت و ئاسۆت بەرەو فراوانترین مەودا دەبات، ئەمە بابەتی هەست و دەرکە و تێبینییەکی ویژدانییە. سوجدەی پێغەمبەری خوا ﷺ هێندەی ڕکوعەکەی درێژبوو. ماوەی ڕکوعەکەی هێندەی ماوەی وەستانی بوو. چەندە بە پێوەش بوەستایە هێندەی ئەوەندەش لە تەحیاتدا دادەنیشت، هەندێك جار نوێژە سوننەتەکەی ئەو هێندەی ماوەی تەواوی نوێژە تەراویحەکانی ئێمەی پێدەچوو. ئێمەش خەیاڵمان وایە بەو نوێژە تەراویحەوە کە ساڵی جارێك ئەنجامی دەدەین نوێژی زۆرمان ئەنجامداوە.

## ناسکیی دڵ و نوێژ

پرسیار: ئەو ڕەوانەی ناسکبوونەوەی دڵ و هەستیاریی نێو نوێژەکانمان کامانەن کە دەڕوانەنە سەر ئەرکەکانی دونیای ئێرە و ژیانی دواڕۆژمان؟

وەڵام: ناسکی دڵ نیشانەی ئیمانە، فرمێسکیش کە زوبانی دڵی ناسکە، داستانی سەرڕێژبوون و لێڕژانی کاسەی سینەی سووتاو و جگەری برژاوی قارەمانانی خۆشەویستییە، پێغەمبەری خوا دەفەرمووێت "لە دواڕۆژدا کاتێك کە بڵێسەکانی دۆزەخ پەل بۆ مرۆڤەکان دەوەشێنن و دەیانتۆقێنن، جوبرەئیل (علیه السلام) بە پەرداخێك ئاوەوە دەردەکەوێت، من لێی دەپرسم ئەوە "چییە؟" ئەویش بەم شێوەیە وەڵامم دەداتەوە "ئەمە ئەو فرمێسکانەیە کە بەندەکانی خوا لە ترسی ئەو بۆی گریاون و ڕژاندوویانە، وە ئەمە تاکە شتە کە دەتوانێت ئەو بڵێسەیەی پێ بکوژێنرێتەوە"[١]. بەڵێ، فرمێسك ئەو تاقانە ئیکسیرەیە کە دەتوانێت لەو دونیا کڵپەی ئاگری دۆزەخ و لەم دونیاش بڵێسەی ئاگری حەسرەت و هیجران بکوژێنێتەوە.

قورئانی پیرۆزیش لە چەندین جێدا ناسکی دڵی بەرزنرخاندووە و فەرموویەتی "قُلْ آمِنُوا بِهِ أَوْ لَا تُؤْمِنُوا إِنَّ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ مِنْ قَبْلِهِ إِذَا يُتْلَى عَلَيْهِمْ يَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ سُجَّدًا" واتە "ئەی موحەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) پێیان بڵێ باوەڕ بێنن بەم قورئانە یان باوەڕی پێ نەهێنن بەڕاستی ئەوانەی کە زانیارییان پێ بەخشراوە لەپێش ئەم (قورئانە) دا کاتێ (قورئان) بخوێنرێتەوە بەسەریاندا بەچەسپانی دەکەون بەڕوودا بەسوژدە بردن"[٢] لە جێیەکی دیکەدا هۆشیاری دەدات و دەفەرمووێت

١. بروانە: أحمد بن حنبل، الزهد.

٢. الأسراء: ١٠٧.

"فَلْيَضْحَكُواْ قَلِيلا وَلْيَبْكُواْ كَثِيرا" واتە "با کەم پێبکەنن و زۆر بگرین"[١] سەروەریشمان دەفەرمووێت "خوایە گیان لە دڵێکی دانەخورپاو و چاوێکی فرمێسک لێ نەڕژاو پەنات پێ دەگرم"[٢]

دڵێکی ناسک، دەروونێکی لەرزان لە بەرامبەر خواوە، بە ڕووی چاودێری و لێپرسینەوەی خوددا کراوە دەبێت و هەر زوو زوو خۆی دەخاتە بەر تەرازووی لێپرسینەوەوە. سەرکەوتنەکانی بە هی خۆی نازانێت و هەمیشە ئەو کارەی ئەنجامی دەدات لای کەمە. بەڵکو دەبێتە قارەمانێکی "هل من مزيد" چی زیاتر هەیە ئەنجامی بدەم؟ کە لە مەیدانی خێر و چاکەدا تێربوون نازانێت.

سەبارەت بە کەسێکی دڵ ناسکیش هەرگیز تێربوون و بە تەواوبینینی ئەو کارانەی ئەنجامیداوە جێی باس نییە. پاش نوێژە فەرزەکان چەندە نوێژی سوننەت ئەنجامدەدرێت و پەرستش دەکرێت، بابەتێکە بەستراوەتەوە بە باوەڕ و ویستی خودی تاکەکەسەوە، کەسێك دەتوانێت سەبارەت بەو نوێژانەی ئەنجامی داون بڵێت "من ئەو نوێژانەم بە ئامادەیی تەواوی دڵەوە نەخوێندووە و وەك ئەوەی پێویستە ئەنجامم نەداون، با هیچ نەبێت لە جێی ئەوانەدا نوێژی سوننەت و نافیلە بخوێنم یاخود ئەو نوێژانەی بێ تێڕامان ئەنجامم داون قەزا بکەمەوە و بگێڕمەوە". بڕێکی کەم دادەنێت، چون نازانێت مەرگ چ کاتێك دێت بەپیرییەوە بۆیە لە کاتێکی کەمدا جێیان بۆ دەکاتەوە و بۆ نموونە ڕۆژانە نوێژی چەند ڕۆژێك دەگێڕێتەوە و بەم شێوەیە کەموکورتییەکانی دادەپۆشێت.

دەستەواژەی "جبر النقصان" واتە "قەرەبووکردنەوەی کەم و کورتی" بۆ نوێژە نافیلەکان بەکاردەهێنرێت. ئامانج ئەوەیە لە ڕێی ئەمانەوە کەموکوڕی نوێژە

---

١. التوبة: ٨٢.

٢. ابن الجوزي، كشف المشكل ٤٣٤/٢؛ ابن حجر، فتح الباري ١٣٩/١١.

فەرزەکانمان پڕ بکەینەوە و برین و شکاوییەکان دەستبەجێ لە شوێنی خۆیدا تیمار بکەین و بیپێچینەوە. جا ئەم بابەتە شتێکە لەسەر ویستی تاك خۆی وەستاوەتەوە. بۆ نموونە کەسێك کە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بێ ئەوەی دڵی بە تەواوی ڕووبکاتە خوا نوێژی خوێندووە، ڕۆژێك لە حەقیقەتی نییەت تێدەگات و پێناسەیەکی وەك ئەمە بۆ نییەت دەدۆزێتەوە کە نییەت ویست و مەبەستی دڵ و ڕووکردنە خوایە. ڕووکردنە خواش "تەوەجوە" یش بەو شێوەیە تێدەگات کە بریتییە لە سڕینەوەی "هەموو شتێك جگە لە خوا" لە دڵدا و بیرچوونەوەی هەموو شتێك لە کاتی نوێژدا و تەنها و تەنها ڕووکردنە خوا. کەسێك کە بەم شێوەیە لە نیەت گەیشت ئەگەر بەم حاڵەوە نەوەستێت بۆ نوێژەکەی ئەوە بۆ نوێژ نەوەستاوە و وا هەژمار دەکرێت کە نوێژی ئەنجام نەداوە. لەم بابەتەدا هەمووان دەبێت بە گوێرەی ئاستی خۆمان بکەوینە خۆ، لە هەندێك کتێبی مەزهەبی حەنەفیدا، گەرچی سەرچاوەکەشی نادیاریێت، بەڵام ئەوە تۆمارکراوە کە وتنی "نییەت بە زوبان باشترە"، جا ئایا لەگەڵ قسەکردندا ئاڕاستەکردنی دڵ چۆن وەدی دێت، ئەوەش نازانم، بەڵام هەر چۆن بێت ئەمە وەك عادەتێکی لێهاتووە.

موسڵمانان کاتێك بۆ نوێژ ڕادەوەستن بە دەنگی بەرز دەڵێن "نويت أن أصلي لله" وە نییەت دەهێنن، لەوە باشتر چی ئەگەر بەم شێوەیە تەوەجوهی قەلب بەرەو خوای مەزن بەدەست بێت، بەڵام ئەگەر هەر وتە بێت و تەنانەت بێئەوەی دەرك بەوە بکرێت چ دەوترێت، هەندێك وشە ڕیزبکرێن و بۆ نوێژ بوەستین و قیبلەنماکەی دڵیش هێشتا ڕووی لەو جێیە نەکردبێت کە دەبێت ڕووی لێ بکات، ئەوە ئەگەری هەیە ئەو نوێژە بە نوێژ هەژمار نەکرێت. بەڵێ جا ئەو کەسەی بەمشێوەیە ئەلف و بێی نییەت فێربووە و لە پەیوەندییەکی لەم شێوەیەوە دەستی بە ژیان کردووە، دەکرێت بڵێت "ڕاستە من لە کاتی خۆیدا نوێژەکانم ئەنجامداوە، بەڵام لەوەی داخۆ

مافی پەرستشەکانم داوە دڵنیا نیم. بۆیە دەبێت "جبر النقصان - قەرەبووکردنەوەی کەموکوڕی" ئەنجام بدەم، وە نوێژی نافیلە بخوێنم.“ پاشان ئەگەر خوا سی ساڵی دیکە عومری پێببەخشێت ئەوا هەر ڕۆژێك قەزای نوێژەکانی ڕۆژێکی دەگێڕێتەوە و کەلێن و کەموکورتییەکانی پڕدەکاتەوە.

لەلایەکی دیکەوە لە مەزهەبی حەنەفیدا وەك چۆن دەبێت پێنج فەرزەی نوێژەکان بەوپەڕی لێبڕانەوە ئەنجامبدرێت، دەبێت سوننەتی پێنج فەرزەکەش بخوێنرێت. دوازدە ڕکات لەمانە لەلایەن سەروەرمانەوە جەختیان لەسەر کراوەتەوە و سوننەتی موئەککەدەن، جەختکردنەوەیەکی لەم شێوەیە بۆ سوننەتی عەسر نییە، بەڵام ئەویش هەر لە "فضائل"ە. چوار ڕکات سبوننەتی پێش نوێژی عیشاش هەر لە فضائیلە. ئەویش لە کوتوبی سیتتە (شەش کتێبەکە)دا باسی نەهاتووە، تەنها لە کتێبی "فتح باب العناية"ی "علی القاریء"دا بە پشت بەستن بە فەرموودەیەکی سەروەرمان کە لە سونەنی سعیدی کوڕی مەنصوردا هاتووە، باس لەوەکراوە کە پێغەمبەرمان پێش نوێژی عیشا چوار ڕکات نوێژی سوننەتی ئەنجامداوە.[١]

نوێژی تەهەججودیش "شەونوێژ" زۆر گرنگە، ئەوانەی شەوانیان بە مەشخەڵی شەونوێژ وەك ڕۆژ ڕۆشن کردووەتەوە، ئەوا ژیانی بەرزەخیشیان بۆ دەبێتە ڕۆژی درەخشان، شەونوێژ لە بەرامبەر تاریکی شەودا قەڵغان و چەکە و مەشخەڵی ڕووناکی و کەناری ئارامبەخشی لە سزا پارێزەرە، لەڕاستیدا هەر نوێژێك ئەرکی ڕۆشنکردنەوەی گۆشەیەکی ژیانی ئەودیو پەردەی مەرگی پێسپێردراوە، شەونوێژیش کراوەتە ترێشوو، مەشخەڵ و چرای بەرزەخ.لە قورئانیشدا چەندین جار ئاماژە بە شەونوێژ کراوە. بۆ نموونە:

---

١. بڕوانە: ابن حجر، الدراية ١٩٨/١؛ علي القاري، فتح باب العناية ٣٢/١ (هەردوو سەرچاوەکە لە سعيد بن منصورەوە وەریانگرتووە).

﴿ وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَتَهَجَّدۡ بِهِۦ نَافِلَةً لَّكَ عَسَىٰٓ أَن يَبۡعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحۡمُودًا ﴾ (الإسراء: ٧٩)

"وەك نوێژێكی تایبەت بە خۆت شەوانە هەستە نوێژ بكە و قورئان بخوێنە، سا بەڵكو خوای گەورە بەرەو مەقامی مەحموود بەرزتبكاتەوە (پاشان دەتوانیت ئومێد بخوازیت كە خواوەند بۆ پلەیەكی ڕێزلێگیراوت بەرزبكاتەوە)."

﴿ مِن لَّدُنكَ سُلۡطَٰنًا نَّصِيرًا ﴿٨٠﴾ وَقُلۡ جَآءَ ٱلۡحَقُّ وَزَهَقَ ٱلۡبَٰطِلُۚ ﴾

(السجدة: ١٦)

"لەسەر جێگاكانیان هەڵدەستن و ڕوودەكە خواو بە ترسی سزای ئەوەوە و بە ئومێدی رەحمەتیەوە لێی دەپاڕێنەوە و دوعا دەكەن، وە لەو شتانەی ڕۆزیمان داون دەبەخشن"[1]

﴿ وَٱذۡكُرِ ٱسۡمَ رَبِّكَ بُكۡرَةً وَأَصِيلًا ﴿٢٥﴾ وَإِن كَادُواْ لَيَسۡتَفِزُّونَكَ مِنَ ٱلۡأَرۡضِ لِيُخۡرِجُوكَ مِنۡهَا أَدۡخِلۡنِي ﴾ (الإنسان: ٢٥ - ٢٦)

"بە شەو و بە ڕۆژ یادی پەروەدگارت بكەو! لە بەشێكی شەودا سوجدەی بۆ بەرە و شەوانە ماوەیەكی درێژ تەسبیحاتی ئەو بكە."[2]

نوێژی شەونوێژ "تەهەجود" دەكرێت دوو ڕكات یان هەشت ڕكات بێت، بەگوێرەی ڕیوایەتی بوخاری و موسلیم، عەبدوڵلای كوڕی عومەر خەوێكی بۆ پێغەمبەرمان گێڕاوەتەوە كە لە خەونیدا دوو كەسی ترسناك هاتوون و پەلكێشیان كردووە و بەرەو چاڵێكی قووڵی پڕ ئاگریان بردووە، كاتێكیش ئەم ترساوە لەوەی فڕێیبدەنە نێو ئاگرەكەوە پێیان وتووە "مەترسە! تۆ پێویست ناكات بترسیت." پێغەمبەریشمان لە وەڵامدا بەم شێوەیە عەبدوڵلای كوڕی عومەری هانداوە

١. السجدة: ١٦.

٢. الإنسان: ٢٥-٢٦.

"ئیبن عومەر چەندە کەسێکی باشە! خۆزگە نوێژی شەونوێژیشی ئەنجام بدایە." بەڵێ ،خوا لە خەودا تابلۆیەکی بەرزەخی نیشانی حەزرەتی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر داوە و ئاماژەی پێداوە تا ئامادەسازی بۆ بکات.[1]

لە دوای ئەمانەش نوێژە سوننەتەکانی تری وەك نوێژی "چێشتەنگاو و ئەووابین" کەموکوڕیی نوێژە فەرزەکانمان پڕدەکەنەوە و ئەرکی برینپێچ دەبینن لە بەرامبەر برینەکانیاندا، خوای دلۆڤان کەلێنی نوێژە فەرزەکانمان بە نافیلەکان بۆ پڕدەکاتەوە.

بە گوێرەی فەرموودەیەك کە ئەم قسەیە پشتڕاست دەکاتەوە، لە دوارۆژدا یەکەم شت کە لێپرسینەوەی لەسەر دەکرێت نوێژە، جەنابی حەق دەپرسێت: "نوێژی بەندەکەم تەواوە؟" ئەگەر وەڵام "بەڵێ" بێت، دەفەرموێت "با ئەو بڕوات تەواو،" ئەگەر لەوەڵامیشدا بوترێت "نوێژەکانی ناتەواوە" خوای گەورە دەپرسێت "ئەی نوێژی سوننەت و نافیلەی هەیە؟" ئەگەر وەڵامی ئەمەیان "بەڵێ" بوو خوا بە لوتفی خۆی دەفەرموێت "نافیەلەکانی بۆ بخەنە شوێنی فەرزەکانی" وە بە میهری ئیلاهی نافیلەکانی جێگای فەرزە ئەنجامنەدراوەکانی دەگرنەوە[2]، بۆ ئەمەش دەتوانین بڵێین کە "لەوێدا قەرەبووکردنەوەی کەموکورتییەکان "جبر النقصان" ڕاستەوخۆ بە ویست و داخوازیی ئەو بەدی دێت، واتە لە دوارۆژدا خوای میهرەبان برینی فەرزەکانمان بۆ دەپێچێت."

پوختەی قسە ئەوەیە ناسکی دڵمان و بە جێهێنانی لێبڕاوانەی نوێژەکانمان بە فەرز و سوننەت و نافیلەیەوە، بۆ هێنانەجێی ئەرکی بەندایەتی ئەم دونیامان سەرچاوەی عەشق و شەوق و هێز و ورەیە، لەودیو پەردەی ژیانیشەوە لە ڕێی پڕ

---

١. البخاري، التهجد ٢، ٢١، فضائل أصحاب النبي ١٩؛ مسلم، فضائل الصحابة ١٣٩، ١٤٠.

٢. ابن ابي شيبة، المصنف ٢٧٠/٦؛ البيهقي، السنن الكبرى ٣٨٧/٢.

مەترسی بە مردن دەستپێکردووی تا دەرگای بەهەشت درێژەوەبوودا هاوڕێیەکی سەرڕاست و ڕێنوێنێکی ڕێزلێگیراو و کار بۆ ئاسانکراو دەبێت، نوێژ هۆی نزیکبوونەوەمانە لە خوا و بۆ پتەویی پێشمان بە درێژایی ڕێ پەتێکی نەپساوە و دەستگیرێکی مەحکەم و نەشکاوەیە، لە کۆتاییدا دەڵێین نوێژ ئەو قەڵایەیە کە سەرچاوەی ژیانێکی پاکیزانەیە، پارێزەری گەوهەری گیانمانە لە چڵك و تۆزی دونیا، لە کۆتاییدا بە واتای ئەو ئایەتەش کە ئەم ڕاستییە دەنەخشێنێت بابەتەکە دادەخەین، "ئەو کتێبەی بۆت نێردراوە بیخوێنەوە و بیگەیەنە، وە نوێژەکانت ئەنجام بدە و مافیان پێبدە، بێگومان نوێژ مرۆڤ لە ڕەفتاری بەد و کارگەلی ناپەسەند دەپارێزێت. جا یادی خواوەند لە ڕێی نوێژەکانەوە مەزنترین فەزیلەتە، خوایش بە هەر کارێك کە ئەنجامی دەدەن شارەزایە"[١]

## شەیتان و دزینی نوێژ

لە نوێژدا ڕوانین بەملاولادا پێی دەوترێت دزیی شەیتانی، واتە شەیتان کە نەیتوانیی تەواوی نوێژەکەت لێ بدزێت، بەشێکیت لێ دەدزێت، ناتوانێت ئەرکانەکان بدزێت بۆیە دوا دەرفەتی لە دزینی ڕوانینتدا بەکاردەهێنێت. پەلەقاژەیەتی کە "داخۆ دەتوانم وای لێ بکەم، بۆ لای ڕاست بڕوانێت یان بۆ لای چەپ بڕوانێت."

ئامادەین لە نوێژەوە دەست بە جووڵە بکەین! مامۆستاکەمان چەندە مرۆڤێکی ڕەوشت باڵایە تەماشا بکەن چی دەڵێت "ئینشائەڵڵا بە تەواوی ئیخلاس تێتاندا ڕەنگ دەداتەوە و منیش بەرەو ئەو ئیخلاسە تەواوە دەبەن"[٢] منیش وەك ئەو دەڵێم

١. العنكبوت: ٤٥.

٢. بەدیعوززەمان، بریسکەکان (بریسکەی بیست و یەك، دەستووری دووەم).

"ئینشائەڵڵا نوێژێکی تەواو و بێ کەموکوڕیی ئەنجام دەدەن و فێری منیشی دەکەن کە نوێژەکانم بە تەواوی ئەرکان و ئادابەکانییەوە بەجێبهێنم، ئەودەم بە شوێن هەر کەس بکەویت ڕزگارت دەبێت، جا وەرن هەموو پێکەوە بڕیاری ڕزگاریمان بدەین."

نابێت ڕێ بدەین هیچ پارچەیەك لە نوێژەکانمان بدزرێت، چونکە ئەو نوێژە ئەمانەتە بەسەر ئێمەوەیە. با نەهێڵین شەیتان لە ڕوانینی چاومان یاخود لە هەستان و دانیشتنمان یاخود لە هەر شتێکی تری ناو نوێژەکەمان بدزێت، مرۆڤ کە متمانەپێکراوی ئەمانەتی نوێژی کامڵە، دەبێت بە جۆرێك نوێژ بەجێبهێنێت کە یەکبێتەوە لەگەڵ نرخی ماهییەتی حەقیقەتی نوێژدا، بۆ نموونە نوێژ وەها دەبینم کە خاوەنی جەستەیەکی میسالی ئوخرەوییە کە لە سەفەری ئەبەدیدا دەبێتە هاوڕێی ئەوانەی مافی دەدەن و وێنەیەکی درەخشانی ڕوو ئاسمانیی سەر و ئەندام ئاوازەی وەهای هەیە کە ناتوانرێت بچوکترین تەشەری ئاڕاستە بکرێت. جا ئەگەر لە جێیەکدا بەربەست بۆ دزییەکانی شەیتان دانەنێین، ئەوا بە ئارەزووی خۆی ڕۆژێك چاوی بریندار دەکات، ڕۆژێك لە گوێی و ڕۆژێك لە لووتی دەدات، ڕۆژێکی دی لێوی خوێن لێدەهێنێت، لە لایەك دەستی دەبڕێتەوە و لە لایەك قاچی... تا حاڵێکی بەسەردا دەهێنێت کە ئیتر من نازانم ئەو بوونە میسالییەی لەو دونیا چیتان پێدەڵێت، بە دڵنیاییەوە زۆر شتی دەبێت بیڵێت، جا دەڵێت "خوا خێرتان بنووسێت، جوانیمتان بە هەدەردا" یاخود دەڵێت "منتان لەناوبرد"، جا تەنها ڕێیەك بۆ ڕزگاربوون لە ناڕەحەتی و سەختیی ئەودیوتان ئەوەیە لێرە دڵی نوێژەکانتان ناڕەحەت نەکەن و نەهێڵن دەستی دز و جەردەکانیان پێ بگات. دەبێت بە تەواوی دڵ و هەست و لەتیفەکانتانەوە ڕووتان لە خوا بێت.

نابێت بهێڵن لە هیچ لایەکەوە هیچ شتێکی لێ بدزرێت، بۆ ئەو کەسانەی لە

سەرەتای ڕێگەدان ئەنجامدانی ئەمە بە هەستێکی تەواوەوە، سەختە. درۆ دەبێت گەر بڵێت "هەستم پێ کردووە" بەڵام خواوەند ڕۆژێك ئەو دەرگایە واڵا دەکات. ئێوە تەنها دان بە خۆتاندا بگرن و گرنگترین و باشترین کاتەکانتان بۆ نوێژەکانتان تەرخان بکەن و زۆر بۆ خۆتان بهێنن ئینشائەڵا ڕۆژێك دێتە پێشەوە توانایی ئەو ئەنجامدانە جوان و ناوازەیەش لە دایك دەبێت.

ئەگەری هەیە، هەندێك لە خواناسان بۆ گەیشتن بە حەقیقەتی نوێژ هەموو شەوێك هەزار ڕەکات نوێژیان ئەنجامدابێت. قوتابییە یەکەمینەکانی بەدیعوززەمان بە لێبڕانی تەواوەتییەوە نوێژیان ئەنجامدەدا، من کەسانێکم دیوە کە بەڕاستی نوێژیان دەخوێند، زۆربوون ئەوانەی کە چەند سەد ڕکات نوێژیان ئەنجامدەدا، هێندە کە ناژمێررێن. ئەم ئوممەتە نوێژیان لە بیرچووەتەوە، مزگەوتەکان تەنها شێوەیان لێماوەتەوە، ئێستا فەرشەکان حەسرەتی فرمێسك گرتوونی و بەرماڵەکان حەسرەتی نێوچەوانی بێگەرد.

نوێژ دڵی پەرستشە، هەر پایەیەکی نوێژیش هەروەك دەمارەکان بەهایەکی تایبەت بە خۆیان هەیە، بەڵام بەنرخترین پارچەی ئەم دڵە لە کاتی نێوچەوان لە زەوی دانانە، دەمی سەجدەیە، سەروەرمان فەرموویەتی "نزیکترین شوێن بۆ بەندە لە خواوە سەجدەیە"[١]. بەڵێ، سەجدە شادەماری نوێژ و تەختی تاج لەسەرنانیەتی.

---

١. مسلم، الصلاة ٢١٥؛ أبو داوود، الصلاة ١٤٨؛ النسائي، التطبيق ٧٨.

# دوعا

## باوەڕهێنان بە دوعا

لە دوعاکردندا ئەوەی ئەصڵ و بنەڕەتییە باوەڕهێنان و متمانەداربوونە بە قەبوڵ بوونی، دەستکردنەوە لە دوعادا لە لایەک، لەڕاستیدا مرۆڤ دەبێت دڵ و گیانی بە ڕوویدا بکاتەوە، ئەو زیکرانەی لە دوعای پاش نوێژەکانی بەیانی و عەسردا دەخوێنرێن لە "مجموعة الاحزاب"دا هاتووە، بەڵام بە جیاوازییەکی کەمەوە لەوێدا بە "سُبْحانَكَ يا اَللهُ تَعالَيْتَ يا رَحْمنُ اَجِرْنا مِنَ النّارِ بِعَفْوِكَ يا مُجير" هاتووە، کە (مُجيرُ)یش هەر یەکێکی ترە لە ناوەکانی خواوەند. بەڵام وتنی "بِعَفْوِكَ يا رَحْمن" لای منیش چێژدارترە، بێگومان حەزرەتی بەدیعوززەمانیش ئەم دوعایەی زۆر بە گرنگ زانیوە بۆیە لە دوای نوێژی بەیانی و عەسر خوێندوویەتی.

حەزرەتی گوموشخانەوی زۆر شتی دەربارەی دوعاکانی نێو "مجموعة الاحزاب" وتووە، جا پێویستە ئەو دەربڕینانەی لە یەکەم ڕوانیندا تا ڕادەیەک وەک زیادەڕەویی دەردەکەون لە نێو چوارچێوەی ئەو پێوەرانەدا لێکبدرێنەوە کە ماموۆستا بەدیعوززەمان دەستنیشانی کردوون، واتە ئەو حاڵەتە بە خوێنەرەوە پەیوەستە. بە دەربڕینێکی دی بۆ نموونە کاتێک دەوترێت "ئەوەی جارێک ئەم دوعایە بخوێنێتەوە دەچێتە

بەهەشت". دەبێت بەم شێوەیە تێبگەین کە ئەم دوعایە دوعایەکی هێندە مەزنە، ئەو کەسەی جارێك بە باوەڕپێکردن و دڵپێدان و شێوازی شایانی خۆیەوە بیخوێنێت دەتوانێت بەهەشت بەدەستبهێنێت "باوەڕی خودی من وەهایە کە گەر کەسێك دڵ و گیانی بکاتەوە بە تەواوی بوون و ئیمانییەوە جارێك بڵێت "الله!" وە پاشان لەباڵەخانەیەکی دە نهۆمییەوە خۆی فڕێبداتە خوارەوە، کاتێك دەکەوێتە سەرزەوی خشت و چیمەنتۆ و بەردی زەوییەکە پارچە پارچە دەبن بەڵام ئەو هیچی بەسەردا نایەت. بە تایبەت لەم ڕۆژگارەدا کە جیهانی ئیسلامی خەڵتانی خوێن بووە، زۆر پێویستە کە سینەکان بەدەم دوعاکردنەوە شەقار ببن. بەڵێ، زۆر پێویستمان بەمەیە."

## دوعا و تامەزرۆیی پەرستش

پرسیار: ئەو کەسانەی لەسەر ڕێبازی پیشەی هاوەڵانن، بەگشتی لە بەرزبوونەوەی مەعنەوی خۆیان ئاگادارنین، بەڵام بە تێپەڕبوونی کات تامەزرۆییەکی لەڕادەبەدەریان بۆ پەرستش و خواپەرستی لا دروست دەبێت، هەروەك بڵێیت هێزێك بەرەو پەرستش و تەسبیحات و ئەوراد و ئەزکارەکان پاڵیان پێوە بنێت و کەمەندکێشیان بکات، ئایا ڕوونکردنەوەی ئەمە چیە؟

وەڵام: دەرکەوتنی ئەم حاڵەتە لە کەسێکدا کە بەردەوام پەرستش ئەنجام دەدات، وەك چۆن دەکرێت بۆ بوونی پەرستش بە بەشێك لە سروشت و فیترەتی ئەو کەسە بگەڕێتەوە، هەرواش دەکرێت هۆکاری ئەوەبێت جەنابی حەق بە نهێنییەکی لە ئێمەوە نادیار ئەو تامەزرۆییەی لە دڵی ئەو کەسەدا چاندبێت. لە هەردوو بارەکەشدا ئەم تاسەمەندی و تامەزرۆییە لوتفێکی ئیلاهییە. پەرستشکردن خۆی لە خۆیدا لوتفێکی ئیلاهییە، تامەزرۆیی و ئارەزوویەکیش کە لە ناخەوە بۆ ئەم

پەرستشانە دروست دەبێت لوتفێکی دیکەیە لە سەروو لوتفە یەکەمینەکەوە. جەنابی الله (جَلَّ جَلَالُهُ) هەندێك جار ئەم هەستە بە بەندەیەکی خۆی دەبەخشێت، بەندەکەش وای لێدێت پەرستشەکان وەك پێویستییەکی سروشتی و بەشێك لە بوونی دەبینێت. ئەمەش واتای ئەوە دەگەیەنێت کە پەیوەندی نێوان بەندە و پەرستش قۆناغی چێژ تێدەپەڕێنێت و دەبێتە تامەزرۆیی. ئیدی بەم تامەزرۆییەوە دەڵێت "چەندە پەرستش ئەنجام بدەم، هێشتا کەمە."

جا ئەگەر بەندەیەك سەرباری پەرستشی زۆر و ئەوراد و ئەزکاری فرە هێشتا هەستی وەها بێت کە بەندەیەکی باش نەبووە و پەیوەست بە فەلسەفەی "خوایە من توانایيم نییە بەو جۆرە پەسن و ستایشی تۆ بکەم کە خۆت پەسن و ستایشت کردووە" باوەڕی وابێت ئەرکی خۆی بەجێنەهێناوە، واتە لە ئاستێکدا بێت کە هەرچی ئەنجام دەدات هێشتا بەکەمی بزانێت، ئەوە بە ڕاستی ئەم بەندەیە بووەتە جێی درەخشانەوەی لوتفگەلی فراوانی ئیلاهی، کەسێکی لەم شێوەیە لە ڕۆژێکدا سەد جار سەڵات و سەلام لەسەر پێغەمبەر دەدات و پاشان دەڵێت "یا رسول الله نەمتوانی بەگوێرەی شان و شکۆی تۆ صەڵاواتت لەسەر بدەم"، بۆ نموونە گەر مرۆڤ ڕۆژانە هەزاران جار (الله اکبر، سبحان الله، الحمد الله) بڵێت و هەروەك پێغەمبەرمان لە فەتحی مەککەدا دەیفەرموو، ئەمیش بڵێت "لا إِلَهَ إلا اللهُ وَحْدَهُ صَدَقَ وَعْدَهُ وَنَصَرَ عَبْدَه وَهَزَمَ الأَحْزَابَ وَحْدَه - هیچ خوایەك نیە جگەلە "الله"، خوایەك کە تاك و تەنهایە، بەڵێنی بردە سەر و بەندەکەی سەرخست و هەر خۆی بە تەنها دەستەی دوژمنانی تێکشکاند."[1] بەڵام پاش ئەمە هێشتاش ڕازی نەبێت و بڵێت "ئەمە زۆر بچووکە لە بەرامبەر مەزنیی خوادا، زۆر نەنگییە گەر تەنها هێندە بڵێم"، پاشان لە ناخییەوە ئاوازی "لَا أُحْصِي ثَنَاءً عَلَيْكَ أَنْتَ كَمَا أَثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ[2] - من

---

١. ابو داود، الديات، ١٧؛ النسائي، قاسمة، ٣٣-٣٤؛ احمد بن حنبل، مسند، ٥/٣، ٤١٠/٤١١.

٢. مسلم، صلات، ٢٢٢؛ ترمزي، دعوات، ٧٥،١١٢؛ ابو داود، الصلات، ١٤٧.

ناتوانم وەك ئەوەی تۆ پەسنی و سەنای خۆت کردووە، پەسن و سەنات بکەم" زەمزەمە بکات، ئەوا ئەو کەسە بە ڕاستی جێ درەخشانەوەی لوتفی ئیلاهییە .

ئەو کەسەی بەو کارانەی دەیکات ڕەزامەندە، ئەوە باوەڕدارە، ئیمانی هێناوە، لەپەرستش و بەندایەتییدا ڕێك و ڕاستە، بەڵام هێشتا نەگەیشتووەتە ئاستی ئەو درەخشانەوە خواییانە. واتە ئەوەی بەندە بگاتە ئاستێك گەر ڕۆژی هەزار ڕەکات نوێژیش بخوێنێت هێشتا بڵێت "نەخێر، بە هیچ شێوەیەك من نەمتوانیوە قەرزی خوا بەسەرمەوە بدەمەوە". هەمیشە بەو تێبینییەوە هەستێت و دانیشێت کە "من نەمتوانیوە شوکرانەبژێریی خاوەند دەرببڕم" ئەوە بەڕاستی بەهرەوەرییەکە لە سەروو هەموو بەهرەوەرییەکانەوە، ئەوەتا بۆ نیشاندانی دیوی کامڵی ئەم باسە ئەم چەند دێڕە وتراون کە وەك فەرموودەش دەگێڕرێنەوە "مَا عَرَفْنَاكَ حَقَّ مَعْرِفَتِكَ يَا مَعْرُوفُ" ئەی پەروەردگاری لە لایەن هەموو بوونەوەرانەوە ناسراو، ئێمە نەمانتوانیوە تۆ بەجۆرێك کە شایەنی ناسینی تۆیە، بناسین"[1]، "مَا عَبَدْنَاكَ حَقَّ عِبَادَتِكَ يَا مَعْبُودَ - ئەی پەروەدگاری تاقانە پەرستراو ئێمە نەمانتوانیوە شایەن بە مەزنیی تۆ پەرستشت بەجێبهێنین."

"مَا شَكَرْنَاكَ حَقَّ شُكْرِكَ يَا مَشْكُورُ - ئەی ئەو کەسەی کە بە هەموو زمانێك سوپاسگوزاریت دەکرێت، چەندە بێچارەین ئێمە، نەمانتوانی وەك ئەوەی پێویستە سوپاسگوزارت بین."

"مَا ذَكَرْنَاكَ حَقَّ ذِكْرِكَ يَا مَذْكُورُ - ئەی ئەو پەروەردگارەی لەلایەن هەموو بوونەوەرانی ئاسمان و زەوییەوە یادی ناوت دەکرێتەوە، ئێمە نەمانتوانیوە بە جۆرێك کە شایەنی تۆیە زیکر و یادت بکەین"، ئەم وتانە بە پێودانگی ویژدان و بە تەرازووی قەدرشناسییەکەی بەردەوام ئاوازی "ئێمە هێندەی کە شایانی تۆیە نەبووین" دەڵێنەوە.

---

١. المناوي، فيض القادر ٤١٠/٢؛ العلوسي، روح المعاني، ٢٠٢/٧٩،١٧/٤.

بەو هۆیەی جێگیربوونی ئیمان لە دڵدا بابەتێکی زۆر گرنگە، من لە نزاکانمدا بەردەوام ئەم دوعایە دووبارە دەکەمەوە "اللَّهُمَّ يَا مُقَلِّبَ الْقُلُوبِ ثَبِّتْ قُلُوبَنَا عَلَى دِينِكَ - پەروەردگارا، ئەی ئەو کەسەی کە دڵەکان ئەمدیو و دیو پێدەکەیت دڵەکانمان لەسەر پەیام و ڕێبازەکەت جێگیر و دامەزراو بکە"، گەرچی پێغەمبەرمان بە گشتی دوعاکەی بە ناوی کەسی یەکەمی تاکەوە ئەنجامداوە[1]، واتە "اللَّهُمَّ يَا مُقَلِّبَ الْقُلُوبِ ثَبِّتْ قَلْبِي عَلَى دِينِكَ" بەڵام من لە جێگەیەکدا[2] وەك "قُلُوبَنَا" بەرچاوم کەوتووە گەرچی ئەوەی زۆرتر بەناوبانگە ئەو شێوازی دووەمە کە باسم کرد. لە نزایەکی دیکەشمدا دەڵێم "اللَّهُمَّ يَا مُصَرِّفَ الْقُلُوبِ صَرِّفْ قُلُوبَنَا عَلَى طَاعَتِكَ - پەروەردگارا، ئەی ئەو کەسەی کە دڵەکان ئاراستە دەکەیت و بە هەر بارێکدا بتەوێت هەڵیدەگێڕیتەوە، دڵەکانمان بەرەو ئارەزووی گوێڕایەڵی خۆت ئاراستە بکە و لەسەری جێگیری بکە" دەتوانن ئەمەشی بۆ زیاد بکەن "إِلَى مَا تُحِبُّ وَتَرْضَى لاسِيَّمَا إِلَى الإِخْلاَصِ - بەرە و ئەوکارانەی پێت خۆشە و لێی ڕازیت وە بەتایبەتی بەرە و ئیخلاس" "إِلَى الإِيمَانِ الْكَامِلِ وَالْيَقِينِ الأَتَمِّ - بەرە و ئیمانی کامڵ و یەقینی تەواوەتی" "إِلَى الحِلْمِ وَالأَنَاتِ - بەرەو ڕەفتار نەرمی و کار دانایی "الْحِلْمْ"".

بەڵێ، پێویستە هێندەی لە توانادایە بەندایەتیت لە بەرامبەر ئەوەوە نیشان بدەیت، پاشان بڵێیت "نەمتوانی ئەوەی پێویستە بیڵێم، نەمتوانی، لە دەستم نەهات... لوتفی بێ پایانی پەروەردگارم لە کوێ و شوکرانەبژێریی تەواو لە کوێ!" ئەوەی لەسەر ئێمەیە ئەوەیە ئەم وشانە و هەرچییەك داخوازی وتنی ئەم وشانەیە، دەرببڕین و بخەینە مەیدان.

---

١. الترمذي، القدر ٧، الدعوات ٨٩، ١٢٤؛ إبن ماجة، الدعاء ٢.

٢. إبن ماجة، المقدمة ١٣؛ أحمد بن حنبل، المسند ١٨٢/٤؛ النسائي، السنن الكبرى ٤١٤/٤.

## فاتیحە جوانترین دوعایە

کاتێك کە دوعا دەخوێنم، بە پشت بەستن بە فەرموودەیەکی پەیامبەرمان سورەتی فاتیحە دەخوێنم، پاشان ئەم دوعایە دەخوێنم ''خوایەگیان، ئەمە فاتیحەی سورەی شیفایە. تۆش شافیت، هەر تۆیت کە شیفا دەبەخشیت، جگە لە تۆ هیچ کەس نییە شیفابەخش بێت و جگە لە شیفای تۆش شیفایەك لە ئارادا نییە. تیماری ئەم دەردەم بکە و شیفایەکم پێ ببەخشە کە هیچ شوێنەوارێك لە نەخۆشییەکەم بەجێ نەمێنێت.''

بەڵێ جوانترین نزاو پاڕانەوە سورەتی فاتیحەیە. بە دڵێکی پاك و بە ئیخلاسەوە بەسەر هەر نەخۆشییەکدا بخوێنرێت بە ویستی خوا دەبێتە شیفا بۆی. لە بنەڕەتدا یەکێك لە ناوەکانی فاتیحەش "شافي"یە ئەمە جگە لەوەی کە بیست ناوی دیکەی هەیە. لەوانەش بۆ نموونە: "سورة الصلاة" چونکە لە هەموو نوێژێکدا دەخوێنرێت پێی دەوترێت "وافیە" و "کافیە" چونکە بە تەنها خۆی بۆ هەموو شتێك بەسە. بە "أم الكتاب" و "أساس" ناو دەبرێت چونکە بنەما و پوختەی هەموو سورەتەکانە.

ئێوەش بۆ هەموو کێشە و نەخۆشی و چەرمەسەرییەکتان دەتوانن فاتیحە بخوێنن و بپاڕێنەوە و بڵێن ''پاروەردگارا، ئەمە ئەو سورەتەیە کە "کافي"یە و بۆ هەموو شتێك بەسە. بەمۆڵەت و یارمەتی تۆ دەتوانێت بەسەر هەموو دەردێکدا زاڵ ببێت. بە خاتری گەورەیی ئەم سورەتە لە کێشە و دەردەسەرییەکانمدا یارمەتیدەرم بە!''

## یادی خوا و دوعاکردن

دۆستانی حەق زۆر گرنگی بە ئەوراد و ئەزکار لە "قورئان خوێندن و

دوعاکردن و یادی خوا" دەدەن. ئامۆژگاریان کردووین کە ڕۆژانە خوێندنی بەشێك لە قورئان و ئەنجامدانی هەندێك دوعای جیاواز لە ڕوانگەی پەیوەندی نێوان ئێمە و خواوە زۆر گرنگە. هەمیشە وتویانە و دەڵێن کە پێویستە هەر تاکێك بەگوێرەی توانای خۆی کۆمەڵێك شت دیاری بکات و ڕۆژانە بیانخوێنێت.

لە کەسێکی نزیکی مامۆستا "بەدیعوززەمان"ەوە چەند جار گوێم لێ بووە کە مامۆستا "مجموعة الاحزاب"ی لە پانزە ڕۆژدا خەتم کردووە. ئەو کتێبە سێ بەرگە. واتای ئەوەیە هەر پێنج ڕۆژجارێك بەرگێکی تەواوکردووە، بەڵێ، سەرباری ئەو هەموو کتێب دانان و پێداچوونەوە .و ڕاستکردنەوە و دیدارانەی لەگەڵ قوتابییەکانیدا و سەرباری مەرجی سەختی ژیان و بەندیخانە و چاودێریی ورد و ئەو دەستبەسەرکردن و دەربەدەرکردنانەی بەسەریدا هاتوون کەچی هەرگیز لە ئەوراد و ئەزکارەکانیدا کەمتەرخەمی نەنواندووە.

هەندێك دەڵێن ''نابێت لە دوعاکردندا زیادەڕەوی بکرێت و داوای شتی زۆر بکرێت'' و لەم جۆرە قسانە. وا دەزانم سەرچاوەی ئەم تێگەیشتنە، بەهۆی هەڵەی لێکدانەوەی ئەو قسانەوە هاتبێتە مەیدان کە عوبادەی کوڕی صامت لە وەسیەتەکەیدا بۆ کوڕەکەی کردویەتی.کوڕەکەی ئەو کاتێك دوعای دەکرد زۆر دەچووە وردەکارییەوە، وەك ئەو جۆرە دوعایانەی هەندێکمان دەیکەین و دەڵێین ''خوایە گیان بەهەشت و باخێکم پێ بدە کە لە نێویدا کۆشکێك هەبێت و لە تەنیشت کۆشکەکەوە ڕوبارێکی سازگار تێپەڕێت و ... هتد.''، بەم هۆیەوە حەزرەتی عوبادە پێی وت ''کوڕم، من لە پێغەمبەری خواوە کۆمەڵێك وشەم بیستووە کە ڕێگری دەکات لە زیادەڕۆیی لە دوعادا.'' ئەو زیادەڕۆیی لە دوعادا لە خۆ خەریککردن بە وردەکاریی چۆنێتی بابەتەکاندا دەبینییەوە. وەگەرنا لە کاتێکدا جەنابی حەق

دەفەرموێت "ئەی باوەڕدارینە، زۆر زیکرو یادی خوابکەن"[١] ئەوا مرۆڤ گەر لە بەیانییەوە تا ئێوارە بێ وەستان "سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ سُبْحَانَ اللهِ الْعَظِيمِ" دووبارە بکاتەوە هێشتا حەقی دوعاکەی نەداوە. سەروەرمان ئامۆژگاریمان دەکات کە بەیانی و ئێوارە سەد جار ئەم دوعایە بخوێنین. ئوم سەلەمەی دایکمان ئەوە بوو دەنکە فاسۆلیا یاخود بەردی لە لای خۆیەوە دادەنا و بە ژماردنیان هەموو ڕۆژێك سەد جار ئەم زیکرەی دووبارە دەکردەوە.

کەسانێك کە یەکتر دەناسن و لە بازنەیەکدا پێکەوەن دەتوانن لە نێو خۆیاندا بە دەستەجەمعی دوعا بخوێنن. بۆ نمونە دوعای "الجوشن الكبير" دەکرێت لە نێو چەند کەسدا دابەشبکرێت و بخوێنرێت. پاش دابەشکردن ئیدی خوێندنی هەر بەشێك لە لایەن ئەو کەسەی پێی سپێردراوە کارێکی پێویست دەبێت. واتە ئەو کەسەی کە دەڵێت "من هەر ڕۆژێك ئەوەندە یاد و زیکری خوا دەکەم" ئەوە بەرپرسیاریەتییەکی گرتووەتە ئەستۆ و. دەبێت ئەو بەرپرسیاریەتییە بەتەواوی بە جێبهێنێت. گەر کەسێك ویستی دەتوانێت لە بەشەکەی خۆی زیاتر بخوێنێت و تەنانەت "الجوشن الكبير" تەواو بکات، بەڵام کاتێك بەیەکەوە دوعایەك دەخوێنرێت ئەوە لە دەفتەری کردەوەی هەمووواندا پاداشتی تەواوی خوێندنەکە دەنوسرێت، چونکە کە کەسێتی مەعنەویی ڕاستەقینە دروست بوو وەك ئەوە دەبێت هەر کەس هێندەی هەمووان ئەو دوعایەی خوێندبێت.

لەم بوارەدا پێم وایە بە شێوەیەکی تایبەتی دوعای "مجموعة الاحزاب" زۆر سودبەخش دەبێت. چونکە کتێبێکی زۆر فراوانە و بۆ بابەتی جیا جیا دوعای زۆرێك لە پیاوچاکانی لە خۆ گرتووە. کاتێك حەزرەتی "گوموش خانەوی" کۆی کردوونەتەوە وەك ئەمڕۆ کە دەرفەتی هەڵاوێر و پشتڕاست کردنەوە بەردەست

---

١. الأحزاب: ٤١.

نەبووە. هەر ئەوە چۆتە بەردەستی مامۆستاوە و ئەویش تا ڕادەیەك ئەو جێیانەی خوێندونیەتیەوە ڕاستکردنەوەی بۆ کردوون. خۆزگە یەك دوو کەسی بەتوانا کاریان لەسەر دەکرد و دەبوونە هۆکاری ئەوەی کتێبەکە تا ئەو ڕادەی دەکرێت دوور لە هەڵە و پەڵە بێتە چاپکردن.

پاش چاپکردن باوەڕدارانی بە دوعا تامەزرۆ لە نێوان خۆیاندا بەشی دەکەن و بەرنامەیەکی وەها دادەڕێژن کە هەر کەس لە کاتێکی جیاوازدا بتوانێت بەشێك لە دوعاکە بخوێنێت. بۆ نموونە ئەو کەسەی بە درێژایی مانگێك ئەم بەشە دەخوێنێت، بۆ مانگی دووەم دەچێتە شوێنی هاوڕێکەی دیکەی، ئەویش دەچێتە شوێنی هاوڕێی سێیەم و ئەویش جێی چوارەم و بەم شێوەیە. بەم شێوەیە هەمووان بەشە جیاوازەکانی "مجموعة الاحزاب" دەخوێننەوە. چونکە کاتێك مرۆڤ دوعایەکی نوێ دەخوێنێت، هەیەجان و خرۆشانێکی نوێی لا دروست دەبێت. بۆ نموونە کەسێك کە تەنانەت دوعا ناخ هەژێنەکەی شاهی گەیلانی بۆ ماوەی سی ڕۆژ لە سەر یەك دەخوێنێتەوە ئەگەری هەیە بە تێپەڕینی کات وەك یەکەم ڕۆژ چێژی لێ نەبات و هەژان و خرۆشان لە ناخیدا نەیەتە مەیدان. بەڵام ئەگەر مانگی دووەم بڕواتە سەر دوعایەکی دیکەو بۆ ماوەیەك دوعا یەکەمینەکە نەخوێنێت تا ئەوەی ئولفەتەکەی دەڕوات و پاش ماوەیەك بگەڕێتەوە سەر ئەو دوعایە ئەوا دەتوانێت وەك یەکەم جار چێژی لێ ببات و هەستی پێی بورووژێت. نازانم بۆ من تەمەن بەرپا دەبێت یاخود نا. بەڵام ئارەزوومە منیش ئەوە لەگەڵ چەند هاوڕێیەکمدا دابەش بکەم و بیخوێنم، زۆر ئاواتمە ئەمەم بە نسیب بێت.

هەندێك جار ئەوە بەبیرمدا دێت کە لە بنەڕەتدا دەبێت بچیتە گۆشەیەکەوە و بێ ئاگاداری کەس دوعا بخوێنیت. بەڵام ئەوەی داخۆ لە بیرێکی لەم شێوەیەدا خەیاڵێکی خۆپەرستانەی هەیە کە بڵێیت "منیش لە گۆشەیەکدا دەتوانم

دوعا بکەم و پێویستم بە کەس نییە“ دڵنیا نیم، نازانم ئەگەر هەبێت ئەوە زۆر مەترسیدارە. لەولاشەوە دەکرێت یەکێك بڵێت ”من دەتوانم گۆشەنشینانە دوعا بکەم بەڵام لە نێو هاوڕێیانمدا دوعا دەخوێنم و ئومێدم وەهایە کە بە هۆی ئەوەی دوعاکانم تێکەڵ بە دوعاکانی ئەوان کردووە، لە قەبوڵ بوون نزیکتر ببنەوە.“ بە تێڕوانینێکی لەم شێوەیەوە هیچ نەبێت بەشێك لە دوعاکانی، نیوەی یاخود چارەکێکی لەگەڵ هاوڕێیاندا دەخوێنێت. بەڵام لەم دووەمەشدا ڕەنگە هەستی نمایش و خۆ دەرخستن توشی کەسەکە ببێت. ئەمانە هەموو ترسناکن دوعا دەبێت هێندە دڵسۆزانە ئەنجام بدرێت کە هیچ تێبینییەکی تری تێکەڵ نەبێت، تا ئەو ڕادەیەی کە لە هەر لایەکەوە لێی بڕوانرێت، لە ڕاست و لە چەپییەوە لە سەر و ژێریەوە، هەر وەك بلورێکی پاك و ڕوون تەنها تەجەللیاتی زاتی ئولوهییەت ببینرێت. هەندێکجاری تر دەکرێت کۆمەڵی مزگەوتێك لە نێو خۆیاندا بڵێن ”وەرن با وەك لە سەلەفی سالحینەوە ڕیوایەت دەکرێت، ئەو کۆمەڵە دوعایە بخوێنین. بۆ نموونە شەوێك دانیشن نۆزدە جار سورەتی فەتح بخوێنن، گەرچی دوو سێ کاژێریشی پێ بچێت.“ بەڵام ئەوانەی بەشدار دەبن دەبێت بە تەواوی دڵەوە بەشداریی بکەن. هێندە تامەزرۆ بن کە بۆ ئەم کارە جێی نەرم و نانی گەرم لە بیر بکەن... کەسێك کە نوێژی حاجەت ئەنجام دەدات، دوعای "جوشن الکبیر" و ئەورادی قودسیە و سەکینە دەخوێنێت، گەر لەگەڵ هاوڕێکانیدا پانزە دەقیقە خوێندنی، دواتر دەبێت بڕواتە جێیەك کە کەس نەیبینێت و هیچ بیرێکی لابەلا نەتوانێت ڕووی تێ بکات و لەوێش نیو کاژێر بەردەوام بێت لە دوعا خوێندنەکەی.

بەڵی، شەیتان لە هەردوو بارەکەدا دەتوانێت دزە بکاتە نێو ماڵی دڵی موسوڵمانەوە، چ ئەو کاتەی لە تەنهاییدا کەسەکە وا بیر دەکاتەوە کە "بڕوانە لە هاوڕێیانم جیا بوومەوە و خۆم بۆ خۆم بێ ئەوەی کەس بمبینێت دوعا دەخوێنم بەم

شێوەیە دوعاکەم زیاتر بە ئیخلاسەوە دەبێت." چ ئەو کاتەی لە نێو خەڵکدایە و خەیاڵی بۆ ئەوە دەڕوات کە "با خەڵك بمبینن و بمناسن". حەزرەتی بەدیعوززەمان بە پشتبەستن بە وتەی ئیمامی غەزالی بە دەنگی بەرز دوعا خوێندن و بە گوێی خەڵکدا دانی بە باش زانیوە، دەڵێت "من پێشتر بە دەنگی بەرز زیکرم دەخوێند بەڵام ئەندێشەم بوو کە داخۆ ڕیا تێکەڵ ئەم کارە دەبێت یاخود نا، پاشان دیتم کە ئیمامی غەزالی فەرموویەتی: گەر بۆ وریاکرنەوەی ئەوانی دی و هاندانیان بێت بۆ چاکە و زیکر کردن ئەوە کێشەیەکی نییە"[1] بەڵام سەرباری هەموو ئەمانە دڵی ئێمە وەك دڵی مامۆستا نییە.

تا ئەو ڕۆژەی دەچینە ئەو دیو دەرگای بەهەشتەوە ئەگەری هەیە هەموو شتێك تێکەڵ بە دڵمان ببێت. ئێمە لە جێی ئەوەی لە کونەکانی دەشت و دەر و بیاباندا بەشوێن مار و دوپشکدا بگەڕێین، دەبێت چرای دەستمان ڕوو بکەینە دڵمان و لە هەموو حاڵ و بارێکدا زۆر هۆشیار بین.

## ئەی بەدیهێنەری بەخشندە و پەروەردگاری میهرەبانم!

مامۆستا بەدیعوززەمان لە بریسکەی حەڤدەهەمدا دەڵێت "ئەی بەدیهێنەری بەخشندە و پەروەردگاری میهرەبان و گەورەم! ئەم بەندە و بەدی هێنراوەی خۆت کە ناوی سەعیدە کە هەم بێ گوێ، هەم کۆڵەوار و بێ دەسەڵات، هەم بێ ئاگا، هەم نەزان، هەم بیمار، هەم زەلیل، هەم خراپکار، هەم بەساڵاچوو، هەم بەدبەخت و هەم لەگەورەی خۆی هەڵهاتوو... وە دوای چل ساڵی هەڵهاتن، گەڕاوەتەوە و هانا و پەنای بۆ میهرەبانی تۆ هێناوە و دان بە هەڵە و تاوانەکانیدا دەنێت و

---

١. بەدیعوززەمان، پاشبەندی قەستەمۆنی.

گرفتاری چەندین وەهم و نەخۆشی بووە و لێت دەپارێتەوە...“[١]

وەك ئاشکرایە پێغەمبەران مەعصوم و مەئصونن، واتە هەم ئەمان لە گوناهـ دوورن و گوناهـ ئەنجام نادەن، هەم خوداوەندیش لە بەرامبەر هەڵە و گوناهـ و تاوانەکان دەیانپارێزێت. کەسانی وەك بەدیعوززەمانیش، گەرچی مەعصوم نەبن بەڵام "مەئصون"ن، واتە گەرچی بەری نەبن لە گوناهـ بەڵام لە ژێر چەتری پارێزگاری خوادان و خوداوەند لە گوناهـ دەیانپارێزێت.

مەگەر ئەو مامۆستا بەرێزە چ گوناهێکی ئەنجامداوە کاتێك ئەو شتانەی سەرەوەی دەربڕیوە. حاشا، پاڵنەری ئەم وشانە گوناهێکی ئەنجامدابێت. بیرکردنەوەی لەو شێوەیە دەبێتە گومانی خراپ. نەخێر ئەو وەك داخوازییەکی ئەرك و ئامانجەکەی لە ئاستی مەزنیی ڕۆحی خۆیدا وابیردەکاتەوە کە خزمەتەکەی بەو شێوەیە ئەنجامنەداوە کە دەبوو ئەنجامی بدات، ئەوەی ئەنجامی داوە بە کەمی دەزانێت، کزۆڵانە بە ترس و ئەندێشەی ناکامڵی بەندایەتییەکەیەوە -لە ئاستی خۆیدا- بۆ چاك بوونی حاڵی خۆی ڕاز و نیازیەتی.

سا خۆزگە، دڵەکانی ئێمەش بەردەوام بەم هەستانە بڕازانایەتەوە و ئەم وشانەش ببوونایەتە ویردی سەر زوبانی ئێمە و بۆ حاڵی خۆمانمان بووتنایەتەوە، بەوە ویژدانمان ڕەوان بکردایە. بە وتنی ”ئەوە ئێستا دەڕۆمە نێو گۆڕەکەمەوە، پێچراوم لە کفنەکەم، خزم و دۆست و کەسەکانم جێیانهێشتم، منیش لەم تەنهاییەدا چاوەڕێی لێبوردەیی و ڕەحمەتی تۆم.“

باری ئەو مەرگە بچێژن کە هەر ساتێك ئەگەری هەیە بەسەر هەر مرۆڤێکدا بێت، وە بەردەوام بین و بڵێین ”ئەگەر بە کەماڵی میهرەبانی خۆت منیش قەبوڵ

---

١. بەدیعوززەمان، بریسکەکان (بریسکەی حەقدەهەم).

بفەرموویت و لێخۆشبوون بە نسیبم بکەیت و ڕەحمەتت ببارێنیت بە سەرمدا، ئەوە کارێکە شایان بە خۆت و هەر لە خۆت دەوەشێتەوە، چونکە تۆ "أرحم الراحمین-میهرەبانترینی میهرەبانەکانی"".

ئەگەر قەبوڵم نەفەرموویت، ئیدی چ دەرگایەکی تر هەیە پەنای بۆ بەرم؟ لە ئاستانەکەی تۆ بەدەر چ بەرماڵێك بۆ من هەیە؟ جگە لە تۆ پەروەردگارێکی تر کە نییە تا پەنا بۆ دەرگانەی ببرێت. بێ لە تۆ پەرستراوێکی بە حەق نییە تا ڕووی تێبکرێت. بەڵێ لەو دیو گوناهەکانمانەوە ڕەحمەتی پەروەردگاری میهرەبان چاوەڕێمانە . گەر ئەو بیەوێت بە خاتری شتانێکی زۆر بچوك لێمان خۆشدەبێت. هەر وەك بەدیعوززەمان و ئیمامی غەزالی و موحاسیبیش باسیان لێوەکردووە مرۆڤ دەبێت تا لە ژیاندایە لە ترسان بەردەوام دڵی لە لەرزیندا بێت، بەڵام ئەو دەمەی مەرگ هەوری بێچارەیی بەسەر ئاسمانی بوونیدا دەهێنێت دەست بە ئومێد و ڕەجاوە بگرێت و بڵێت "پەروەردگارا، من هیچ سەرمایەیەك شك نابەم، تەنها بە "لا اله الا الله، محمد رسول الله"وە بەرەو لای تۆ دێم". لە سەرەوەختی سەکەراتی مەرگدا پەنا بۆ ڕەجا بەرێت و لێوانلێو ببێت لە هەستی "چیدی من شتێکم لەدەست نایەت، تەنیا پەناگەم ڕەحمەتی تۆیە، خۆشەویستەکەی"رحمة للعالمین"یش (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمَ) شەفاعەتکارمە". بەڵام هێندە هەیە دەست گەشتن بە حاڵێکی لەمشێوەیە لەو دەقیقە سەختانەدا پەیوەستە بەوەی شتەکان لە جێی خۆیاندا دابنێین و پاکیزە بژێیت و پاکیزە بمێنیتەوە.

مرۆڤ لە ئەنجامدانی کاری چاکەدا، لە پاش بەندایەتیدا، لە بابەتی بەستنەوەی تەواوی کارەکانیدا بە ئیخلاسەوە هەرگیز نابێت ڕەزامەند و قەناعەتکار بێت، لە بەندایەتیدا بەوپەڕی ویستەوە تا ڕادەی مەرگ دەبێت داخوای باشتر و جوانتر بێت. وەگەرنا بەجۆرێکی دی مامەڵەکردن هیممەت نزمی دەبێت.

بە تایبەت ئەوانەی خۆیان بە قوتابی قورئان داناوە، گەر ببنە وەلی و بفڕن دەبێت هێشتا بڵێن "ئەم ماستە موویەکی تێدایە" . من دەبێت دووبارە چاوێك بە نیخلاسەکەمدا بخشێنمەوە، پەڕەکانی دڵم یەك یەك هەڵبدەمەوە و تاووتوێیان بکەم کە داخۆ بێجگە لە ناو و یادی ئەو باس و خواسێکی تری تێدایە؟ شتێك هەیە بێ لە ئەو کە بیری لێبکەمەوە؟ وە دەبێت ماسیوا بسڕێتەوە و تەنها بە شوێن ڕەزامەندیی ئەوەوە بێت.

پەرومردگار بە شێوەیەك لە شێوەکان ئێمەی تا ئاستێك هێناوە، نووری ئیمانی لە دڵماندا هەڵکردووە و دەرفەتی خزمەتی لە مەیدانی بەرەو ئیمان هێنانی ئەوانی دیدا پێداوین. ئەمە یەکەم لوتفە، یەکەم بەهرەوەرییە، یەکەم بەرهەمە. پێویستە ئەمە وەك سەرمایەیەك پەرەی پێ بدرێت و بنرخێنرێت. ئیرادەی ئێمە لێرەدا تەنیا هۆیەکی سادەیە و هیچی تر.

ئەوەی لوتفی ئەم قۆناغ و جێیەی پێ فەرموویـن ئەوە. "بە عەقڵی خۆم پێی گەیشتم، ئەم سەرکەوتنانە ئازایەتی خۆمن" ئەم قسانە دەربڕینی فیرعەونەکانن. "پەروەردگارا، داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەم، تۆ پێتبەخشیوم، هەرچی هەمە چاکەی تۆیە.. گەر دەستگیرۆیی تۆ نەبوایە، ئێمە نەماندەتوانی لێرەدا بووەستین، گەر تۆ بۆ ئێمەت نەڕوانیایە، هیچ نیگایەك بەرەو ئێمە وەرنەدەچەرخا. دەستمان بگرە خودایە! دەستمان بگرە کە بێ تۆ مەحاڵە بتوانین ئەم ڕێیە ببڕین". بەڵێ، ئەم پاڕانەوانە دەنگ و سەدای دەروونە بە ئیمان خەملیوەکانە.

ئەوانەی لوتفەکانی سەر سەریان و سەرکەوتنەکانی نێو دەستیان دەبەستنەوە بە توانایی و ئازایەتی و لێبڕاوەیی خۆیانەوە، ناتوانن لە پلەکانەی مەعنەوییەتدا بچنە پێشەوە. ئەو کاتەی کارەکان بە خودا دەسپێررێن خوداوەند پەردەی کەشف لەسەر ڕۆحەکان لادەدات. وا دەزانم هەر کەسێك لە ڕوانگەی ژیانی خۆیەوە بۆ

بابەتەکە بڕوانێت، دەبینێت بەرەو لایەك کێش کراوە، بانگ کراوە، بگرە بە زۆر بەرەو ڕێیەکی چاکە براوە. زۆر کەسی لە ئێمە زیرەکتر و عەقڵ بە هەموو شتێك لە ئێمە شکاوتر هەن کە لە دەرەوەی بازنەی قورئاندا جێ ماون. ئێمە ناتوانین بڵێین وەك مامۆستا بەدیعوززەمان بە دڵ دەستمان داوەتە ئەم کارە و بە هێزێکی ڕۆحی نەبڕاوەوە، هەموو گومانەکانمان وەلاناوە و خزمەتی ئوممەتەکەمان دەکەین، ئێمە کە ناتوانین بڵێین بوینەتە قوتابیانێکی زۆر دڵسۆزی ئەو پیاوە مەزنە، بەڵام گەر دەرفەتی ئەوەشمان پێدرابێت لە سوچێك، لە گۆشەیەکی کارێکی لەو شێوەیە بنەوین، ئەوە بەخششێکی مەزنی ئیلاهیمان پێ بەخشراوە لە ڕوانگەی ژیانی دوارۆژمانەوە. وە گەرنا ئێمە بە جارێ بە تەپوتۆزی دونیا ئالودە دەبووین و بەرەو تیاچوون ملمان دەنا. نە ئازایەتی خۆمانە، نە هێزی توانامان، بەڵکو تەنها لوتف و بەخششی ئەوە. خەڵکی ئەرزڕوم قسەیەکیان هەیە دەڵێن "سەر بەرەوخوار فرێی بدە نێو ئاو و لە سەرەوە چاودێری بکە، گەر سەری دەرهێنایەوە بە سەریدا بکێشە." ئێمەش دەبێت هەستی (گەڕانەوەی نیعمەتەکان بۆ خودی خۆمان) سەر بەرەوخوار فڕێ بدەینە نێو ئاو و لە سەرەوە چاودێری بکەین. گەر خوا نە خواستە سەریشی دەرهێنایەوە، بکێشین بە سەریدا و دوبارە نوقمی بکەینەوە و هەموو شتێك بگێڕینەوە بۆ خودا.

# ئەوراد و ئەزكار

## فرە یادكردنی خوا

پێویستە یادی خوا فرە بكەین. گەر لە ئاستێكدا بین كە بە یەكجار هەست بە هەزار تەجەللیاتی ئیلاهی بكەین، دەبێت لە كۆششی ئەوەدابین بە جارێك ملیۆنێك تەجەللی بۆمان نومایان بێت و وامان لێبێت لە نوكی پەنجەمانەوە هەتا دوورترین خانەی لەشمان هەستی پێبكات. خوا لە ڕوخسارپەرستی و لە دیمەن و شێوەی دەرەكیدا مانەوە ڕزگارمان بكات و بمانگەیەنێت بە واتای ڕاستەقینەی شتەكان.

كە دەڵێم "لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ" هێندە حەزدەكەم لەو ساتەدا بە یەكجاری تامی تەواوی ناوە پیرۆزەكانی خوا بكەم و سەرجەمی تەجەللیاتەكانی هەست پێبكەم و ناخمیان لێ پڕبكەم. بەڵام بە داخەوە، سەرباری ئەو هەموو لوتفە ئیلاهییەی بە سەرمانەوەیە، ئێمە هێشتاش سەرقاڵی ڕووكەش و گیرۆدەی تونێكڵ و دیمەنی دەرەكین، پێویستە زۆر لە خۆمان بكەین تا لە ئاستی گەورەیی ئەودا یادی بكەین نەك بە پێوانەی بچوكی خۆمان. سی ساڵ، چل ساڵ بێ سروەتن دەبێت تێبكۆشین. دەبێت لە چوارچێوەی فراوانی خۆیاندا لە تەجەللی ئیلاهی تێبگەین، نەك لە دونیای تەنگەلانی خۆماندا.

## ئیسمی ئەعزەم

ئیمامی غەزالی ناوە پیرۆزەکانی "فرد، حی، قیوم، حکم، عدل، قدوس" بە ئیسمی ئەعزەم (ناوە هەرە مەزنەکە) داناوە و دەربارەیان نامیلکەیەکی نوسیوە و فەرموویەتی کە دەبنە قەڵغان و شیفا بەخش بۆ بەڵاو نەخۆشییە جۆراوجۆرەکان. حەزرەتی گومشخانەویش دوعاکانی ئەوی لە "مجموعة الاحزاب" دا داناوە. بۆ نموونە فەرموویەتی کە خوێندنی "فَرْدٌ حَيٌّ قَيُّومٌ حَكَمٌ عَدْلٌ قُدُّوسٌ" پاش دە جار "اَللّٰهُ أَكْبَرُ" و "بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ" دەبێتە هۆکاری پاراستن لە شەڕی شەڕخوازان و بەدەستهێنانی سەرکەوتن. حەزرەتی بەدیعوززەمانیش لە سەرەتای دوعاکانیدا وەك سەکینە و تەحمیدییە، ئەم ناوانەی وتووەتەوە.

وەك چۆن "نوێژی ناوین- صلاة الوسطی" لە نێو پێنج فەرزەکەدا شاراوەیە "وقت الاجابة -کاتی وەڵام دانەوەی دوعاکان" لە ڕۆژی جومعەدا و وەلییەکان لە نێو مرۆڤەکاندا و شەوی قەدر لە نێو ڕەمەزاندا و ڕەزامەندیی خوایی لە نێو پەرستش و بەندایەتییەکاندا و قیامەت لە سەرگوزەشتەی ژیانی گەردوون و مەرگ لە دوتوێی ژیانی تاکدا بە پەنهانی و تەلْسماوی هێڵراونەتەوە، هەروەها لە نێو ئەسمای حوسنادا ئیسمی ئەعزەم بە شاراوەیی هێڵراوەتەوە، جا ئەم شاراوەییە و ئەم تەلْسمە هۆکاری ئەوە دەبێت کە باوەڕداران بەردەوام وشیار و لێکۆڵەر بن و لە پەرستش و بەندایەتیدا بن. هەر لەبەر ئەمەشە دیاری نەکراوە کامە ئیسمی ئەعزەمە و زۆر ناوی جیاواز وەك ئیسمی ئەعزەم باسیان لێکراوە.

ئەو ناوانەی وەك ئیسمی ئەعزەم دیاریکراون، نزیك بە هەموویان لە مەئثوراتدا (ئەو دوعایانەی سەرچاوەکەیان قورئان و سوننەتە) ئاماژەیان پێدراوە. کاتی خۆی هەوڵمدا تەواوی ئەو ناوانە لە "مجموعة الأدعية -کۆمەڵی نزاکان" دابنێم. تەنانەت بەو ئەندێشەوە کە ئەمانە هەریەك هەڵگری نهێنییەکن ئەگەر دوو وشە تەنها

ڕیوایەتەکانیشیان جیاواز بوایە یاخود بە دوو دەربڕینی لە یەك نزیکیشەوە هاتبوونایە، هەوڵم دەدا وەك نرخاندنی وشەی سەروەرمان هیچیان نەخەمە کەنار و هەموویان دابنێم.

وەك لە کتێبی "کۆمەڵی نزاکان"یشدا بەرچاو دەکەوێت بێجگە لە ناوەکانی "فَرْدٌ حَيٌّ قَيُّومٌ حَكَمٌ عَدْلٌ قُدُوسٌ" کۆمەڵێك ناوی تر وەك "رَحْمانٍ، رَحِيمٍ، حَنَّان، مَنّان، مَلِك، سَلَام، مُؤمِن، مُهَيمِن"یش وەك ئیسمی ئەعزەم ڕیوایەت کراون.

هەروەها هەندێك ڕیوایەت زیاد لە وشەیەك ئاماژەیان بە ئایەتێك یاخود گورزە وشەیەك کردووە وەك ئیسمی ئەعزەم، بۆ نموونە "بَدِيعُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ"[1] یاخود "لا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ"[2] یا خود "آية الكرسى".[3]

جا داخۆ ئەمانە ئەو مەیدانەن کە ئیسمی ئەعزەم تێیدا تەجەللی دەکات؟ یاخود ئیسمی ئەعزەم تەجەللی تێدا کردوون؟ یاخود ئەو ناوە پیرۆزانەی خوا کە لە ئایەتەکاندا هاتوون ئیسمی ئەعزەمن؟ ئەوە بابەتێکە تەنها خوای باڵادەست شارەزایی دەربارەی هەیە.

لە بنەڕەتدا ئێمە تەواوی ناوە پیرۆزەکانی خوا نازانین، ئەوەتا سەروەرمان لەو نزایەیدا کە فێرمان دەکات لە کاتی خەمباری بە هۆی دەرد و چەرمەسەرییەکانەوە بیخوێنین دەفەرموێت "ئیلاهی من بەندەی تۆم و نەوەی بەندەی تۆم، نێوچەوانم لە ژێر دەستی تۆیە؟! ئەوەی لەسەرم بڕیاردەدەیت ڕوودەدات و ئەوەی بۆم دیاری دەکەی دادپەروەرانەیە. سا داوات لێدەکەم بە هەر ناوێك کە لە کتێبەکەتدا ئاماژەت پێکردووە یاخود فێری هەر دروستکراوێکی خۆتت کردووە، یاخود لە

---

١. الترمذي، الدعوات ٩٩؛ أبو داود، وتر ٢٣؛ إبن ماجة، دعاء ٩.

٢. الحاكم، المستدرك ٦٨٥/١. بڕوانە ئەم ئایەتە: الأنبياء، ٨٧.

٣. مسلم، صلاة المسافرين ٢٥٨.

زاتی غەیبدا لای خۆت هێشتوتەتەوە و فێری کەست نەکردووە، قورئان بکەیتە بەهاری دڵم و نوری چاو و لابەری خەم و دڵتەنگییەکانم"[١].

کەواتە هەندێك ناوی خوا هەیە تەنها بەندەیەك دەیانزانێت، یاخود تەنها لە کتێبێکدا ئاماژەیان پێکراوە، یان لای تەنها بەندەیەکی چاکەکار، یاخود جنۆکە یا فریشتەیەك درکێنراوە، یاخود لە مەقامی ئولوهییەتدا بووەتە مەزهەری ئیستیئسار (لە لای کەس نەدرکێنراون و تایبەت بە زانستی ئیلاهی ماونەتەوە)

لە لایەکی دیکەوە، کاتێك توشی نارەحەتییەك دەبن و هەست بە موحتاجی و ئاتاجی خۆتان دەکەن، ئەودەم بە هەر دەربڕینێك لە خوا بپارێنەوە و ڕوو لە دەرگانەی بکەن، ئەوەی دەیڵێن هەر شتێك بێت بە مەرجێك دەنگی ناخ و هاواری گیانتان بێت، ئەوا ئەگەری هەیە بێ ئەوەی بە خۆتان بزانن یەکێك لەو ناوە تەڵیسماویانە یاخود یەکێك لەو ناوانەی بە ئیسمی ئەعزەم قەبوڵ کراون، بەسەر زاردا بهێنن. بۆ نموونە دەڵێن "من ئومێدبڕاو و هەژارم، تۆش ئەو کەسەیت کە دەستی هەژار و بێنەوایان دەگرێت." ئێمە ناوێك نازانین لە نێو ناوەکانی خوا کە بەم شێوەیە بێت، بەڵام ڕەنگە ئەم پەسنەش لە نێو ناوەکانی پەروەردگارماندا هەبێت. وەك چۆن کاتێك دەڵێین "من لێقەوماو و موحتاجم، تۆش ئەو کەسەی کە موحتاجیی لێقەوماوان ناهێڵێت" دەتوانین بە واتای ئەم دوعایەی (جوشن الکبیر) دایبنێین کە دەڵێت "یاکاشف الغم، یافارج الهم". ئەگەر دڵسۆزانە و لە ناخەوە هاوار بکەن جەنابی حەق گرێی زوبانتان دەکاتەوە و بێ ئەوەی بە خۆتان بزانن ئیسمی ئەعزەم لە لێوتانەوە دەپشکوێنێ ت. بەڵام گەر زوبانتان نوێنەرایەتی لە ڕۆحتان نەکات، تەنانەت گەر ئیسمی ئەعزەمیش بڵێن، دیوێکی کارەکەتان بە ناتەواوی دەمێنێتەوە.

---

١. أحمد بن حنبل، المسند ١/٤٥٢؛ إبن أبي شيبة، المصنف ٦/٤٠.

هەر لەبەر ئەمەشە کە دۆستانی حەق زۆر جەختیان لەسەر ئەوە کردووە کە دوعا و پاڕانەوەکان تەنها ئەوکاتەی بە ڕاستگۆیی و ئیخلاسەوە پێشکەش دەکرێن، بگەنە عەرشی ڕەحمەتی ئیلاهی و حوسنی قەبوڵ بەدەست بهێنن. ئیخلاس و ڕاستگۆیی و صیدق هەروەك ئیکسیری ئیسمی ئەعزەم کاریگەرن. بایەزیدی بەستامی لە وەڵامی ئەوانەی پرسیاری ئیسمی ئەعزەمیان لێ دەکرد دەیوت "ئێوە لەنێو ناوەکانی خوادا ئیسمی ئەسغەر "ناوی هەرە بچکۆلە"م پێ نیشان بدەن تا منیش ئیسمی ئەعزەمتان پێ نیشان بدەم." وە پاشان دەیوت "بەلای منەوە گەر شتێك هەبێت کاریگەریی ئیسمی ئەعزەم نیشان بدات بێگومان ئەوە ڕاستگۆییە. بەڕاستگۆیی و ئیخلاسەوە کام ناوە بخوێنرێت، ئەو ناوە دەبێت بە ئیسمی ئەعزەم"[١]

بەڵێ، مرۆڤ دەبێت دڵسۆزانە ڕوو لەپەروەردگاری مەزنی بنێت و ناوە پیرۆزەکانی خوا وەك پەیژەیەکی زۆر گرنگ بەکاربهێنێت بۆ نزیکبوونەوە لە سیفاتە سوبحانییەکانی. دەبێت ملکەچ بێت بۆ ئەو ڕاستییەی کە ناسینی زاتی ئولوهییەت تەنها لە ڕێی زانینی ئەسمائی ئیلاهییەوە پەی پێ دەبرێت. وە دەبێت بە تەواوی دڵ و بوونییەوە بە شوێنیان بکەوێت و وەك مرۆڤێکی دڵڕۆشن ئەم ناوانە بزانێت و بیانڵێتەوە.

## نابێت هەرزان مامەڵە بین بەرامبەر گەنجینە شاراوەکان

هەرگیز باوەڕم نەبووە و باوەڕم نییە کە هەرزان مامەڵەکان بتوانن هیچ بەدەستبهێنن. بۆ نموونە باوەڕم نییە کەسانی هەرزان مامەڵە سوودی تەواوەتیی لە شەوی قەدر وەربگرن. واتە ناکرێت ئەوان بە درێژایی ساڵێکی ڕەبەق دەست

١. بروانە: أبو نعيم، حلية الأولياء ٣٩/١٠.

لە پشت گوێ دانیشن، پاشان تەنها شەوی ٢٧ی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز زیندوو بکەنەوە و لە بەرامبەردا ببنە جێ درەوشانەوەی ئەو لوتفە ئیلاهییانەی جەنابی حەق، بەو بەندانەی دەبەخشێت کە بە شێوازێکی شایان شەوی قەدریان زیندوو کردووەتەوە. ناگونجێت بەم جۆرە بێت. هەر لەم سۆنگەیەوە ئەبو حەنیفە -کە بە بۆچوونی عاجیزانەم ئەوکەسەیە کەحەقیقەتی ئەحمەدی بە باشترین شێوە بەرجەستە کردووە - دەڵێت "پێویستە لە سەرتاپای سێ سەد و شەست و ئەوەندە شەوەکەی ساڵدا بە شوێن شەوی قەدردا بگەڕێن نەك تەنها لە چەند شەوێکی دیاری کراودا. ئێوە - کە هەر سێ سەد و شەست و ئەوەندە شەوەکەتان بەوپەڕی هەستیارییەوە زیندوو دەکەنەوە، ئەوسا خواش بەسەر دڵە ڕاستگۆ و سەمیمیەکەتاندا لوتفگەلی خۆی دەبارێنێت."[١]

سەروەری شانازیی بوونەوەر (صَلَّىٰ اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەیزانی شەوی قەدر کام شەوەیە. بەڵام ڕۆژێکیان فەرمووی "نیازمکرد بێم پێتان بڵێم شەوی قەدر چ شەوێکە، هاتمە دەرەوە، بینیم دووکەس پێکەوە چەلەحانێیان بوو، پێیانەوە سەرقاڵبووم و لەم نێوەندەدا شەوی قەدرم لەبیر برایەوە."[٢] بەم وتەیەشی لە لایەك ئاماژەی بە ڕادەی بریندار بوونی خۆیدا لە کاتی ناکۆکی و شەڕی نێوان مرۆڤەکان و لەلایەکی دیکەشەوە ئاماژەی بە حیکمەتی ئیلاهی کرد لە پەنهان مانەوەی شەوی قەدردا. جا ڕەسولی ئەکرەم (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) ڕێنوێنیمان دەکات کە لە دە شەوی کۆتایی ڕەمەزان و بە تایبەت لە شەوە تاکەکاندا بەشوێن شەوی قەدردا بگەڕێین.[٣]

---

١. إبن عبدالبر، التمهيد ٢٠٨/٢؛ النووي، شرح صحيح مسلم ٥٧/٨.

٢. البخاري، الإيمان ٣٦، فضل ليلة القدر ٤، الأدب ٤٤، (٤٩)؛ سنن الدارمي، الصوم ٥٦؛ أحمد بن حنبل، المسند ٣١٣/٥، ٣١٩.

٣. البخاري، فضل ليلة القدر ٣؛ مسلم، الصيام ٢٠٥.

ئەو وتە پڕواتایەش کە دەڵێت "هەموو شەوێك بە قەدر و هەموو کەسێك بە خضر بزانە." دەربڕینێکی کورت، بەڵام فرەڕەهەند و گشتگیرە. بەڵێ حەزرەتی خضریش لە نێو مرۆڤەکاندا شاراوەیە. ناتوانیت بزانیت داخۆ ئەو یاسرە، موستەفایە یان عەبدوڕڕەحیم. بەڵام گەر ئێوە بەرامبەر هەمووان بەڕێزەوە مامەڵە بکەن و یارمەتی هەموو خاوەن پێداویستییەك بدەن و دەستی هەرکەس پێویستی پێتانە بگرن و سینەتان بە ڕووی تەواوی مرۆڤایەتیدا بکەنەوە، ڕۆژێك دێت بە خضرێکی نێو کۆمەڵی باوەڕداران بگەن و باخچەی سینەی ئێوەش بژیەتەوە.

جا هەرەوەك چۆن جەنابی حەق بۆ ئەوەی هەموو شەوێك بە قەدر و هەموو کەسێك بە خضر ببینین و لەم بارەوە بەوپەڕی هەستیارییەوە مامەڵە بکەین و بەردەوام لە هەوڵی باڵابردنی باری مەعنەویماندا بین، ئەو دوو گەنجینەیەی بە شاراوەیی هێشتووەتەوە، هەرواش ئیسمی ئەعزەمی لە نێو ناوە پیرۆزەکانیدا بە شاراوەیی هێشتووەتەوە و لەم ڕێیەوە ئاراستەی کردووین بۆ ئەوەی هەمیشە هۆشیار و هەستیار بین. بەم جۆرەش قیبلەنومای سەرنجمانی بەرەو ناخی خۆمان ئاڕاستەکردووە و ڕێنموونی کردووین کە گرنگتر لەو دوعایەی دەیخوێنین و لەو ناوە پیرۆزەی بە شەفاعەتکاری خۆمانی دادەنێین، جا ئەو دوعایە دوعای جەوشەن بێت، یاخود دوعای جەلجەلوتیە یاخود ئەو شەش ناوەی ئیمامی غەزالی وەك ئیسمی ئەعزەم باسی لێوەکردوون کە -فرد، حی، قیوم، حکم، عدل، قدوس- بوون، یاخود هەر ناوێکی دیکە کە لە کاتی واڵاکردنی دەستەکانماندا بەرەو ئاسمان پەنایان پێ دەبەین، دەبێت بە ڕاستگۆیانە و لە دڵەوە و بە ئیخلاسەوە بیانڵێینەوە.

بەڵێ، گەر لە دڵەوە پەیوەندیتان لەگەڵ خودا نەبەستبێت سەخت ڕێتان لە شەوی قەدر و خضر و ئیسمی ئەعزەم دەکەوێت، ئەمانە، تەنها کاتێك پەردەی

نهێنی لە سەرتان لادەبەن کە لە دەروونندا صیدق و صەداقەت بەدەستبهێنن و ئەو شتەی داخوازینی لە قووڵاییەکانی ناختاندا بۆی گەڕابن و دۆزیبێتتانەوە. گەر لە هزرتاندا بیری ئامادەخۆری هەبێت و پابەندی هەستی "با یەکسەر دەستیبخەم و یەکسەر بیڵێم و یەکسەر بیدۆزمەوە" بن، ئەوە هێشتا دەبێت زۆر چاوەڕێ بن.

بۆ ئەم جارە با ئەم بابەتە بەو دێڕە بە کۆتا بهێنین، کە ئێمەش وەك پێوەرێك بۆ خۆمان پەسەندمان کردووە "ئێوە ناوی ئەصغەری خوا لە نێو ناوەکانیدا بە من نیشان بدەن، تامنیش ناوی ئەعزەمی ئەوتان پێ نیشان بدەم."

## دەربارەی "سەڵات و سەلام"

چەندە سەڵات و سەلام بدرێت لەسەر پێغەمبەری سەروەرمان (صَلَّىٰاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ) هێشتا هەر کەمە، گەر لە کۆتاییدا بوترێت "عَدَدِ عِلْمِكَ وَبِعَدَدِ مَعْلُومَاتِكَ" ئەوە دەتوانرێت هەرچی لە بووندا هەیە بکرێتە دانەی تەسبیح بۆ ئەو سەڵات و سەلامە. چونکە زانستی پەروەردگار هەموو شتێکی گرتووەتەوە. سەڵاواتێك کە هێندەی زانیاریی ئەو بێت ئەوا هەموو شتێك لە خۆ دەگرێت و دەیانکاتە دانەی تەسبیح بۆ ژماردنیان. کاتێك ئەمە دەڵێم لە ناخمەوە دەگوزەرێت کە بڵێم "پەروەردگارا! من نازانم گەر شێوازێکی گشتگیرتر و شایانتر هەیە فێرم بکە تا بەو شێوەیە هەستەکانم دەرببڕم."

سەڵاوات دان لە کاتی هێنانی ناوی سەروەرماندا (صَلَّىٰاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ) واجبە. بەڵام وتنی (جَلَّجَلَالُهُ) لە کاتی هێنانی ناوی "الله" دا واجب نییە. لەڕاستیدا زیکری خوا بە شێوازێك کە شایەنی حەققی ئەو بێت مەحاڵە. جا چۆن زیکری شایەن بە حەققی ئەو لە ئاستی ئێمە بەرزترە، وتنی "جَلَّجَلَالُهُ" بە واجب

دانەنراوە. بەیانی نەبەوی "مَا ذَکَرَنَاكَ حَقَّ ذِکْرِكَ یَا مَذْکُور"یش ئاماژە بۆ ئەم ڕاستییە دەکات. بەڵام سەبارەت بە سەروەرمان - هەرچەندە هۆکاربوونەکەی ئەو لە ئاستی ئامانجیشدایە - دەتوانین سەڵات و سەلامی لەسەر بدەین، واتە هێزمان بەسەر ئەمەیاندا دەشکێت.

سەڵات و سەلام چەندە زۆرتر بێت هێندە باشترە. یەکێك لە هاوەڵە بەرێزەکان سەرتاپای دوعاکانی بۆ سەڵاوات دان لە سەر پێغەمبەری سەروەر (صَلَوَاتُ اللّٰهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) تەرخان کردبوو، سەرباری ئەمەش سەروەرمان پێی فەرمو "گەر زیاتری بکەیت بۆ خۆت باشترە"[١]

گەر لە ڕۆژێکدا سەدجار سەڵاوات بدەن و لە پەنایشیدا داوای لێخۆشبوون بکەن ئەوە واتای ئەوەیە هێشتا لە ئەودیوی دەرگاکەوەن. کەسانێك کە لەو جێیانەی ئێوەدان نابێت هێندە کەم سەڵاوات بدەن. ئاخر ئەگەر پەنا نەبەنە بەر ساباتی شەفاعەتی ئەو ناتوانن ڕزگاربن، چونکە ڕێی بەرەو لای خوا چوون دەچێتەوە لای ئەو و لەوێوە بەرەو مەنزڵی خۆی درێژ دەبێتەوە. ڤیزەی ڕزگاربوونیش هەر لە ڕێی ناسینی ئەوەوە بەدەست دێت..

سەڵات و سەلام وەك چۆن بە زوبان دەوترێت هەرواش نابێت لە نووسیندا فەرامۆش بکرێت، ئەمەش نەك هەر بەنووسینی کورتکراوەیەك، دەبێت لەگەڵ هەر ناوهێنانێکی ئەو سەروەرەدا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيمِ) بە شێوەیەکی ڕوون و ڕاستەوخۆ و هەرجارەی بە شێوازێکی جیاو ڕەنگاوڕەنگ سەڵات و سەلام بنووسرێت، ئاخر بۆ دەبێت منێکی بچوك درێغی بکەم لە سەڵاوات دان لەسەر سەروەری خۆم؟ بە داخەوە، بە ناوی زانستی بوونەوە دەربڕینەکانی مەزن ڕاگرتن (تەعظیم) لە ڕەفەکاندا هەڵگیران. ئەوە زانستی بوون نییە کاتێك ئەو شتەی

---

١. الترمذي، القيامة ٢٣؛ عبد بن حميد، المسند.

پێویستە مەزن ڕابگیرێت، وای لەگەڵدا ناکرێت. زانست کاتێك زانستە کە بۆ مەزن ڕاگرتی ئەو بێت، وەگەر نا ئەوە زانست نییە و نابێت.

## سەڵاوات دان

هەندێك لە زانایان بە واجبیان داناوە کە لەگەڵ هەر ناوهێنانێکی پێغەمبەری سەروەردا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) واجبە. ئیختلاف لەوەدا نییە کە سەڵاوات دان بۆ جارێک لە تەمەندا واجبی موتڵەقە. بەڵام هەندێك لە زانایان ئەوەش بە واجب دەبینن کە لەگەڵ هەر ناوبردنێکی پێغەمبەردا بوترێت (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). هەر لەبەر ئەمەش صەڵاواتی دوای تەحیات بەواجب دادەنێن. چونکە لە تەحیاتدا دەوترێت "أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا الله و أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ" جا چونکە نامی جەلیلی سەروەرمان لەوێدا هاتووە بۆیە دەبێت لە دوای ئەمەوە صەڵات و سەلام بخوێنرێت.

بوونی ئەو سەروەری فەخری کائیناتە بووەتە هۆکاری ئەوەی ئێمە بزانین ئامانجی بوونمان چییە. ئەو سەرچاوەی نوورێکە کە ڕوخساری بوونەوەری ڕووناك کردۆتەوە. عیللەی غایەی بوونەوەرانە. بەرهەمی بنەڕەتی کارگەی بوونەوەران و بەنرخترین میوەی سەروەرمانە. بوونی ئەو بەدیوێکدا بنەڕەتی بوونەوەرە و وەك تۆوێك سەرەتا لەمەوە دەستی پێکردووە. پاشانیش بە پەیامدارییەکەی و ئەرك و ئامانجەکەیەوە ئەو وەك میوەی درەختی بوونەوەران دووبارە دەرکەوتووەتەوە. گەر پێتان باشە با وەك نیزامی بدوێین و بڵێین "شیعری بوونەوەران بە ناوی ئەوەوە هۆنراوەتەوە، هەروەك قافیەیەك حوکمی ئەو لە کۆتایی دێڕەکاندا دیارە. کەوابێت هەموو شتێك بەوەوە دەبەسترێتەوە."

کە لەم گۆشەیەوە تەماشا دەکەین، زۆر شت قەرزاری ئەو سەروەرەین (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ). هەر لەبەر ئەمانەیە کە هەندێك لە زانایان بە واجبیان داناوە هەرکاتێك ناوی ئەو برا صەلاوات بدرێت. بەڵام هیچ کەس وتنی دەستەواژەیەکی بەمەزن دانان (تعظیم)ی وەك "جَلَّ جَلَالُهُ" لە کاتی هێنانی نامی جەلیلی جەنابی حەق و وتنی "اللّٰه" دا بە واجب نەزانیوە. بۆچی؟ چونکە مەحاڵە بتوانرێت لە ژێر ڕێژنەی بەخششەکانی خوادا سەر بەرز بکرێتەوە. ناتوانرێت بە شوکرانە بژێری بەهای ئەو هەموو نیعمەتانەی خوداوەند کە لە هەر چرکە ساتێکدا بەسەرمانیدا دەبارێنێت لە ئاستی فراوانی نیعمەتەکاندا بدرێتەوە.

بۆ نموونە با تەنها بیر لە کاژێرێك بکەینەوە. با لە پێشدا ئەم کاژێرە بەگوێرەی خولەکەکانی شیتەڵ بکەین، پاشان بەسەر چرکەکاندا، پاشان بەسەر یەك لەسەر شەشی چرکە و یەك لەسەر دەی چرکەدا.

جا ئێمە لە نێو ئەو یەك لە سەر دەیانەی چرکەکانیشدا نوقمی درەخشانەوەی لوتف و بەخششەکانی خوای گەورەین. گەر بێ وچان بیر لە نیعمەتە جۆراوجۆرەکانی وەك بوون، ژیان، لەتیفەی ڕەببانییە، هەست، شعور، ئیرادە بکەینەوە و بمانەوێت لە بەرامبەریاندا بەهایەك بدەین و وەك بەهایەك بێ وچان و بێ سرەوت بەردەوام بڵێین "الحمد لله، الحمد لله، الحمد لله" هێشتاش ناتوانین پێڕابگەین. چونکە ناتوانین ئەم "الحمد لله"یە لە نێو یەك لەسەر دەی چرکەیەکدا جێ بکەینەوە. دەی ئێمە لە نێو یەك لەسەر دەی چرکەیەکیشدا خاوەنی بوونین. ئەم بوونەمان لە کوێ بوو؟ بە چی دەژین؟ بێ گومان بەو بە خششانەی پەروەردگار بەسەریدا باراندوین، بەڕازاندنەوەمان بە مرۆڤ و ئامادەکردنمان بۆ ئیمان و شکۆفاندنی هەستەکانمانەوە بە دەستی پڕ قودرەت و مەحەببەتی ئەو هەین و دەژین.

## سەرمایەیەکی بچکۆلە

کەواتە خواوەند زیکر دەکرێت و شوکر دەکرێت، بەڵام هێشتاش مەحاڵە بتوانرێت بەهای ئەو هەموو نیعمەتانەی ئەو بدرێتەوە. بۆیە دەبێت ئێمە هێندەی لە دەستمان دێت سوپاس و ستایش ئەنجام بدەین و پاشان لە نێو هەستی بە کەم بینینی هەوڵەکانماندا ڕوویکەینە خۆی و بڵێین "ئەی بەوەفاترین کەس کە پاداشتی هەموو شتەکان لەوپەڕی تەواویدا دەدەیتەوە، گەرچی بە سەرمایەیەکی زۆر بچوك و ناچیزیشەوە دێمە خزمەتت، بەڵام تۆ ئەمەم لە جێی کارێکی تەواودا بۆ دابنێ و بەو پێیە پاداشتم بدەوە" هەر وەك براکانی یوسف کە هاتنە لای و وتیان "ئێمە بە سەرمایەیەکی بێ نرخەوە هاتوینەتە لات، بەڵام تۆ بەشەکەمان بە تەواوی بۆ کێشانە بکە و پارەی ئەوەشی کە ناتوانین دابینی بکەین لە خێر و چاکەی خۆت بۆمان ببژێرە،"[1] ئێمەش دەبێت لە بەرامبەر خواوە بڵێین "بە سەرمایەیەکی زۆر بچکۆلە و بێ نرخ و هیچەوە ڕوومان لە تۆ ناوە. تۆ "وەفی"ت، پاداشت دانەوەی ئەم سەرمایە ناچیزەمان بە لوتفی مەزنی خۆت و ڕێژنە باران کردنمان بە نیعمەتەکانی خۆت کارێکە و لە شان و شکۆی تۆ دەوەشێتەوە، سا ئێمەش پەنا بۆ پەنای تۆ دەهێنین پەروەردگارا!"

بەڵێ، ئێمە چەندە یادی خوای پەروەردگار بکەین، هێشتا ناتوانین لە بەرامبەر بەخششەکانی ئەوەوە وەك پێویست شوکر و سوپاس و ستایش دەربېڕین. لەبەر ئەم هۆیەشە کە لەو ئایەتەی پێشوتر یادمان کردەوە، دوای دەربڕینی "يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا اللَّهَ ذِكْراً كَثِيراً"[2] ئەوەی کە زۆر یادی خوا بکەن دەفەرموێت "وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلاً"[3] واتە سەرنجمان ڕادەکێشێت بۆ تەسبیح و تەقدیس کردنی خوای گەورە

١. یوسف: ٨٨.
٢. الأحزاب: ٤١.
٣. الأحزاب: ٤٢.

و دەربڕینی پاکی و بێ باکی ئەو لە هەر جۆرە سیفەتێکی کەموکوڕی. ئێمەش هەر لە ژێر ڕۆشنایی ئەم ئایەتەوەیە کە بەیانی و ئێوارە بە وتنەوەی زیکری "سُبْحَانَكَ يَا اَللّٰهُ تَعَالَيْتَ يَا رَحْمٰنُ أَجِرْنَا مِنَ النَّارِ بِعَفْوِكَ يَا رَحْمٰنُ" تەسبیح و تەقدیس و تەنزیهی ئەو دەکەین .

بەم شێوەیەش، ئەو ئەرکەی پێمانسپێرراوە بە گوێرەی تواناییمان ئەنجامی دەدەین و بە دیوێکدا وێنەی "زۆر یادکردنەوە" دەخەینە مەیدان. بەڵێ، نابێت هیممەت نزم بین... نابێت بڵێین "هێندە بەسە". چەندە یادی پەروەردگاریشمان زۆر بکەین نابێت لە بیرمان بچێت کە نەمانتوانییوە نمایشی شوکر و زیکری نیعمەتەکانی ئەو بکەین.

لە لایەکی دیکەوە جەنابی حەق دەفەرموێت "ئێوە یادی من بکەن تا منیش یادی ئێوە بکەم!"[١] واتە، پەیمانێك هەیە تا ئێمە بە زیکر و فیکر و پەرستش یادی "اللّٰه" بکەین و ئەویش بە تەشریف و تەکریم (ڕێزلێنان و پلە بەرزکردنەوە) یادی ئێمە بکات... ئێمە بە دوعا و موناجات زوبان و دڵ دەخەملێنین و ئەویش بە وەڵامدانەوەمان بارانی لوتف و میهرەبانی خۆی دەڕژێنێت بەسەر بیابانی وشکی بێکەسیماندا و بە ڕەنگی ئاڵی گوڵان دەیخەملێنێت. ئێمە لە نێو هەڵپەی کارە دونیاییەکانماندا ئەومان لە یاد ناچێت، ئەویش کۆسپەکانی دونیا و دواڕۆژمان لەسەر ڕێ هەڵدەگرێت و بە ئیحسانی خۆی شەرەفمەندمان دەکات. ئێمە ئەو دەمانەش کە تەنها دەبینەوە خۆ سەرڕێژی فیکر و زیکری ئەو دەکەین. ئەویش دەمێك کە تەنهایی بەرۆکمان پێدەگرێت بەهانامانەوە دێت و دەبێتە هاونشین و هاودەم (ئەنیس و جەلیس)مان، ئێمە هەنگامی خۆشگوزەرانی بێ یادی ئەو لێو لێکنانێین و، ئەویش ئەو دەمەی ڕووداوەکانی ژیان وەختە

---

١. البقرة: ١٥٢.

ڕەشماڵی خۆشگوزەرانیمان بپێچنەوە بای پێچەوانەی ڕەحمەتیمان بۆ دەنێرێت. ئێمە لە ڕێگەکەی ئەودا بە ئیخلاس دەبین، ئەویش بە ئیلتیفاتی تایبەتی و پایەی تایبەتی خۆی که نه چاوان دیویانه و نه گوێیان ژنەوتویانه و نه خەیاڵان پەیان پێ بردوون شەرەفمەندمان دەکات.

پەروەردگار لە بەردەوامی ئایەتەکەدا دەفەرموێت "وَٱشكُرُوا لِي وَلَا تَكفُرُونِ - یادی من بکەن، نیعمەتەکانم، لوتفەکانم وەیادبێنن. بێ بڕوا مەبن لە ئاستیاندا. چاولێك مەنێن وخۆلەگێلی مەدەن، بە شوکر وەڵامیان بدەنەوە و نانکوێر مەبن"[١] داخۆ چ بکەین کە کوێری و نانکوێری نەبێت؟ وە چ ئەنجام بدەین کە بە یادکەری ئەو بێینە هەژمار و لە هەمان کاتیشدا لە لایەن ئەوەوە بخرێینە ڕیزی یادکراوان؟

## بوار نەدان بە بێ ڕێزی

پێویستە وتنی "اعوذ و بسملة" هێندە لامان جێگیربێت کە وەك خوویەکی لێ بێت. کاتێك ئایەتێك دەڵێت تەنها وتنی "بسم الله" بەس نییە. بەڵکو دەبێت "اعوذ بالله من الشیطان الرجیم"یش بڵێین. هەرکات ناوی سەروەرمان (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) بهێنرێت بێ شك دەبێت سەڵاوات بدەین. ئەویش نە تەنها بە زوبان، بەڵکو بە تەواوی بوون وگیانمانەوە. کە ناوی ئەو دەبرێت دەبێت هەم بە دڵ و هەم بە گیان خۆمان کۆبکەینەوە و زۆر بە ڕێزەوە ڕەفتار بکەین. چونکە ڕەنگە ڕۆحانییەتی ئەو تەشریفی هێنابێت. بەڵام نابێت بە هیچ شێوەیەك لە نیشاندانی ئەم ڕێزەدا بکەوینە زەلکاوی ڕیا و نمایشەوە. نیشاندانی ئەو ڕێزە دەبێت لە ئاستی قووڵی و پێگەیشتنی ڕۆحماندا بێت و بەو شێوەیە دەربڕێت کە لە ناخمانەوە هەڵدەقوڵێت.

---

١. البقرة: ١٥٢.

نابێت بوار بە بێ ڕێزی بدەین. دەبێت هەستیار بین لە نواندنی ڕێزی پێویستدا، تا ئەو ڕادەیەی کە لە هەموو گۆشەیەکی ژیانماندا جێی بکەینەوە.

## ئوستاز و ئەوراد و ئەزکار

حەزرەتی ئوستاز بەدیعوززەمانیش سەرباری ئەو هەموو سەرقاڵی و چەرمەسەری و هەوڵ و کۆششەی کە ژیانی تەنی بوو، بەڵام بە هیچ شێوەیەك کەمتەرخەمی نەدەکرد لە ئەنجامدانی ئەوراد و ئەزکاردا، کتێبی "مجموعة الاحزاب"ی بە پانزە ڕۆژ جارێك خەتم دەکرد. لە کەناری کتێبەکەیەوە تێبینی نووسیوە، بۆ نموونە نووسیویەتی کە "من لەم دوعایە بەم شێوە تێدەگەم، ئەو دوعایەشیان بەم شێوەیە تێدەگەم". لە ڕاستیدا گەر وەك زیکرێکی گشتی لێی بڕوانین پەیامەکانی نوور و خوێندنەوەی پەیامەکانی نوور و تێڕامان تێیاندا، لەو ڕوانگەوە کە لێکۆڵینەوەیە دەربارەی قورئان و هەڵکۆڵینی نهێنیی فەرموودە پیرۆزەکانە و دوانە لە بارەی یەکتاپەرستییەوە، دەکرێت بڵێین پەیامەکان جۆرێك لە زیکر و یادی خودایە.

لە ڕاستیدا کاتێك وەك زیکرێکی گشتی دەستی دەدەینێ، دەکرێت بڵێین خوێندنەوەی پەیامەکان بەو پێیەی تەفسیری قورئانی پیرۆزە و بە فەرموودە مەزنەکانی سەروەر (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ڕازاوەتەوە و دەربارەی تەوحید دەدوێت، بە زیکر و یادی پەروەردگار دێتە هەژماردن. چونکە کاتێك ئەو جۆرە بەرهەمانە دەخوێنینەوە بە دڵ و بە گیان یادی پەروەردگار و کار و تەسەروفاتە سوبحانییەکانی دەکەین. بەڵام حەزرەتی ئوستاز هەرگیز لە زیکرکردن تێر نەبووە و هەموو دەرفەتەکانی زۆر بە باشی بەکارهێناوە بۆ یادکردنەوەی ئەو. زیکری لە نێو پەیامەکاندا داناوە و لە نێوان بابەتەکانی تردا ئەمیشی جێگیر کردووە.

بەردەوام ڕەحمان و ڕەحیمی وەیاد هێناوەتەوە و زیکروڵڵای خستۆتە پێش چاوان. ئەوەی ڕوونکردووەتەوە کە وەك چۆن پێویستە پەرستش و کارە باشەکانی تر لە چوارچێوەی خۆیاندا ئەنجام بدرێن، هەرواش دەبێت زیکر و یادی پەروەردگار بە باشی بەجێبهێنرێت و کەمتەرخەمی تێدا نەنوێنرێت. خۆشی تابلۆی ژیانی لە چوارچێوەی دوعاکانی وەك جەوشەن و ئەورادی قودسیەی شاهی نەقشبەندی و موناجاتی قورئان و تەحمیدیە و سەکینەدا نەخشاندبوو.

ئومێدم وایە، عابید و زاهیدەکانی ئەمڕۆش زۆر گرنگی بە زیکر بدەن و لە هەوڵی زۆرکردنیدا بن و بە شوێن ڕێگاکانی زیاتر یادکردنەوەی پەروەردگاردا بگەڕێن. بەڵام ئێمە چەندە یادی ئەویش بکەینەوە و چەندە پەرستشیشمان زیاتر بێت هێشتا ناتوانین مافی زیکری خودا بدەین. هەر لەبەر ئەمەشە کاتێك ئەو هاوەڵەی یەك لەسەر چواری ڕۆژ سەڵاواتی دەدا، لە پێغەمبەری پرسی سەبارەت بە کارەکەی، پێغەمبەر پاش دەستخۆشی لێکردن پێی فەرموو "ئەگەر زیاتری بکەیت باشترە." هاوەڵەکەش پاش تەرخانکردنی نیوەی ڕۆژەکەی دەگەڕێتەوە بۆلای پێغەمبەر و ئەویش دووبارە پێی دەڵێت "گەر زیاتر بێت باشترە." ئەمجارە هاوەڵەکە سێ لەسەر چواری ڕۆژەکەی بۆ سەڵاواتدان تەرخان دەکات و دێتەوە. بەڵام پێغەمبەرمان دووبارە پێی دەڵێت "زۆرباشە، بەڵام گەر زیاتری بکەیت باشترە." پێغەمبەر لە هەموو جارەکاندا دەیوت "هل من مزید؟ - دەتوانیت لەوە زیاتر بێت؟". چونکە وەك مامۆستا دەڵێت یەکێك لە گرنگترین هۆکارەکانی گەیشتن بە خودا "بسم الله الرحمان الرحيم" و ئەوی تریان سەڵاوات دانە. لە ماوەی پێشووشدا یەکێك لە هاوڕێیانمان لە خەوندا دیبووی کە سەڵات و سەلام لە بەرامبەر بۆمباران و تاوی فیشەکەوە وەستاونەتەوە و نەیانهێشتووە بگەن پێمان. بەڵام بەداخەوە، کۆمەڵێك بیری هەڵە دەربارەی ئەوراد و ئەزکار هاتووەتە مەیدان.

تێبینییەکی لەو شێوە کە دەوترێت "ئێمە خزمەتی گەلەکەمان دەکەین، باسی خودا بۆ مرۆڤەکان دەکەین، لەرێ دەرچووان بەرەو هیدایەت بانگ دەکەین... بۆیە ئاساییە گەر لە ئەوراد و ئەزکارەکاندا کەمتەرخەمیش بنوێنین و هەندێکجار نەیان خوێنین". لای من وەك دەربڕینی شەیتان و نیشانەی وشك بوونەوەیە. نەخێر، گەر پشت ئەستوور بن بەو کارانەی ئەنجامی دەدەن و لە ئەوراد و ئەزکارەکاندا کەمتەرخەمی بنوێنن، ئەوە گەورەترین کەمتەرخەمیتان نواندووە.

هیچ کەسێکمان ناتوانین لە مامۆستا زیاتر هەوڵبدەین بۆ خزمەتکردنی حەق و حەقیقەت و بەرزکردنەوەی ناوی خودا. هیچ کەسێکمان هێندەی ئەو غیرەت و هیممەتمان نییە بۆ خزمەتکردنی ئاین و وڵات. ئەو لە پەنا ئەو خزمەتە مەزنانەدا کە هیچ یەکێك لە ئێمە ناتوانێت لە ژێر باریدا هەستێتەوە، ئەوراد و ئەزکارەکانیشی بێ هیچ کەموکورییەك خوێندووە. لە ژێر سەختترین مەرجەکاندا پەیامەکانی نوسیوە و ڕاستکردنەوەی بۆ کردوون، لە بەری گرتوونەتەوە و بە هەموو لایەکدا بڵاوی کردوونەتەوە، قوتابییەکانی پێگەیاندووە، لەگەڵ ئەهلی دونیادا دەستەویەخە بووەتەوە و زیندان بە زیندان گوێزراوەتەوە، بەڵام ئەو هەرگیز کەمتەرخەمیی لە ئەوراد و ئەزکارەکاندا نەنواندووە. بە شایەتی قوتابییەکانی، ئەو شەوانە بە خشوعێکی سەرسوڕهێنەرەوە تا بەیان پەرستشی ئەنجامداوە. بە زستان و هاوین لەسەر ئەم کارەی بەردەوام بووە و هەرگیز وازی لە تەهەجود و شەونوێژ و موناجات و ئەورادەکان نەهێناوە. تەنانەت مانگێکی ڕەمەزان بە هۆی نەخۆشییەکی سەختەوە شەش ڕۆژ لەسەر یەك هیچ شتێك ناخوات و ڕۆژووی ویساڵ دەگرێت، بەڵام هێشتاش واز لە موجاهەدەکردن ناهێنێت لە پەرستشەکانیدا. دراوسێکانی هەمیشە وتوویانە "بە درێژایی هەشت ساڵ، زستان و هاوین، هەموو شەوێك لە هەمان کاتدا مامۆستاکەی ئێوەمان دەدی کە تا

بەیانی بە دەنگە خەمگین و هەژێنەرەکەی موناجاتی دەخوێند، ئێمەش بە دیار گوێگرتنەوە سەرسام دەبووین بەرامبەر ئەو موجاهەدە بەردەوام و بێ دابڕانەی ئەو.“

ئوستاز لە لایەك وەك بولبولان هەتا بەیان ئاوازی خۆشەویستی دەدا بە گوێی هەمووانداو لە لایەکی دیکەشەوە ناخی پڕ دەبوو لەم جۆرە تێبینییانە "ئەمشەو کاتێك ئەوراد و ئەزکارم دەخوێند ئەوە هات بە بیرمدا کە من بەم شێوەیە بەرزو بە شێوەیەکی ئاشکرا ئەو ویردانەم دەخوێنم، داخۆ گەر کەسانی دی گوێیان لە دەنگم بێت ناکەومە ڕیاوە؟" پاشان بۆ ئەم ترسەی بە شوێن وەڵامدا گەڕاوە و وەڵامی خۆی داوەتەوە ”کۆمەڵێك زاتی وەك "حوججەتول ئیسلام" ئیمامی غەزالی باسی ئەوەیان بەیان کردووە کە ئاشکراکردنی ئەو پەرستشانەی بەریەککەوتنیان هەیە لەگەڵ شەعائیری ئیسلامدا زۆر لە شاردنەوەیان خێردارترە. لە کاتێکدا ئەنجامدانی نافیلەکانی دی بە شێوازێکی نهێنی خێرداره، ئەنجامدانی ئەو پەرستش و عادەتانەی بەریەککەوتنیان لەگەڵ شەعائیرەکاندا هەیە بە تایبەت لە سەردەمی بیدعەتدا کە شەرەفی شوێنکەوتنی سوننەتەکان نیشان دەدەن و وازهێنان لە حەرامەکان لە نێو ئەم کەبائیرە ترسناکانەدا و نیشاندانی تەقوا نەك هەر ڕییا نییە، بەڵکو زۆر لە شاردنەوەکەی خێردارتر و پاك و خالیسترە.

بەڵێ، ئەو بە درێژایی ژیانی لە کۆشش و خزمەتکردندا بووە کەچی لەولاوە وەك پاڵەوانێکی زیکرکردن ژیاوە کە لە ژیانیدا هیچ کارێکی دیکەی نەبووە جگە لە خوێندنی ئەوراد و ئەزکار. هەروەك ئەوەی یادگارییەکی سەروەرمان (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بێت لەم سەردەمەدا ڕەفتاری کردووە. ئەوە نیە کاتێك لە گۆشە جیاوازەکانەوە لە ژیانی پێغەمبەر دەڕوانین پێمان وایە ئەو تەنها بۆ ئەو کارە دروستکراوە کە جێگەی باسی ئێمەیە. بۆ نموونە، کاتێك وەك سەرۆکی خێزان لە

ژیانی وردده‌بینه‌وه ده‌ڵێین "ئه‌م مرۆڤه ته‌نها بۆ ئه‌م کاره دروستکراوه" چونکه ئه‌و ڕۆڵی سه‌رۆك خێزانێکی ناوازه ده‌بینێت که ئه‌رکی هاوسه‌رێتی و باوکایه‌تی بێ هیچ که‌موکوڕیه‌ك به‌جێ ده‌گه‌یه‌نێت. به‌ڵام کاتێك به‌سه‌ر کاری بانگه‌واز و په‌روه‌رده‌کردنه‌وه لێی وردده‌بینه‌وه، هێنده سه‌رکه‌وتووه دێته پێش چاومان که ده‌ڵێین "نه‌خێر، ئیشی ئه‌و ته‌نها بانگه‌وازه". له لایه‌کی دیکه‌وه، کاتێك وه‌ك سه‌رکرده‌یه‌ك به‌سه‌ر سوپاکه‌یه‌وه ده‌یبینین، لامان وه‌هایه که ئه‌رکی ئه‌و ته‌نها سه‌رکردایه‌تی کردنی سوپایه. کاتێکیش ده‌ڕۆینه نێو دونیای دوعاکردنیه‌وه، وه‌ها سه‌رسام ده‌بین که ده‌ڵێین "سه‌روه‌رمان هه‌موو ته‌مه‌نی به دوعا به‌خشیوه و جگه له دوعا هیچی دیکه‌ی نه‌وتووه." ئه‌و له‌ودیو هه‌موو تایبه‌تمه‌ندییه باڵاکانیه‌وه مرۆڤی دوعایه. شاسوارانی له دواوه هاتووی پیشه‌ی پێغه‌مبه‌رایه‌تیش له‌م ڕووه‌وه چوونه‌ته‌وه سه‌رخۆی (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) ئه‌وانه‌ی له‌مه‌ودواش دێن دووباره له سه‌ریان پێویسته "مرۆڤی دوعا" بن.

که‌واته ئه‌و که‌سانه‌ی له به‌رامبه‌ر دوعاوه که‌مته‌رخه‌می ده‌نوێنن، که‌سانی ته‌مبه‌ڵ و ده‌سته‌پاچه‌ن. کاریگه‌ربوونی ئه‌م که‌سانه له سه‌ر که‌سانی دیش شتێك نییه جێی باس بێت. کاریگه‌ربوون (موئه‌سیریه‌ت) به ڕاده‌ی گه‌رموگوڕی و پته‌وی په‌یوه‌ندی به‌نده له‌گه‌ڵ خوا به‌رده‌ست (مویه‌سسر) ده‌بێت. که‌سانی دوور له دوعا و ئه‌وانه‌ی په‌یوه‌ندییان له‌گه‌ڵ جه‌نابی حه‌قدا لاوازه، زۆر شت ئه‌نجام ده‌ده‌ن، به‌ڵام به‌ره‌که‌تی ئه‌و شتانه‌یان ده‌ست ناکه‌وێت که ئه‌نجامی ده‌ده‌ن. ئه‌و تاقانه ئیکسیره‌ی به‌ره‌که‌ت ده‌خاته نێو کاره‌کانه‌وه، گه‌رموگوڕی و پته‌وی په‌یوه‌ندیی به‌ندیه له‌گه‌ڵ خوادا. زۆر گرنگه ساته‌کان به یادی ئه‌و و گۆشه‌کانی ژیان به یادگاریی تایبه‌ت به ئه‌و و به پاڕانه‌وه و لاڵانه‌وه له ئه‌و پڕ بکه‌یته‌وه.

پوخته‌ی قسه ئه‌وه‌یه که زیکر کرۆکی ته‌واوی په‌رستشه‌کانه و کرۆکی ئه‌م

كرۆكەش قورئانی پیرۆزە. پاش ئەویش فەرمووده نورانییەكانی پێغەمبەری سەروەرمان دێت. لە قورئان و سوننەت و بەرهەمەكانی سەلەفی سالْیحدا زۆرترین شت خەڵكی بەرەو هاندرابێت زیكروڵلایە. هەر لە نوێژەوە تا جیهاد، زیكر بۆ پەرستشەكان وەك گیانە، وەك خوێنە. ئەوەش هەیە كە زیكری هەموو كەسێك، بەرادەی ئەو كاریگەرییەیە كە زیكركراو "الله" لەسەر هەستەكانی دروستی دەكات. هەندێك بە یادی جەنابی حەق و لە ڕێی ڕێگەیەكی پەنهانی نێو دڵیانەوە بە ئەو دەگەن، هەندێكیش كەنزەن (وەك دۆزینەوەی گەنجینەیەك) لە نێو دڵیاندا ئەو دەدۆزنەوە و لە سایەی خاڵی ئیستیناد (پشت پێ بەستن) و خاڵی ئیستیمداد (یارمەتی خواستن)ی نێو دەروونیانەوە هەمیشە لە بەردەوام مەعییەت (لەگەڵ ئەو بوون)دا دەبن. بۆ كەسانێك كە لەم پلەیەدان هەموو یادكردنەوەیەك بەو هۆیەوە كە دەبێتە هۆكاری دابڕان، بە جەهالەت (غافڵبوون و نەزانی) دێتە هەژماركردن. ئەو وتەیەش كە وتراوە ”خودا دەزانێت كە من ئێستا یادی ناكەم، یادكردنی ئەو واتای چییە خۆ من هەرگیز ئەوم لە بیر نەچووەتەوە!“ وتەیەكە حاڵی ئەو مرۆڤانە دەردەبڕێت كە لەم ئاستەدان.

بۆیە ئاواتم ئەوەیە كە بیری زیكر و فیكر لە نێو باوەڕداراندا دووبارە زیندوو ببێتەوە و گەشەبكات. لەم سەردەمەدا ئەركی بەرزكردنەوەی ناوی خودا لە پێش هەموو ئەركێكەوەیە، بەڵام دەبێت ئەوە بزانین كە بێ یادكردنەوەی بەردەوامی خودا و پەنا بردن بۆ ئەو و هەموو ڕۆژێك جارێكی دی تەژی بوونەوە بە ئەوراد و ئەزكارەكان مەحاڵە هیچ بكرێت لەم بوارەدا. ئاوات و ئارەزووم ئەوەیە جارێكی دی هەیەجانی زیكر لە لامان زیندوو ببێتەوە و پاش ڕێبوارییەكی نهێنی ئامێز هەمووان بگەن بە ئاسۆی "ئاسودەیی دڵ".

# بەرزکردنەوەی ناوی (الله) یاخود ئەرکە پیرۆزەکە

## ئەرکی پیرۆز

ئەمرۆکە کارێك هەیە کە هێندە بە بایەخە ئەنجامدانی هەموو دونیا دەهێنێت. کارێکی وەها کە لە ڕوانگەی دونیاییەوە هەزار جار لە فەتحی ئەستەنبوڵ گرنگترە، بگرە زۆر لە پێش مەقامەکانی غەوسییەت و قوتبییەتیشەوەیە. ئەمەش ئەرکی ناساندنی ئەوە بە جیهانیان و گەیاندنی ناوی پێغەمبەرەکەیەتی بە ڕۆحە ناتاجەکان. کەواتە با واز لە بانگەشەی گەورە و لاف و گەزافی بێمایە بهێنین و ئەم کارە ئەنجام بدەین. با هەوڵ بدەین ڕێگا و شێوازە دروستەکان بۆ گەیاندنی ئاینەکەمان بە مرۆڤایەتی بدۆزینەوە. با بە دەردی ئەوەوە بتلێینەوە کە چۆن دەتوانین بە پیر و گەنج و ژن و پیاومانەوە ئەم حەقیقەتە ناوازانە بە تەواوی جیهان بگەیەنین.

لەم سۆنگەیەوە بوو کە وتم "گرنگترین بابەت، زیندووکردنەوە و گەشاندنەوەی جۆش و خرۆش و هەیەجانی ئیسلامییە لە لای موسوڵمانان". جۆش و خرۆشێك کە وامان لێ بکات خۆمان لەبیر بچێتەوە و تەنها بیر لە بەختەوەریی هەمیشەیی

مرۆڤایەتی بکەینەوە. بێگومان گەر تەنها بۆ نەفسی خۆمان بژین و تەنها خۆمان لە بیر بێت، ئەوە ناتوانین بکەوینە یادی ئەو شتە گرنگانەی پێویستە یادیان بکەین. دەی ئایا ئەو شتەی کە ئێمەی لە پەل و پۆ خستووە و بەم حاڵەی گەیاندووین هەر هەڵەی ئەو کەسانە نەبووە کە تەنها لە یادی خۆیاندا بوون؟

لە لایەکی دیکەوە ئاستبەرزی و چۆنییەتی ئەو کارەی ئەنجامی دەدەین زۆر گرنگە. ئێمە بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوای گەورە ئەرکی گەیاندنی ناوی ئەو بەجێ دەهێنین. هیچ ئەرکێکیش لەسەر زەویدا شك نابەین کە لەم ئەرکە پیرۆزتر بێت. ئەمە ئەرکێکی وەهایە کە بەسەر بەهەشت و خۆشییەکانیدا پەسەند دەکرێت. ڕادەی پیرۆزیی ئەم ئەرکە لە ئاستێکدایە کە گەر لە سەروبەندی گەیاندنیدا بە کەسێك هەر حەوت هەشت دەرگاکەی بەهەشتمان بە ڕوودا بکرێتەوە و فریشتەکان پێشوازیمان لێبکەن و پێمان بوترێت "فەرموونە ژوورەوە!" لەبەر تامەزرۆیی بە گەیاندنی پەیامەکەمان بەو کەسە بڵێین "هەندێك ڕاوەستن من کەمێك لەگەڵ ئەم کەسە دەمێنمەوە و پاشان دێمەوە بۆ لاتان".

بگرە گەر زیاتر ورد ببمەوە دەڵێم "گەر تەنانەت لە کاتێکدا کە هەمووان بە تاسەی بینینی "جەمالی الله" وە بەرەو لای ئەو دەڕۆن، ئێمە بڵێین "پەروەردگارا بۆ ئەوەی کاتێك دێم بۆ لات تەنها نەبم دەمەوێت ئەو کەسەش لەگەڵ خۆم بهێنم، کەمێك مۆڵەتم بدە". هێشتاش شایەنیەتی. بەرگەگرتنی فیراق، مەرگی عاشقە. وتنی "کەمێك مۆڵەتم بدە" گەرچی بۆ ڕێبوارانی ئەم ڕێیە وەك مەرگیش بێت، ئەوان هێشتا دەڵێن "با کەمێکی تریش بسوتێم" و ڕزگارکردنی ئیمانی کەسێکی دیکە بەسەر هەموو شتێکدا هەڵدەبژێرن".

نابێت بڵێین "گەر یەك دوو کەسیش بڕوا بە پەیامەکەم بهێنێت چی دەبێت؟!" لە دەمی بە ئەنجام گەیاندنی ئەم ئەرکە نە قەبوڵکردنی تاکەکان و نە ژمارەی

"بەڵێ" گۆیان زۆر پەیوەندی بە کارەکەمانەوە نییە. ئەوەی ئێمە بە شوێنیەوەین تەنها ئامانجەکەی ژین و ئاسۆ بڵندەکەی بیرمانە کە بریتییە لە ڕەزامەندی خوای گەورە. ئیتر چوونە نێو دڵی مرۆڤەکان و قایل بوون و بڕوا هێنانیان لە توانای ئێمە بەدەرە. هێندە هەیە کە بە مۆڵەت و کۆمەکی خودای باڵادەست بە تێپەڕبوونی کات ئەم هەوڵە بچووکەی ئێمە کە وەك دڵۆپە وەهان دەبنە جۆگە و دەبنە ڕوبار. تا ئێستاش هەر وا بووە.

ئەرکەکە زۆر مەزنە دەکرێت بڵێن "ئێمە پیاوی ئەم کارەنین" ئەمەش خۆی بۆ خۆی قووڵاییەکی دیکەی بابەتەکەیە، بەرزبوونەوە لە هیچەوە بەرەو بوون ... ئەوەتا مامۆستا بەدیعوززەمانیش بەردەوام دەڵێت "ئەم برایەتان کە هیچی تەواو هیچە". خۆ وەك "هیچ" بینین زۆر گرنگە. لە هەمان کاتدا ئەمە قووڵترین دیوی بابەتەکەیە. کوتەکێکە لووتی من "ئەنانییەت" دەشکێنێت. کوتەکێك، کە هەمووان پێویستمان پێیەتی چونکە هەر کات لووتی "أنا — من" مان شکاند "هو — ئەو" (جَلَّ جَلَالُهُ) دەردەکەوێت.

داوام لە خوایە بتانکاتە ئەبوبەکرەکانی ئەم سەردەمە. چی بڵێم لەوە زیاتر. پەروەردگار هەر یەکێکتانی لە جێگەیەکدا داناوە. کەسی دیکەی دانەناوە، ئێوەی داناوە. نە لە جێگایەکی دیکە، لەم جێگە بەنرخانەدا دایناون. کەوایە دەبێت ئەمە بمانخاتە تێڕامانەوە "چ حیکمەتێکە کە ئێمەی لەم جێگایەدا داناوە؟ ئەو کە هیچ کارێك بێهوودە ئەنجام نادات و هەموو کارەکانی لەسەر بنەمای حیکمەتێکە، داخۆ چی دەوێت لە ئێمە؟" دەبێت ئێمەش وەك لە وتەی هەشتدا هاتووە بڵێین "ئەی خاوەنی ئەم شوێنانە: ئامان، پەنام بۆت هێناوە و خزمەتکاربوونی خۆم بۆ تۆ ڕاگەیاندووە. داواکاری ڕەزامەندیی تۆم و بۆ تۆ دەگەڕێم. ئەی ئەو پەروەردگارەی ئێمەت خستووەتە ئەم غەریبییەوە، داوا و داخوازیت لە من چییە.

بەگوێ و دڵ و گیانمیدا بدە، تەنهاش بەمەوە مەوەستە و بەم هەستانە تینوێتی دڵ و گیانم بشکێنە. سەرکەوتووم بکە تا مافی ئەم کارەم بدەم و هەر چی پێویستە بە ئەنجامی بگەیەنم." هیچ شتێك بە ڕێکەوت و بێ مەبەست نییە. ڕوونە کە کەسێك هەیە لە ڕێی ڕووداوەکانەوە خۆیمان پێدەناسێنێت. ئەو گەر ئێمە بهاوێتە ناوەڕاستی بیابانیشەوە بێگومان مەبەستێکی هەیە کە دەیەوێت پێمانی بگەیەنێت. بۆیە پێویستە نەشڵەژێین و سەراسیمە نەبین، بەڵکو پەنا بۆ خۆی بەرین و ئەو کارە بەجێ بهێنین کە لێمانی داوا کردووە.

گەر بەم هەستەوە هەڵسوکەوتمان کرد و ئەرکەکانمان بە گیانی لێپرسراوییەتییەوە ئەنجامدا و هەموو سەرکەوتنێکمان بۆ ئەو گەڕاندەوە، سەرچاوە و بنەڕەتی کارەکەمان دۆزیوەتەوە و لە بەرەکەتەکەی بەهرەوەر بووین، بە پێچەوانەوە گەر غافڵ بین لەو سەرچاوە سەرەکییە، ئەوا تینوێتی دەمانخنکێنێت، گەرچی هێندەی هەنگاوێکیش لەو سەرچاوەیە دووربین. ئەوەی گرنگە دۆزینەوەی ئەوە و بەستنەوەی هەموو شتێکە بە "ئەو"ەوە نەك خۆمان. ئاخر بۆ دەبێت هێندە بچووك ببینەوە کە خۆمان بە شتێکی ماهییەت بچوکی وەك "من"ەوە ببەستینەوە؟ کاتێك "دەسەڵاتێکی ڕەها" هەبێت کە گەردوون و ئاسمانەکان ئەمدیودیو بکات و لە نێو دەستی قودرەتیدا وەك دانەکانی تەسبیح بیانجوڵێنێت، بۆ دەبێت پەنا بەرینە بەر نەفسی بەها لە باڵەمێشوولە کەمترمانەوە؟ چۆن دەکرێت کارەکان و سەرکەوتنەکان بدەینە پاڵ ئەو؟ ئێمە ناڵێین ئەو باڵەمێشوولەیە بوونی نییە بەڵام هەر خودی پەروەردگارە کە ئەو باڵەشی دروستکردووە. کەوایە دەبێت ویردی زمانمان هەمیشە ئەو بێت و هەر ئەو بهێنینە بەر چاوان.

گەر بە مەجنوون بڵێین "وەرە با کەمێك بدوێین" و پاشان دانیشن باسی گوڵ و گوڵزاری بۆ بکەن، ئەو سەرسامانە دەپرسێت "ئەمانە چییان بەسەر هاتووە لە

کاتێکدا لەیلا هەیە باسی شتێکی دیکە دەکەن؟" ئیدی بۆچی ئێمە غافڵ و بێئاگا بژین لە لەیلای هەموو دڵان. ئەو کە لە ڕێی هەموو شتێك و هەموو ڕووداوێکەوە باسی خۆیمان بۆ دەکات. ئەو کە گوێی پێداوین تا گوێی بۆ ڕادێرین و چاوی پێداوین تا کتێبەکەی بخوێنینەوە و دڵ و هۆشی پێداوین تا لە پەیامەکانی تێبگەین. دەی ئیتر بۆ بێ ئاگا بین، بۆ بینای و بیستن و تێگەیشتنمان بۆ بەرزترین ئاست بەرز نەکەینەوە! بۆچی لە کاتێکدا دەتوانین بەهرەیەکی نەبڕاوە ببەین و بە باڵدانەوەمان بە دەسەڵاتی نەبڕاوەی ئەوەوە نهێنی نەمریی بەدەست بهێنین، ئێمە بێین و خۆمان بە بچووکی و بێ نرخی خۆمانەوە بناڵێنین و ئەرزشی بۆ دابنێین؟

گەر ئەم هزرە نەبێت، ژیانی دونیا نە ئەرزشی ژیانی هەیە، نە ئەرزشی مانەوە. لە کاتێکدا ژیانێکی هەمیشەیی لەودیوی پەردەی ئەم ژیانەوەیە. مرۆڤ دەبێت کاری بەنرخ ئەنجام بدات. هەموو ڕۆژێك جارێکی تر بەهەشت بەدەست بهێنێتەوە و هەموو ڕۆژێك جارێکی دی پەروەردگاری بناسێتەوە. هەموو ڕۆژێك جارێکی دی خۆی لە کەشی مەخافەت و مەهابەتی ئیلاهیدا ببینێتەوە تا دونیا ئەرزشی ژیان بەدەستبهێنێت. ژیان کاتێك ژیانە کە وابەستە بە ئەو بێت. ئەوەتا قورئان بە چاوی مردوو تەماشای ئەو تەنە زیندووە دڵ مردووانە دەکات کە دڵیان بۆ ئەو تەرخان نەکردووە "إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ الْمَوْتَىٰ" واتە "تۆ ناتوانیت هیچ بە مردووەکان بگەیەنیت."[1] ئەو دڵانەی گوێبیستی ئەو نەبن مردوون. ئەوانەی دڵەکانیان بەوەوە بەند نەبێت و هەموو ڕۆژێك هەنگاوێك لە ئەوەوە نزیك نەبنەوە مردوون. ئەوانەی ژیانیان لەسەر ڕێڕەوی ڕەزامەندی ئەو نابەن بەڕێوە مردوون. ئەوانەی هەست بە بوون و چاودێریی ئەو ناکەن کاتێك کارێك ئەنجام دەدەن دووبارە هەریەك بە گوێرەی پلەی خۆیان بە مردوو هەژمار دەکرێن.

---

١. النمل: ٨٠.

له لایەکی دیکەوە، بێبەش بوون له هەندێك جوانی و خۆشی دونیایی هێندە گرنگ نییه. ڕەنگه هەندێك جار خولیای ماڵ و تەلار و کۆشك و باڵەخانه بەدڵی مرۆڤدا گوزەر بکات، به ڕای من لەم بابەتەشدا دەبێت هەر وەك "یونس ئەمره"ی عاریف و شاعیر مامەڵه بکەین و بڵێین "من هەر تۆم دەوێت، هەر تۆ". بگره تەنانەت چاوەڕوانی و بیرێکی لەو شێوەیەش که بڵێین "ڕاسته لێره نەمانبوو، بەڵام خۆ لەو دونیا پێمان دەدرێت" له پلەیەکدا بێ ڕێزییه بەرامبەر به زاتی پەروەردگار. ئەو گەر بیەوێت دەبەخشێت و گەر نەیەوێت نابەخشێت، بۆیه تەنانەت داواکاریی پلەی ویلایەتیش کاریگەریی نەرێنی لەسەر پەیوەندیی نێوانمان جێدەهێڵێت. ویست و داخوازیی ئێمه دەبێت بەم جۆره بێت "پەروەردگارا بمانکه به بەندەیەکی هەژار و نیازمەند و کۆڵەوار و داماو و بێ دەرەتانی خۆت، بەندەیەك هەمیشه تامەزرۆی تۆیه و تۆش هەمیشه ڕووت لەوە" بەڵێ، خوای گەوره پێغەمبەری شانازیی مرۆڤایەتی وەك بەندەیەك پێناسه کردووه و له مەقامی بەرز ڕاگرتنندا دەربارەی فەرموویەتی "سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِ"[١]. بەڵێ، حەزرەتی محمد پێغەمبەرێکی بەنده بووه نەك پێغەمبەرێکی پادشا و فەرمانڕەوا.

## تەنها ئاواتەکەی ئاسۆی بیرم، تاقانه ئەوینەکەم

لەم ژیانه کورته چەند ڕۆژییەماندا، هەڵگرتنی ئامانجگەلێك وەك ئارەزووی ناوبانگ و به چاکه ناودەرکردن و پاشان بوونه جێی ڕێز و ستایشی خەڵکی، یاخود هەڵپەکردن بۆ هەندێك چێژ و خۆشی دونیایی کەمخایەن، ئەنگییەکی زۆر گەورەیه له بەرامبەر پەروەردگاری مەزندا. له کاتێکدا ئەرکێکی مەزنی وەك ئەرکی بەندایەتی و بەرزکردنەوە و گەیاندنی ناوی پیرۆزی ئەو هەبێت، ئارەزووی

١. الإسراء: ١.

هەر جۆرە ئامانجێکی تر لە ژیاندا ئەوپەڕی بێوەفاییە. هەم بۆ خۆم و هەم بۆ کەسانی دی هەموو جۆرە ئارەزوویەکی دونیایی لە سەودای پلە و پایەوە بگرە تا دەگاتە ویستی بە چاکە ناودەرکردن، بە بێوەفایی دەزانم لە بەرامبەر پەروەردگارم و سەروەرەکەم (صَلَّىاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمْ) و ئاینەکەمەوە.

نامەوێت هیچ سەودایەکی دیکەم هەبێت جگە لەم ئاواتەم کە بتوانین بە تێپەڕبوونی کات ئێمەش خۆمان نوێ بکەینەوە و دیمەنێکی درەخشانتر لە خۆمان نیشان بدەین و بەتایبەتیش مێژووی زێڕینی هەزار ساڵەمان باشتر بناسین و بناسێنین و هەموو هەوڵێکمان بۆ ناساندنی ئەم ئاینە جوانەمان بێت بەکەسانی دی. بەڵێ، لەگەڵ داوا و ئومێدی بەزەیی و ڕەحمەتی خواییدا، گەر ئەو بەهەشتەی هەرگیز خۆم بە شایەنی نەزانییوە، بە تەواوی جوانییەکانییەوە لەبەرپێمدا ڕابخرێت، من بەم حاڵەتە ڕۆحییەی ئێستامەوە دەیدەمە دواوە و نامەوێت.

حاشا، بەم وتانەم کەس گومانی ئەوە ناکات کە من لە بایەخی بەهەشت کەم دەکەمەوە یاخود لافی ئەوە لێدەدەم کە نابێت بەهیچ شێوەیەك داخوازی چێژ و بەخششە دونیاییەکان بین. من دەمەوێت دەربارەی ئەوینێك بدوێم کە چاو و دڵمی داگیر کردووە. ئاواتی خزمەتکردنی ئاینەکەم و ئوممەتەکەم تەواوی ئاسۆی بوونمی داپۆشیوە، ناتوانم بیری شتێکی دیکە بەخەیاڵمدا بهێنم. بگرە بیرلێکردنەوە و داواکردنی وەها شتێك بۆ خۆم بە حەرام دەزانم.

گەر ناچار بم، وەك باری ئێستام هەموو ڕۆژێکی ژیانم بەدەم چەشتنی تاڵی و ئازار و ئەشکەنجەوە بەسەربەرم و دووچاری دارمانی جەستەیی وەها ببمەوە کە ناچاربم چەندین دەرمان بەسەر یەکەوە بەکاربهێنم، هێشتاش مەیلی چێژی دونیایی ناکەم و بگرە بەهەشتیشم ناوێت و لە بەرامبەر هەموو سەختییەکدا

خزمەتکردنی ئاینەکەم و ئوممەتەکەم هەڵدەبژێرم. تەمەن درێژی گرنگ نییە بۆم و ئەم هەموو خەمخۆرییەم بۆ باری تەندروستیشم و وەرگرتنی ئەم هەموو دەرمانەش هیچ کام بەو هۆیەوە نییە کە ئاواتی تەمەنێکی درێژ بخوازم. هەموو شەوێك وا بیر دەکەمەوە کە "ئەمە کۆتا شەومە لە دونیادا"، بەڵام وەك "مەیدانێکی خزمەتکردن" لە دونیا دەڕوانم و تا ئەو کاتەش لێرە بم هەوڵدەدەم داخوازییەکانی ئەم جیهانبینییەم بەجێ بگەیەنم.

## هەوڵی سەرسامکەری مسوڵمانە پێشینەکان

ئێمە زانیاریی وردمان لە بەردەستدا نییە سەبارەت بە چۆنیەتی گەیاندنی ئیسلام لە لایەن مسوڵمانە پێشینەکانەوە بە هەر چوارلای دونیادا.

پەسەندکردنی ئیسلام و جێکردنەوەی بەو ماوە زۆر کەمە لە دڵەکاندا، سەرباری ئەو هەموو ئاین و ئاینزا و بیر و تێڕوانین و فەرهەنگە جیاوازانەی لەو وڵاتانەدا حاکم بوون کە ئیسلامی پێدەگەیشت، شتێکی حیرەتبەخش و سەرسامکەرە. دیارە موسوڵمانە پێشینەکان لە بواری گەیاندندا زۆر سەرکەوتوو بوون. هەوڵدان بۆ گەڕاندنەوەی ئەم سەرکەوتنانە بۆ زەبری شمشێر و بەکارهێنانی هێز لە لایەن سوپای موسوڵمانانەوە شتێکە پێچەوانەی ژیری و داوەریی ژیرانەیە.

فەرموون، ئەمڕۆ بە تەواوی توانایییەکانی وڵاتێکی پێشکەوتووەوە و وەك کۆمەڵێك کەسی شارستانی ڕوو لە وڵاتی هیندستان بکەن، بزانن لە ماوەی پەنجا ساڵدا بە شێوەیەکی ڕێژەیی، چەندێك لەو کارانەی ئەوان کردوویانە دەتوانن بە ئەنجامی بگەیەنن. ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ئەو موسوڵمانانەی ئێستا دانیشتووی هیندستانن هەموو نەوەی ئەو کەسانەن کە لە سەردەمەکانی

سەرەتادا موسوڵمان بوون. مسوڵمانان هەر لە ساڵانی چلی هیجریدا ڕۆشتنە نێو "سیندئاباد" و لەو ڕۆژەوە تا ئێستا ئیسلام لە هیندستاندا هەیە. شوێنەکانی تری وەك بوخارا و سەمەرقەند لە ساڵی هەشتای هیجریدا فەتح کراون.

باپیرەی ئیمامی بوخاری لەسەر دەستی باپیرەی ئیمامی موسنەدی کە مامۆستای ئیمامی بوخاری بووە موسوڵمان بوو. بەو گوێرەیەی بوخاری تا ناوەڕاستی سەدەی سێی هیجری ژیاوە و لە سەدەی سێهەمدا توانیویەتی شاکارێك لەو ئاستە بەرزەدا پێشکەش بکات. دەتوانین بڵێین، خەڵکی ئەو شوێنانە هەر زۆر زوو موسوڵمان بوون. هەر زۆر زوو ئەم ئاینەیان لە خۆ گرتووە و مامۆستای گەورەی ئەم زەمانەیان پێگەیاندووە، تا ئەوەی خەڵکی ئاسیا فەرموودەناسی مەزنی وەهایان تێدا هەڵکەوتووە کە پێشی فەرموودەناسەکانی خودی حیجاز بدەنەوە. بگرە دەکرێت بوترێت بێجگە لە ئیمامی مەزنی فەرموودە، ئیمام مالیکی خاوەنی کتێبی "الموطأ" ئەوانەی پاش ئەو، بە ئیمامی شافیعیشەوە هەموو بە فەرهەنگی ئاسیا پەروەردە بوون.

بەڵێ، ئیمامی شافیعی لە دەوروبەری عێراق و ئێران و بەغداددا گەڕاوە و لای قوتابییەکانی ئیمامی ئەعزەم ئەبو حەنیفە وانەی خوێندووە. بوخاری و موسلیم و نەسائی... هەریەك لە شوێنێکی ئاسیادا پێگەیشتوون، بوخارا و تیرمیز دوو شوێنی نزیك یەکن. ئەبو داود خەڵکی سیجیستان واتە ناوچەی سیستانی ئێستایە و نەسائیش خەڵکی ناوچەی نەسای خۆراسانی جاران و تورکمانستانی ئێستایە. بێجگە لە فەرموودە ناسان چەندان فەقیهـ و شەرعناس لەم شوێنانەدا هەڵکەوتوون. لە ناوەڕاستی سەدەی دووی کۆچی بەدواوە یاسادانەری ناوازە و بلیمەت هاتوونەتە مەیدان. میتۆدۆلۆژی فیقهـ و تێگەیشتن لە ئاین پانتاییەکی دیکەی وەرگرتووە و پەرەی سەندووە و لە سەدەی سێیەمی کۆچی بە دواوە سەردەمێکی ڕێنیسانسی بێ وێنە هاتووەتە ئاراوە.

## ئەوان دڵەکانیان فەتح کرد

لە دەرەنجامدا دەگەینە ئەوەی کە ئەوان بە زۆری شمشێر و هێز لەو وڵاتانەدا جێی خۆیان نەکردووەتەوە. بەڵکو دڵەکانیان فەتح کردووە و لە دەروونی کەسەکاندا تەختیان داناوە و وێنایەکی هێندە جوان و هەوڵێکی هێندە سەرسامکەریان خستووەتە مەیدان کە ژێرییەکان لە ئاستیدا دەوەستن. با ئێستاش تەماشای مرۆڤی ئەم سەردەمە بکەین کە بە دیمەن خاوەن بیری دروستین و هۆکارگەلی جیاوازیش لەبەردەستماندایە. ئەمڕۆ مرۆڤایەتی ئاسانکاریی زیاتری لەبەردەستدایە، هۆکارەکانی گواستنەوە و گەیاندن زۆر باشترن، و ئامڕازەکانی پەیوەندیی لەوپەڕی پێشکەوتنندان، تەکنەلۆجیا بە تەواوی لەبەردەستی مرۆڤەکاندایە. بەڵام داخۆ موسوڵمانانی ئەمڕۆکە چەندێك لەو هەوڵ و کۆششەی موسوڵمانانی پێشین نیشان دەدەن؟! داخۆ بوونەتە هۆکاری موسوڵمان بوونی چەند کەس و، داخۆ چ بەرنامەیەکیان بۆ گەیاندنی ئەم پەیامە بە مرۆڤایەتیی داڕشتووە؟

## حەزرەتی ئەبو ئەییوبی ئەنصاری

بەڵێ، ئەم دەرفەتانەی بۆ ئێمە ڕەخساوە بۆ پێشینانی ئەم ئوممەتە بەردەست نەبوو. خودا دەزانێت حەزرەتی ئەبو ئەییوبی ئەنصاری تا گەیشتووەتە ئەستەنبووڵ چ سەختییەکی چەشتووە؟ لەو غەزایەدا کە لە سەردەمی یەزیددا بۆ فەتحی ئەستەنبووڵ ڕێکخرا، موسڵمانان ڕەنگە شەش مانگ بەڕێوە بووبن تا گەشتوونەتە ئەو شارە. حەزرەتی ئەبو ئەییوب زۆر بە تەمەن بوو. ئەو کاتێك پێغەمبەری خودا کۆچی بۆ مەدینە کرد خاوەنی ماڵ و منداڵ بوو. گەر لەو کاتەدا دەوروبەری سی ساڵێك بووبێت، ئەوا بەگوێرەی ئەوەی ئەم غەزایە لە دەوروبەری ساڵی چلی هیجریدا بووە، دەبێت تەمەنی لەو کاتەدا حەفتا بۆ

حەفتا و پێنج ساڵ بوویێت. ئەم زاتە تەمەن سەروو حەفتا ساڵییە، لە پێناوی بەرزکردنەوەی ئاینەکەیدا، خۆی بەسەر ئەسپەکەیەوە دەبەستێتەوە و ئەو ڕێگە دوور و درێژە بەو شێوەیە تەی دەکات .

## حەزرەتی ئەبو طەڵحە

هەروەك حەزرەتی ئەبو ئەییوب، حەزرەتی ئەبو طەڵحەش تا بڵێیت بە تەمەندا ڕۆیشتبوو، بەڵام هێشتاش بە تامەزرۆیی جیهادەوە ناخی بڵێسەی دەدا. هێزی ئەوەی تێدا نەمابوو کە بەسەر ئەسپەوە بوەستێت کەچی هەر دەیویست بەشداریی جیهاد بکات. تا ئەوەی نەوەکانی پێی دەڵێن "تۆ لەگەڵ پێغەمبەری خوادا تا توانیت جیهادت کردووە. بەشداری بەدر و ئوحودت کردووە. ئیدی تۆ پشوو بدە. ئێمە لە جێگەی تۆ دەڕۆین بۆ جیهاد، چونکە تۆ تەنانەت توانای ڕۆیشتنیشت نەماوە." لە وەڵامدا ئەبو طەڵحە پێیان دەڵێت "نەخێر، خوا مۆڵەتێکی لەو شێوەی بەکەس نەداوە." وە پاشان ئایەتی ٤١ ی سورەتی تەوبەی بۆ دەخوێنێتەوە کە دەفەرموێت:

﴿ ٱنفِرُواْ خِفَافًا وَثِقَالًا وَجَٰهِدُواْ بِأَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ (التوبة: ٤١)

واتە "ئەی موسڵمانینە! بە پیادەیی و بە سوارییی بە چاپوکی و هەمووتان تێکڕا بڕۆن بۆ جیهاد کردن و ماڵ و گیانتان ببەخشن لە ڕێگای خوادا و لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەجێ مەمێنن. ئەوە باشترە بۆتان چ لە دنیا و چ لە ڕۆژی دواییدا، ئەگەر ئێوە تێبگەن و بزانن."

کە پێیان دەوت "دەی خۆ ئەوەتا تۆ توانای سەر ئەسپ کەوتنیشت نەماوە."

پێی دەوتن "دەی کەواتە بمخەنە سەر ئەسپێك و پێوەی بمبەستنەوە، تا بەو شێوەیە بڕۆم." بەو حاڵەیەوە بەشداریی سەفەری دەریای کرد کە بۆ فەتح کردنی قوبرس سازدرا، ئەوەبوو لە نێو کەشتییەکەدا بە سەختی نەخۆش کەوت و پاش چەند ڕۆژێکیش وەفاتی کرد. بەهۆی ئەوەی چاوەڕێی گەیشتنە سەر وشکانی کرا، مەراسیمی بەخاکسپاردنەکەی حەوت ڕۆژ دوا کەوت، پاش ئەو ماوەیەش هێشتا لاشەکەی هیچ تێکچوونێکی بەسەر نەهاتبوو.

### ئوم حەرامی دایکمان

یەکێکی دیکە لەوانەی بەشداری هەمان غەزای کردووە ئوم حەرامی دایکمانە. ئەو کە چەندین ساڵ پێشتر موژدەی بەشداریکردنی لەم غەزایەدا لە زاری پیرۆزی پێغەمبەرمانەوە بیستبوو، لەم کاتەدا کە تەمەنی ٨٦ ساڵ دەبوو، لەبەر تامەزرۆیی بۆ بەرزکردنەوەی ناوی بەرزی پەروەردگار خۆی لە ماڵدا نەگرت و بەڕێکەوت تا گەیشتە قوبرس. جا کاتێك دادەبەزنە سەر وشکانی بەهۆی ئەوەی ئەسپەکەی قاچی بەیەکدا دێت، دەکەوێت و شەهید دەبێت.[1] مەزاری پیرۆزی کە ئێستا دەکەوێتە شاری لارناکای بەشە یۆنانییەکەی قوبرسەوە لە پاش فەتحی قوبرس لە ساڵی ١٥٧٠ لە لایەن عوسمانییەکانەوە بایەخی پێدەدرێت و مزگەوتێکیشی بەناوی خۆیەوە بۆ دروست دەکرێت.

وەك دەبینن ئەم کەسانە سینەیان بەر قورسترین سەختییەکان داوە و تا دوورترین شوێنەکان ڕۆشتوون. ئەو شوێنانەی کە پێی گەیشتوون هێندە دوور بوون کە بۆ ڕۆیشتن لە جێیەکەوە بۆ جێیەکی دی هەندێك جار ناچار بوون شەش مانگ

١. البخاري، الجهاد ٣؛ مسلم، الإمارة ١٦٠، ١٦١.

بە پێ بڕۆن. پاشان هەرکە گەیشتوون گیانفیدایانە دەستیان بە خەبات کردووە و پاشانیش ڕێگە و شێوازی دروستیان دۆزیوەتەوە و بیر و هەست و نووری باوەڕیان بە گوێی دڵە ئامادە و تینوەکاندا داوە. ئاینەکەیان بێ هیچ کەموکوڕییەك لە خۆدا ڕەنگ پێداوەتەوە و بە ژیانیان کاریگەرییان لەسەر کەسانی دی جێهێشتووە. بەڵێ ئەوان ئەم کارە زۆر سەختانەیان بەجێ گەیاندووە و بێ ئەوەی ڕۆژێك سکاڵا و ناڕەزایەتییەکەیان لێ ببیسترێت بە ئەرکەکانیان هەستاون.

دەتوانم بە دڵنیاییەوە ئەوەتان پێ بڵێم کە هەرگیز ناڕەزایەتی یاخود سکاڵایان دەرنەبڕیوە، چونکە تا ئێستا نەمدیوە لە هیچ کتێبێکی "سیرة یاخود مغازي" دا کە ژیانی ئەوانی تێدا نەخشێنراوە، باسی ئەوە کرابێت لە بەرامبەر ئەو ڕووبەڕووبوونەوە سەخت و گیانپڕوکێنانەوە هیچ کامێکیان ڕۆژێك سکاڵایەکیان دەربڕیبێت.

تەماشایەکی عەبدوڵڵای کوڕی حوزافەی ئەلسەهمی بکەن، ئەوەتا سەری دەخەنە نێو ئاوی کوڵبەکوڵەوە و پێستی دەم و چاوی هەموو دادەماڵێت، بەڵام نابیستین بڵێت "ئەمە چییە بەسەر من دێت؟!"[١] هیچ کام لە ئێمە هەرگیز لە پێناوی ئاینەکەماندا تووشی سەختی لەم شێوەیە نەبووینەتەوە. بگرە هەر زۆر ئاسودە دەژین. جا گەر لە بەرامبەر ئەم هەموو بەخششانەی پەروەردگارمانەوە، وەك سوپاسگوزارییەك ئەو بەخشش و ئاسانکارییە سەردەمیانەی لەبەردەستماندان بۆ گەیاندنی ناوی ئەو بەکار نەهێنین ئەوا زۆر بە ڕوونی دەتوانین بڵێین نانکوێر بووین بەرامبەر ئەو بەخششانە. هەم کوێر بووین، هەم نان کوێربووین. نان مەبەست پێی بەخشش و نیعمەتەکانی پەروەردگارە. واتە چاومان لە ئاستی بەخششەکانی ئەو کوێر بووە و پێمان نەزانیوین.

---

١. بڕوانە: إبن عساكر، تاريخ دمشق ٣٥٩/٢٧؛ إبن الأثير، أسد الغابة ٢١٤/٣.

## سەبارەت بە باوەڕدارانی ئەمڕۆ...

بەڵێ ئەمڕۆکە هەموو باوەڕدارێك دەبێت لە هەوڵی ئەوەدا بێت تەواوی هۆکارەکانی بەردەستی بەشێوەیەکی ئەرێنی وەگەڕ بخات و بە یارمەتی خوا تا هەرکوێ دەتوانێت ئەم پەیامە بگەیەنێت. باوەڕدارانی ئەمڕۆ دەبێت هەموو تواناکانیان بەکاربهێنن و پاش ئەنجامدانی هەموو شتێك بڵێن "ئەوەی بە نەوەی ئێمە دەکرا ئەوەندە بوو کە توانیمان ئەم ئەمانەتە تا ئەم خاڵە بهێنین، گوڕ و تین و توانامان بەشی تا ئێرەی کرد. با ئێمە لەم خاڵەدا دایبنێین، بێگومان ئەوانەی لە دوای ئێمەوە دێن لێرەوە دەستی دەدەنێ و بەرەو پێشەوەی دەبەن..."

بەم شێوەیە هەمووان ئەرکی گەیاندن و لە خۆدا بەرجەستەکردنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام لە ئەستۆ دەگرن تا تەمەن و توانا و لێهاتووی و هۆکارەکان دەرفەتیان پێبدەن، ڕێ دەکەن و بەرەو پێش دەڕۆن. لە هەرکوێشدا ماندوو بوون و هێزیان لێبڕا ئەو ئەمانەتە قودسییە دەدەنە دەست کەسێکی دیکە تا لە پاش ئەمان بەردەوام بێت لەکاروانەکە. تا ئێستا هەر وا هاتۆتە پێشەوە. پێغەمبەری سەروەرمان ئەرکی گەیاندن و لە خۆدا بەرجەستەکردنی ئەم پەیامەی دوای خۆی دایە دەست هاوەڵەکانی ئەوانیش لە پاش خۆیان بۆ ئەمەوییەکانیان جێهێشت و ئەوانیش بۆ عەباسییەکان و بەم شێوەیە. "ئەوانە کۆمەڵێکی بەختەوەر بوون، بەو شتەی کە بەدەستیان هێنابوو بەرەو لای خوای خۆیان بەڕێ کەوتن. ئێوەش ڕۆژێك بەرەو لای خوا بەڕێ دەکەون و هەرچییەکتان کۆ کردووەتەوە ئەگەر چاك بێت ئەگەر خراپ بێت لەگەڵ خۆتان دەیبەنەوە.."

﴿ تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ وَلَا تُسْأَلُونَ عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴾ (البقرة: ١٣٤، ١٤١)

واتە "ئەو ئوممەتە تەواو بوون و ڕۆیشتن، کار و کردەوەکانیان هەر بۆ خۆیانە و، لە ڕۆژی دوایی دا هیچ کەسێك بە چاکە، یان بە خراپەی کەسێکی تر نە پاداشت وەردەگرێت و، نە سزا دەدرێت. ئێوەش کردەوەکانتان هەر بۆ خۆتانە، جا چاکە بێت، یان خراپە، وە پرسیارتان لێ ناکرێت لەسەر کردەوەی ئەوان، یاخود لەسەر کردەوەی کەسێکی تر. هەر کەسەو پرسیاری کردەوەی خۆی لێ دەکرێت و بەس"

جا دەکرێت وەك کەسێکی سەرکەوتوو کە ئەرکەکانی بەباشی بەجێهێناوە بگەڕێینەوە، یاخود وەك کەسێکی تاوانباری لەسەنگەر هەڵهاتوو دەستگیر بکرێین و بە قۆڵبەستی ببرێینەوە، خوای گەورە لە وەها چارەنوسێك پەنامان بدات.

## هەستی صەحابە ئاسا

سوڵتان عوسمان غازی دامەزرێنەری دەوڵەتی عوسمانی، تا وەفاتی کرد هەر لە نێو چادردا ژیانی بەسەربرد. ئەو کاتەی ئەو وەفاتی کرد موسوڵمانان چل ساڵ دەبوو کە لە شاری "سۆهوت" نیشتەجێ بووبوون، بەڵام ئەو هێشتا خانوویەکیشی بۆ خۆی نەبوو. لە کاتێکدا ئۆرهان غازی کوڕی لە بیلەجیکەوە هەوڵی فەتح کردنی شاری بورسەی دەدا، ئەمیش لە دوورەوە ئاماژەی بۆ ڕوناکییەکانی شارەکەی دەکرد و دەیوت "لەو شارەدا بمنێژن" ئەو بەو ماڵ و موڵکەی لە غەزاکاندا کۆیکردبوونەوە دەیتوانی هەر ئەوکات کۆشکێك وەك کۆشکی "تۆپ قاپی" دروست بکات کەچی ئەو لە نێو چادردا گیانی دەسپارد. چونکە پیاوێکی دڵ زیندووی دەروونپاکی گیانفیدابوو بۆ ئاینەکەی. گەر ئەم وێنەیە بگرین و لە تەنیشت وێنەی هاوەڵانەوە دایبنێین بە ئاسانی ناتوانین لە یەکیان جیا بکەینەوە و دیارییان بکەین. گەر سوڵتان عوسمان غازی

بخەینە تەنیشت حەزرەتی خالیدەوە (بەدەر لە فەزیلەتی ڕەهای هاوەڵان) بە ئاسانی ناتوانین لەیەکیان جیا بکەینەوە و دەڵێین "داخۆ ئەمەیان خالیدە یان ئەوی تریان ؟" وەك دەزانن حەزرەتی خالید کە وەفاتی کرد لەدوای خۆی هیچی بەجێ نەهێشت. سەعدی کوڕی زەید دەڵێت "حەزرەتی خالید وەك سەرکردەیەك کە هەمووان ستایشیان دەکرد ژیا، وەك قارەمانێکی ئیسلام کۆچی دوایی کرد، کۆچی کرد و لە دوای خۆی تەنها ئەسپەکەی و شمشێرەکەی بەجێ هێشت."[١]

حەزرەتی خالید دوو ئیمپراتۆرییەتی بەچۆکدا هێنا بەڵام هیچ جۆرە ماڵ و موڵکێکی بۆ خۆی پێکەوە نەنا. ئەمە بەواتای ئەوە نایەت کە نابێت ماڵ و موڵکمان هەبێت. بەڵکو بەواتای ئەوە دێت کە نابێت وابەستەی ماڵ و موڵك و پایە و مەقام بین، دەبێت دڵبەند و وابەستەی ئەوەبین کە شایەنی دڵ پێدان و وابەستەگییە. توانای مرۆڤ تەنها بەشی وابەستەبوون بە یەك شتەوە دەکات. ئادەمیزاد ناتوانێت لە یەك کاتدا بەیەك ئاست و بەیەك گڕووتین دڵ بە دوو شتەوە ببەستێتەوە.

بەڵێ ئەوان بێجگە لە بەرزکردنەوەی ناوی بەرزی پەروەردگار بیریان لە هیچ شتێکی دیکە نەدەکردەوە. دەیانویست هەمووان پەروەردگار بناسن، مرۆڤەکان بە حەزرەتی محمد (صَلَّىٰ اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) ئاشنا ببن. ویردی شەو و ڕۆژیان ئەوە بوو "چۆن دەتوانین ئەم پەیامە بەگوێی هەموو دونیادا بدەین؟" تەماشای گەورەیی سەرزەوییان دەکرد و لەبەر خۆیانەوە دەیان وت "کەواتە گەیاندنی پەیامی ئیسلام بە تەواوی سەر زەوی هێندە سەختە کە لە تەمەنی یەك کەسدا تەواو نابێت". گەر تەنها لەم وتەیە وردبینەوە، بۆتان ڕوون دەبێتەوە کە ئامانج و ئاواتیان چی بووە و بە چ دەردێکەوە تلاونەتەوە.

نازانم وەك ئامانج نیشاندان لەم پەیامە تێدەگەن یاخود وەك مژدە کە پێغەمبەری

---

١. بڕوانە: ابن عساكر، تاريخ دمشق ٢٧٩/١٦.

خوا فەرموویەتی "ناوی من دەگاتە هەر جێیەك كە خۆری لێهەڵدێت و خۆری لێ ئاوا دەبێت"[١] ئەوان ئەمەیان وەك ئەركێك بۆ خۆیان دەستنیشان كردبوو، وە هەمیشە لە هەوڵی بەجێگەیاندنی ئەم ئەركەدا بوون، ڕابردووی پڕ شكۆی ئەم ئوممەتە پڕە لە شەرەفی بەجێهێنانی ئەم ئەركە. لەو جێیەدا كە هەمووان بە نەخۆشیی مەرگەوە دەتلانەوە ئەم ئوممەتە دروشمی ئومێدی هەڵكردووە و توانیویەتی هەستێتەوە سەر پێ و لە سەرپێ بوەستێت.

## ئەركی بانگەواز و پاراستنی خوایی

پرسیار : مامۆستا، لەو ئایەتە پیرۆزەدا كە فەرمانی بانگەواز كردن دراوە بە پێغەمبەری خوا باس لە پاراستنی خواییش كراوە، تێگەیشتنمان بۆ ئەم ئایەتە دەبێت چۆن بێت؟

وەڵام: پێشتریش لەسەر ئەو ڕووداوەی ئەم ئایەتە كە باسی ئەركی بانگەواز و گەیاندن دەكات چەند تێبینییەكمان پێش چاو خستووە. خاڵی بنەڕەتی پرسیاری ئەم جارەتان دەربارەی پاراستنی خواییە. واتای ئایەتەكە بەم شێوەیە "هەستە بە گەیاندنی ئەوەی كە لەلایەن پەروەردگارتەوە پێت گەیشتووە، ئەگەر ئەمە ئەنجام نەدەیت ئەوا ئەركی پەیامبەری و (ریسالەتت) بەجێ نەگەیاندووە. وە بزانە كە خوا لە خراپەی ئەوكەسانەی دەیانەوێت زیانت پێ بگەیەنن دەتپارێزێت و ناهێڵێت كافران بگەنە ئامانجەكانیان"[٢].

---

١. بروانه: مسلم، الفتن ١٩؛ الترمذي، الفتن ١٤؛ أبو داود، الفتن ١.

٢. المائدة: ٦٧/٥.

## بانگەواز و گەیاندن بەرپرسیاریەتییەکی زۆر سەختە

پێش هەموو شتێك، ئەرکی بانگەواز و گەیاندن لێپرسراوییەکی زۆر مەزن و بە ڕپرسیاریەتییەکی زۆر سەختە. دەتوانرێت بوترێت بانگەواز وگەیاندن ئامانجی بوونی ئەو مرۆڤە مەزنانەیە کە بەرز کراونەتەوە بۆ پایەی پێغەمبەرایەتی. ئەوان لەسەر شێوازێکی وەها خوڵقێنراون کە پڕ بە پێستی ئەو پایەیە بێت . هەر بۆیە هیچ پێغەمبەرێك نەبووە بڵێت یاخود بتوانێت بڵێت "با من بە کاری دیکەوە خەریك بم و لەم نێوەندەشدا ئەرکی پەیامبەریەکەم بەجێ بگەیەنم". "گەر پەروەردگار کۆمەڵێك توانایی و تایبەتمەندیی ناوازەی وەك پاکیزەیی، فەتانەت، ڕاستگۆیی و سەر ڕاستی، ئەمینی و دەست پاکی، ڕەبانییەت، نمونەی بەرزی ئیستیقامەت، دڵسۆزی، ئیخلاس و بلیمەتی لە گەیاندندا بەخشییە کەسێك و پاشانیش ئەو کەسەی بە پایەی پێغەمبەرایەتی شەرەفمەندکرد، ئەوە نیشاندەری ئەوەیە کە ئەم کەسە بۆ ئەرکێکی تایبەتی خوڵقێنراوە و ئەم پێغەمبەرە تەنها بە ئامانجی بە ئەنجام گەیاندنی ئەم ئەرکە دروست کراوە. هەموو پێغەمبەرەکان پەیان بەم خیلقەتە تایبەتی و ئامانجدارە بردووە. ڕەنگە لە سەرەتاوە، گەر کەمێکیش بووبێت هەستی گومان و ترس و ئەندێشەو دەستەوسانی ڕووی تێکردبن. بەڵام کە کەوتوونەتە نێو کارەکەوە ئیدی تێگەیشتوون کە -گەر دەربڕینەکە دروست بێت- قوتار بوون لەم کارە یاخود خۆکەنارگرتن لێی کارێکی مەحاڵە و ڕێی ئیستیقامەت و دامەزراویی بۆ ئەوان تەنهاو تەنها بەم ڕێگەدا ڕۆیشتنە.

ئەوەتا لە ئایەتە پیرۆزەکەدا خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۖ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُۥ ۚ وَٱللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾ (المائدة: ٦٧)

واتە "ئەی پێغەمبەر هەستە بە گەیاندنی ئەوەی لە لایەن پەروەردگارتەوە بۆت دابەزێنراوە! ئەگەر هەڵنەستیت بەم کارە ئەوە ئەرکی پەیامبەریت بەجێنەگەیاندووە، واتە (پایەی تۆ پایەی ڕیسالەتە گەر پێویستی و داخوازیەکانی پێغەمبەرایەتییەکانت بەجێ نەگەیەنیت ئەوە مافی ئەو پایەیەت نەداوە کە پێت بەخشراوە)".

گەر بەم شێوەیە لە ئایەتەکە تێنەگەین -حاشا- گومان دەبەین کە لە وشەکانی قورئاندا -وشەی بێسوود و ناپێویست- هەیە. هەرچەندە ئاساییە لە کاتی واتاکردنی ئایەتەکاندا سوود لە کورتکردنەوەی مەبەستەکان و پوختەکردنەوەی دەربڕینەکان وەربگرین، بەڵام نابێت واتای ئایەتەکە بەم شێوە لێك بدەینەوە "ئەگەر ئەرکی گەیاندن بەجێ نەگەیەنیت، ئەوا بەرپرسیارێتی گەیاندنت بەجێ نەگەیاندووە". چونکە مەبەستەکە بەم شێوەیە گەر تەواوی داخوازییەکانی بەرپرسیارێتی بانگەوازەکەت بەجێنەگەیەنیت، ئەوا مافی ئەو پایەیەی تێیدایت، مافی ئەو خیلقەتەی لەسەری دروستکراویت -کە خیلقەتی پێغەمبەرایەتییە- نەداوە. واتە تۆ لە پایەیەکدایت کە لە هەندێك بیر و ئەندێشە بە تەواوی خۆت دادەڕنیت و بەرامبەر هەندێك ڕوانینت دەخەیتە سەر هەندێك شتی دی. کە وایە "ناوی بەرزی پەروەردگارت یاد بکە و لەوەی بە شتە فانیەکانەوە ببەسرێیتەوە خۆت ڕزگاربکە و بە تەواوی بوونتەوە تەنها ڕوو لەو بکە"[1]، ئەمەش بە واتای ئەوە دێت کە هەڵبژاردنت با ئەوە بێت هەموو شتێك وازلێبێنیت و تەنها ڕوو لە خوا بکەیت و بەوەوە ببەسترێیتەوە.

---

١. المزمل: ٨/٧٣.

## مەرجەکانی مەیدانی ئەرک

وەك هەموو پێغەمبەران، پێغەمبەری ئازیزیش (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيمِ) هەستی بە پایەکەی خۆی کردبوو. دەیزانی لە چ پلە و پایەیەکدایە، بەڵام مەیدانی بەجێهێنانی ئەم ئەرکە کە دونیایە زۆر سەیرە. پایەکانی ڕەوشت و ئەخلاق لە نێو دانیشتوانی ئەودەمی دونیادا بەشێوەیەك تێکشکابوو، خووە ناشرینەکان وەها ڕەگیان داکوتابوو، وەها ببونە بەشێك لە سروشتی مرۆڤەکان کە بە دەربڕینەکەی مامۆستا بەدیعوززەمان خراپەکاری لەگەڵ خوێن و گۆشت و ئێسقانی مرۆڤەکاندا تێکەڵ بوویوو. دەزانیت کە فەرمانڕەوایەکی گەورە و بە دەسەڵات، بە هەوڵێکی زۆر گەورە و جددی، ئەوجا دەتوانێت خوویەکی بچوکی وەك جگەرەکێشان لە نێو گەلێکی بچوکدا بە هەمیشەیی بنەبڕ بکات. دەی تەماشا بکە، ئەم زاتە، کۆمەڵێك خووی زۆر و گەورەی لە نێو کۆمەڵێك گەلی زۆر و گەورەی ئینکار و دەمارگیردا بە هێزێکی لە ڕواڵەتدا بچوك و هەوڵێکی بچوك، لە ماوەیەکی کەمدا بنەبڕ کرد و لە جێیاندا "سەجایای عالیەی قیدەم"ی بە شێوەیەك جێگیرکرد، هەروەك بڵێیت لەگەڵ دەمارەکانیاندا تێکەڵ بوویوون. هەروەها چەندین کاری تری ناوازەی وەك ئەمانەی ئەنجامداوە. جا بۆ ئەو کەسانەی چاویان کوێرە لە ئاستی چەرخی بەختەوەری، دوورگەی عەرەبی دەدەین بە نێو چاویاندا. با بڕۆن و سەدان فەیلەسوف لەگەڵ خۆیان ببەن، سەد ساڵیش کار بکەن، داخۆ دەتوانن یەك لەسەر سەدی ئەوەی ئەو زاتە لە یەك ساڵدا بە گوێرەی ئەو سەردەمە ئەنجامیدا، ئەنجامیبدەن؟

"خووە خراپەکانی ئەو سەردەمە وەك خووگرتن بە جگەرە کێشان نەبوون، بگرە زۆر لەوە خراپتربوون. مرۆڤەکانی ئەو سەردەمە هەموو وەك مۆرفینکێش و هێرۆینکێش و مەست و خوماری خراپەکارییەکانیان لێ هاتبوو. نەخۆشییە دەروونی و کۆمەڵایەتییەکان وەها هەموو بوونی تەنی بوونەوە کە گەر وازیان

لێبهێنانایە هاوسەنگی و دروستی جەستەیان تێکدەچوو. هەروەك حاڵی توشبووانی مادده بێهۆشکەرەکان کە کاتی وازهێنان قاچ و دەستیان دەبەستنەوە و ئەوانیش دەست دەکەن بە هاوارو و ناڵە و خۆ بە ئەملاولادادان. لەو سەردەمەدا هەمووان بەم شێوەیە بوون. جیاکردنەوەیان لەم خووە خراپانەی تێکەڵ بە خوێنیان بووبوو ئەوانی توشی شێتی دەکرد. خوای گەورە، بەو پێغەمبەرەی لە نێو ئەو کۆمەڵگەیەدا دەڕیا دەیوت "سەرباری هەموو شتێك، تۆ ئەو پەیامەی پێت گەیەنراوە بیگەیەنە"[1] و ئەم پەیامەی پێ دەگەیاند "ئەمە داخوازیی ئەم پایەیەی تۆیە".. هەموو پایەیەك بەگوێرەی خۆی پێویستی بە هەڵوێست و وەستانێك هەیە، ئەگەر هەڵوێستی خۆت بەڕوونی نیشان نەدەیت و ئەوەی پێویستە بەئەنجامی نەگەیەنیت ئەوا ئێمە ئەو پایە مەزنەت لێ وەردەگرینەوە".

پێغەمبەری خوا، لە لایەکی دیکەوە بەهۆی ئەو پەیامەوە کە هێنابووی گەل و هۆز و بگرە نزیکترین خزمەکانی خۆیشی بووبوونە دوژمنی. بۆ نموونە پێغەمبەری ئازیز بە منداڵی زۆرجار دەچووە ماڵی ئەبولەهەب، ئەبولەهەب و خێزانەکەی لە باوەشیان دەگرت و دەیان لاواندەوە و یارییان لەگەڵ دەکرد، جاریەکەشیان کە ناوی "سوەیبە" بوو شیری دەدا بە پێغەمبەری خوا. بەڵام کە پەیامەکەی ڕاگەیاند ئەبولەهەب و خێزانەکەی بوو "ئەلەدوولخیصام - سەرسەختترین دوژمنی". ئەم دوژمنایەتییە لەسەر ئاستی تاکەکان چۆن بوو لەسەر ئاستی هۆز و وڵاتیش بە هەمان شێوە بوو، چواردەوری پێغەمبەری سەرووەرمان بە دوژمن تەنرا بوو، دەوڵەتە زلهێزەکانی جیهانیش هەر کە لە پەیامەکەی بەئاگابوون ڕووبەڕووی وەستانەوە. پێغەمبەری خوا هێشتا لە ژیاندا بوو کە سوپای بیزەنتی تا دەرگاکانی مەدینە هات بۆ لەناوبردنی ئەم پەیامە.

---

١. المائدة: ٦٧.

بەڵێ، بە چواردەوری پێغەمبەردا (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَیْه) کۆمەڵێکی زۆر بازنەی بەیەکداچوو لە دوژمنی ترسناکی ناوخۆیی و دەرەکی هەبوون. ستراتیژیەتی هەریەك لەمانە و شێوازی دوژمنایەتی و بەربەرەکانێ و فێڵ و تەڵەکەیان هەریەکە لەوی دی جیاواز بوو. لەلایەك بەردیان دەگرتە ئەو سەروەرە و لەلایەکی دی ژەهریان دەکردە نێو خواردنەکەی و لە شوێنێکی دیکەوە بە شمشێر ڕووبەڕووی دەبوونەوە و دەیانویست بیکوژن و چەندان و چەندان ڕێگای تریان بۆچاڵ بۆ هەڵکەندن و لەناوبردنی ئامادە دەکرد. بەڵێ، بۆمرۆڤێکی لەم شێوە کە چواردەوری بە دوژمن و دوژمنایەتی تەنرابوو، پەیامێکی دڵنیاکردنەوە و دڵنەوایی لە سەرچاوگی بەرنامەکەوە و لەلایەن پەروەردگارەوە دەنێررا، نەمگوت "ئەو پێویستی بەو پەیامی دڵنیاکردنەوە و دڵنەواییە بووە" بەتایبەت و بە مەبەست ئەمەم نەگوت، نەشمگوت پەیامێکی لەم شێوە پێویست بوو بنێردرێت. چونکە بونیادی پێغەمبەری ئازیزمان ئامادەیی ئەوەی هەبوو بەسەر ئەم سەختیانەدا سەربکەوێت. بە مۆڵەت و یارمەتیی خوایی و بەپشت بەستن و خۆدانە دەست خوا ئەو دەیتوانی تەواوی ئەم سەختیانە تێپەڕێنێت. بەڵام وەك ئاوڕدانەوەیەکی خوایی و دڵدانەوەیەك لە بارەگای بەرزییەوە ئەمەی فەرموو "پەروەردگار، دەتپارێزێت لە شەڕی ئەوانەی دەیانەوێت زیانت پێ بگەیەنن"[١].

## مژدەی نێو ئایەتەکە

ئەم ئایەتە مژدەی ئەوەی دەدا کە "تۆ ئەرکەکەت بە جێ بهێنە، ڕەنگە کەسانی تر ناڕەحەتی و سەخڵەتی بیانگرێتەوە، بەڵام تۆ ناڕەحەت مەبە و بیری لێ مەکەرەوە. خوا بەڵێنی داوە کە تۆ بپارێزێت. پەروەردگارت ڕێگەی ئەوانە

١. المائدة: ٦٧.

دەگرێت کە دەیانەوێت دەستت بۆ درێژبکەن و خراپەت بەرامبەر ئەنجام بدەن. دوژمنەکانت ناتوانن دەستیان پێت بگات، هەرکەس بە نیازی خراپەکردنەوە بەرەو ڕووت بێت لەسەر ڕێگەی ڕاست و بێ پێچ و چاڵ سەراسیمە و سەرلێشێواو دەبێت. بێ گومان بە پەروەردگارت لە شەڕی مرۆڤ و جنۆکە دەتپارێزێت". جاخۆ سەروەرمان خۆی نموونەی هەرە مەزنی تەوەککول (پشت بە خوابەستن) و تەسلیمییەت (خۆدانە دەست خوا) بوو. بگرە ئەوگەیشتبووە پایە و ئاسۆی "تەفویض" جێهێشتنی دەرئەنجامی هەموو کارێك بۆپەروەردگار. لە سۆنگەی پتەوکردنی متمانەوە خوای گەورە پێی دەفەرموو "بێ گومان بە کە پەروەردگارت هەرگیز بە تەنیا جێت ناهێڵێت، تەنانەت لەو کاتەشدا کە هۆکارەکان بە تەواوی دەستەوسان دەبن و بە بنبەست دەگەن". ئیدی " ئەم پاڵەوانەی متمانە کردن بە پەروەردگار" لە دوای دابەزینی ئەم ئایەتە مۆڵەتی ئەو هاوەڵانەشی دا کە شەوانە پاسەوانییان لە چادرەکەی ئەو دەکرد و هەتا کۆتایی تەمەن بێ پاسەوان ژیا.

متمانە و دڵنیایی ئەو (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەرامبەر پەروەردگاری لە ئاستێکدا بوو کە لە کاتی هیجرەت کردنیدا، پاش ئەوەی لەگەڵ حەزرەتی ئەبوبەکر لە ئەشکەوتەکە هاتنە دەرەوەوە و بەرەو مەدینە بەرێکەوتن ڕووبەڕووی پیاوێکی ئازاو تیرهاوێژێکی شارەزای وەك "سوراقە" بوونەوە کە بە تایبەت لەلایەن قوڕەیشییەکانەوە نێردرابوو تا لە بەرامبەر خەڵاتێکی خەیاڵیدا پێغەمبەر و هاوەڵەکەی بدۆزێتەوە و بیانکوژێت. ئەوەبوو حەزرەتی ئەبوبەکر ترسی لێ نیشتبوو و دەترسا شتێك بەسەر پێغەمبەردا بێت. بەڵێ تەنانەت لەو ساتە سەختەشدا پێغەمبەرمان بەوپەڕی متمانەوە هەمان ئەو وشانەی بۆحەزرەتی ئەبوبەکر دووبارە دەکردەوە کە لە ناو ئەشکەوتەکەدا ئەوکاتەی کافرەکان تا دەمی دەرگای ئەشکەوتەکە هاتبوون فەرموویووی:

﴿لَا تَحْـزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا﴾ (التوبة: ٤٠)

واتە: "خەم مەخۆ و مەترسە، پەروەردگار لەگەڵ ئێمەیە".ئەوە بوو تەماشایەکی سوراقەی کرد و لەولاوە قاچی ئەسپەکەی سوراقە نیشتە نێو خاك و نەیتوانی بەرەو پێغەمبەر بێت، پاشان هەرچۆن بوو ڕزگاری بوو، دووبارە شوێن پێغەمبەر گیان و حەزرەتی ئەبوبەکر کەوتەوە، ئەمجارەش قاچی ئەسپەکەی نوقمی خاکەکە بوویەوە و لە شوێنەکەشیانەوە ڕەشاییەکی وەك دووکەڵ هاتە دەرەوە. ئیدی سوراقە تێگەیشت کە نە لە دەستی ئەو و نە لە دەستی کەسی تر نایەت زیان بە پێغەمبەری مەزن بگەیەنێت. بۆیە داوای ئەمانی لە پێغەمبەری خوا کرد و ئەویش پێیدا. پاشان پێغەمبەر پێی فەرموو "بگەڕێرەوە و کارێك بکە کەسی دیکە شوێنمان نەکەوێت"[١].

## سەروەرمان و میراتگرانی بانگەوازی پێغەمبەرایەتی

لە ڕاستیدا تەواوی ئەو شتانەی جەنابی حەق لە ژیانی پێغەمبەری سەروەرماندا بەر چاوی خستوون، بۆمیراتگرانی بانگەوازی پێغەمبەرایەتی نموونە گەلێکی بەرجەستە و وێنە گەلێکی هەردەم شایانی بیرلێکردنەوەن. قورئانی پیرۆز ژیانی پێغەمبەرە مەزنەکانی پێشووی هەریەکە وەك تابلۆیەك و وەك نموونەیەك بەرچاو خستووە. بۆ نموونە لە ئایەتی چواری سورەتی "مومتەحینە" دەفەرموێت:

﴿قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِيٓ إِبْرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ إِذْ قَالُوا۟ لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَءَٰٓؤُا۟ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةُ وَٱلْبَغْضَآءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥٓ إِلَّا قَوْلَ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ وَمَآ أَمْلِكُ لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ ۖ رَّبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ﴾ (الممتحنة: ٤)

---

١. البخاري، المناقب ٢٥، فضائل الصحابة ٢، مناقب الأنصار ٤٥؛ مسلم، الزهد ٧٥.

واتە "ئەی ئیمانداران، بەڕاستی لە ئیبراهیم و ئەوانەی کە لەگەڵیدا بوون نموونەیەکی چاکتان خراوەتە بەرچاو، کاتێك کە بە قەومەکەی خۆیانیان وت: دوای ساڵەها بانگەواز، ئێمە بەرین لە ئێوە و لەو شتانەش کە لەجیاتی خوا دەیپەرستن، ئێمە باوەڕمان بەو دین و ئاینەی ئێوە نیە، ئیتر دوژمنایەتی و ڕقەبەرایەتی لە نێوانماندا بەرپا بووە تا ئەو کاتەی کە باوەڕ بە خوای تاك و تەنها دەهێنن، جگە لەو بەڵێنەی ئیبراهیم دای بە باوکی و وتی: بێگومان داوای لێخۆشبوونت بۆ دەکەم، دەسەڵاتی خوایشم نیە ئەگەر کارەساتێکت بەسەر بهێنێت، ئینجا وتی: پەروەردگارا، هەر پشتمان بە تۆ بەستووە و هەر بۆ لای تۆش گەڕاوینەتەوە، سەرەنجامیش هەر بۆ لای تۆیە".

نموونەی حەزرەتی ئیبراهیم و هاوەڵەکانی جۆرێکە لە شۆڕش و وەستانەوە بەرامبەر نادادی و ستەم وکوفر، وەك نموونەی هاوەڵانی ئەشکەوت. چەندین نموونەی تری وەك ئەمانە لە ئایەتەکانی قورئاندا باسکراوە و بە هۆیانەوە ئاماژەی ڕێ بە باوەڕداران دراوە.

هێندە هەیە کە بۆ ئەوەی بتوانین بە دروستی لە سەرگوزەشتەی ژیانی ئەو پێغەمبەرانە تێبگەین و سوودی دروست لە ژیانیان ببەین، دەبێت زۆر بەباشی شارەزای حەقیقەتی ئەحمەدیی بین. ئەگەر ژیان و شێوازی بەرجەستەکردنی ئاین لای سەروەرمان نەکەینە پەنجەرەی ڕوانین و گۆشەنیگای نیشانە گیریمان، ئەوە ناتوانین بە دروستی لەو نموونانە تێبگەین کە لە ڕێگەی باسکردنی ژیانی پێغەمبەرانی دیکەوە هێنراونەتەوە. بۆنموونە گەر وانە بێت ڕەنگە تێگەیشتنێکی زۆر جیاواز لە ڕاستی بۆ هەڵهاتنەکەی حەزرەتی موسا بکەین. تەنها کاتێك ژیانی حەزرەتی محمد (صَلَّى اللهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) دەکەینە پەنجەرەی ڕوانین و لە شێوازی بەرجەستەکردنی پیرۆزی ئەوەوە بۆ ڕاستیە ئاینییەکان دەڕوانین، ئەوکاتە

بە دروستی لە مەبەستەکە دەگەین. بە هەمان شێوە لێکدانەوەی دروست بۆ ژیانی حەزرەتی داود و خوێندنەوەی بێ کەم وکوڕی بۆ ژیانی حەزرەتی مەسیح هەر لەم سایەیەوە بەدی دێت.

بۆیە دەڵێین لە ژیانی حەزرەتی ئیبراهیم و حەزرەتی نوح و حەزرەتی صالیح دا زۆر وانەی گرنگ بۆ ئێمە هەیە. بەڵام بۆ ئەوەی بتوانین ئەم وانانە وەك کاڵایەکی پڕ بە پێست و باڵای خۆمان لە خۆ بگرین و ڕۆح و ویژدان و هەست و تەواوی لەتایفە ماددی و مەعنەوییەکانمانیان پێ بڕازێنینەوە، دەبێت بە گوێرەی ئەو ئەندازە و پێوەرانە لێیان بڕوانین کە حەزرەتی محمد بۆی دیاری کردوون. لەم ڕوانگەوە، بەدەربڕینی فەیلەسوفانی دێرین "اولا و بالذات" یەکەم و باشترین نموونە و پێشەنگ و ڕابەری کامڵ بۆ ئێمە حەزرەتی محمدە (عَلَيهِ أَفضَلُ صَلاةٍ وَسَلام) پاش ئەو لە پێغەمبەرەکانی دیکەش وانە وەردەگرین، بەڵام لە ڕێی ئەوەوە (صَلَّىَ اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) وەریدەگرین. واتا لە نێوانماندا ئەو هەیە. بەگوێرەی لێکدانەوە و لە ڕوانگەی تێگەیشتنی ئەوەوە، لە ژیانی ئەوان تێدەگەین و سودیان لێوەردەگرین.

بەڵێ، گەر بێینەوە سەر بابەتە بنەڕەتییەکەمان دەڵێین، سەروەرمان بۆ ئێمە نموونەیەکی پێشەنگە. پارێزراویشی لە دەمی بانگەوازدا بۆ بەرنامەی پەروەردگار دووبارە بۆ ئێمە نموونەیە. ئەگەر ئێمەش خۆمان لەو پایەدا ببینینەوە کە هەندێك شت بۆ کەسانی دی باس بکەین و بە دیوێکدا دەرك بە هەندێك نیعمەت بکەین کە پێمان بەخشراوە، ئەوە دەبێت مافی ئەم دەرك و مافی ئەم نیعمەتانە بدەین. بۆ نموونە، ئێوە توانای ئاخاوتنتان باشە. واتە زۆر بە ئاسانی دەتوانن مەبەستی نێو دڵتان بۆ گەیاندنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بگەیەننە دوێنراوەکانتان. برایەکیشتان توانای نووسینی باشە و کاتێك قەڵەم بەدەستەوە بگرێت دەتوانێت زۆر بە جوانی هەست و بیرکردنەوەکانی بخاتە سەر کاغەز. زۆر بە ئاسانی دەتوانێت بنووسێت

و نووسینەکانیشی دەبنە جێی ڕەزامەندیی خوێنەرانی. ئەمانە کۆمەڵێك بەهرەی سەرەتاییین. بەهرە سەرەتاییەکان، لوتف و چاکەی خوای پەروەردگارن. ئەم بەهرە سەرەتاییانە داخوازی سوپاسگوزارین لە جۆری خۆیان. ئەم سوپاسگوزارییەش لە شێوازی باسکردن، نوسین، دەربڕینی مەبەستی ناخ و بەم شێوەیە بەکارهێنانەوە و نیشاندانەوەی نیعمەتەکە دەبێت. جا کاتێك بەهرەیەکی سەرەتاییتان هەبێت و ویست و هیممەتتان بۆ بەکارهێنانی ئەو بەهرەیە بەکاربخەن و هەوڵ بدەن بەرهەمێك بخەنە مەیدان کە سوودبەخش بێت و لە ڕێیەوە مافی ئەو پایە بدەن کە پێتان دراوە، ئەوا هەمیشە ئەگەری ئەوە دەبێت کەسانێك پەیداببن چاویان پێتان هەڵنەیەت و هەوڵبدەن زیانتان پێ بگەیەنن و خراپەتان بەرامبەر بکەن.

بەڵێ وەك مامۆستا بەدیعوززەمان دەڵێت "براکانم ئێمە لە ژێر عینایەت و چاودێری خوایی داین، بە یارمەتی و سۆزی ئەو هەرگیز دەستی دوژمنانمان پێ ناگات"[١]. جا گەر ئێوە هەوڵ بدەن ئەرکی سەر شانتان بە باشی جێبەجێ بکەن ئەوا خواش لە خراپەی خراپەکاران و نیەتی چەپەڵ و فێڵ و تەڵەکەکانیان دەتانپارێزێت. گەر ئەم بەڵێنە بۆ سەروەرمان وەك دڵدانەوەیەکی ئیلاهی بوویێت کە ئەوی گەیاندە پلەی متمانەی تەواوەتی. ئەوا بۆ ئێمە ئەمە سەرچاوەیەکی بەهێزی دڵدانەوە و کانگای دەستکەوتنی متمانەیەکی پۆڵاینە بە خوای خۆمان، چونکە ئێمە پێویستی و ئاتاجیمان بەم دڵدانەوە و بەڵێنی پاراستنە هەیە. دەزانن تا چ ڕادەیەك پێویستمانە؟! تا ئەو ڕادەیەی کە بتوانین لە ڕێیەوە بگەینە تەوەککول و تەسلیمیەتی تەواوەتی، چونکە ئێمە لاوازین و ئەو توانایی و حاڵەتە ڕۆحیەی سەروەرمان نییە کە بەرگەی هەموو سەختی و چیلە و ناڕەحەتییەك بگرین.

تەماشای ئەو حاڵەتە ڕۆحیە بەرزە و ئەو متمانە لەبن نەهاتووەی شانازیی

١. بەدیعوززەمان، پاشبەندی ئەمیرداغ -١-.

مرۆڤایەتی بکەن... یەکێك لە سەرۆك هۆزەکان بە ناوی "غەورەثی کوڕی حارث" بەبێ ئەوەی کەس بیبینێت تا سەر سەری پێغەمبەری خوا دێت، بەمەبەستی شەهیدکردنی شمشێری لێ هەڵدەکێشێت و پاشان لێی دەپرسێت "ئێستا کێ تۆ لە دەستی من دەپارێزێت؟" لە وەڵامدا گوێی لە دەنگێکی هێندە بەگوڕ دەبێت کە خەریکە هەموو بوونەوەر بهەژێنێت "الله" لە بەرامبەر دەنگی بە گوڕی و دڵی نەترس و پڕ متمانەی پێغەمبەری خواوە غەورەث وەك ئەوەی لە جیهانی غەیبەوە چەپۆکێك لە پشتی درابێت شمشێرەکەی لە دەست دەکەوێتە خوارەوە و دەکەوێتە سەر زەوی. ئەم جارە پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) شمشێرەکە هەڵدەگرێت، ڕووی تێدەکات و پێی دەڵێت "ئەی ئێستا کێ تۆ لە دەستی من دەپارێزێت؟!"، بەڵام لە دواییدا بێ ئازاردان لێی خۆشدەبێت و ئازادی دەکات. بەڵێ، بێگومان گەر ئێمەش بەهرە سەرەتاییەکانمان بە باشی بە گەڕ بخەین و ئەرکی سەرشانمان بەجێ بگەیەنین، لەمپەر و ڕێگری جۆراوجۆر دەخرێتە سەر ڕێمان. قەدەری ئەم ڕێیە سەختی و نارەحەتی و چیلە و خەمی مرقەددەسە، بەڵام نابێت هەرگیز بیرمان بچێت کە ئێمە لە ژێر چاودێری و پاراستن و بەزەیی خوای گەورەداین. تەنها پێویستە متمانەمان بەرامبەر بەو تەواوبێت و ئەو پێویستییانەی داواکراوە بۆ چوونە نێو بازنەی چاودێری و پاراستنی خوایی لە خۆماندا دەستەبەر بکەین. واتە ئەگەر بڕیاربێت کۆمەڵە کەسانێکی تایبەتی بخرێنە نێو بازنەی چاودێری و پاراستن و یارمەتی خواییەوە. بۆ نموونە وەك کەسە وەفادارەکان، کەسە ڕاستگۆکان. کەسە خۆ بۆ بانگەواز تەرخانکردووەکان، قارەمانە بەڕووی گوناهدا داخراوەکان و ...هتد ئەوا ئێمەش بێین و ئەم پەسنانە لە خۆماندا ڕەنگ پێ بدەینەوە و خۆمانیان پێ بڕازێنینەوە تا بخرێینە نێو ئەو بازنە شکۆمەندەوە. جا گەر لەم ڕێیەدا شتێکی پێچەوانەمان توش بوو یاخود پاراستنی ئیلاهیمان نەبینی و هەستمان پێ نەکرد ئەوە دەبێت بیگەڕێنینەوە بۆ

کەموکوڕی خۆمان و بەدەست نەهێنانی ئەو ئاستەی پێویست بوو بەدەستی بهێنین ئەوە نیشانەی ئەوەیە قەڵغانەکەمان کونی تێدایە یاخود شمشێرەکەمان شکاوە، یاخود تیر لە نێو تیردانەکەماندا نەماوە. ئەو پیاوە کە دەگەڕێتەوە بۆ لای هۆزەکەی هەمووان بە سەرسامییەوە لێی دەپرسن "چی بوو؟! چیت بەسەر هاتووە؟! بۆ هیچ کارێکت نەکرد؟!" ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت "من ئێستا لە لای باشترین کەسی نێو گرۆی مرۆڤەوە دێمەوە"[١] بەڵێ زۆر گرنگە مرۆڤ چەندە بەهێزە هێندەش لێبوردەبێت. پێغەمبەری خوا کاتێك هێزی هەبوایە مافی ئەو هێزەی دەدا و بەکاری دەهێنا، کاتێکیش هۆکارەکانی هێزی دەرەکی بەدەستەوە نەبوایە پەنای بۆ "سەرچاوەی سەرەکیی هێز" دەبرد کە پەروەردگاری بەهێز و بەتوانایە و یەکسەر جبەخانەی"لاحول ولا قوە الا بالله"ی دەخستە کار.

بەڵێ، ئەم ڕووداوە نیشانمان دەدات کە ئەو خاوەنی متمانەیەکی وەها بوو کە زۆر زۆر لە سەروو مەقامی تەوەککولەوەیە و ئەو ئایەتەش کە باسکرا بۆ ئەو دڵدانەوەیە کە لەم ئاسۆ بەرزەی متمانەدا. بەڵام ئەمە بۆ ئێمە بانگەوازێکە بۆ گەشتن بە مەقامی تەوەککول و پێمان دەڵێت "پشت بە خوا ببەستن و مەترسن، خوا بەسە بۆ پشتیوانیتان". گەر یارمەتیدەرتان دەوێت خواتان بەسە، گەر دۆستیشتان دەوێت ئەو دۆستە هەمیشەییەتان بەسە.

لەم ڕوانگەوە پێویستە زۆر بە باشی ڕەچاوی ئەم دوو خاڵە بکەین، یەکەم: بڕۆینە نێو ئەو بازنە پیرۆزەوە، واتە لە نێو بازنەی ئیخلاسدا لەگەڵ دڵسۆزان و ڕاستگۆیان و وەفاداران و فیداکاراندا جێ بگرین. دووەم: زۆر متمانەمان بە پەروەردگارمان بێت، بەوپەڕی متمانەوە ئەرکی سەرشانمان بە باشترین شێوە بەجێ بهێنین.

مامۆستا بەدیعوززەمان لە باسی موعجیزەکانی سەروەرمان و قورئانی

---

١. أحمد بن حنبل، المسند ٣/٣٦٤، ٣٩٠؛ إبن حبان، الصحيح ٧/١٣٨.

پیرۆزدا ئەم ئایەتە پیرۆزەی باسەکەی ئێمەی هێناوە. با ئێمەش لێرەدا ئەم بابەتە بەگوێدانە وشە بەنرخەکانی ئەو بە کۆتا بگەیەنین.

"بەڵێ، ڕەسولی ئەکرەم (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيمِ) کاتێك پەیامەکەی ڕاگەیاند، تەنها لە بەرامبەر یەك هۆز و یەك گەل، کۆمەڵێك ئەهلی سیاسەت یاخود یەك دینەوە نەوەستایەوە، بەڵکو بە تەنها خۆی مەیدانی لە تەواوی پادشایان و تەواوی خاوەن ئاینان گرت. لە کاتێکدا ئەو لەلایەن مامی خۆی و هۆزەکەی خۆیەوە دوژمنایەتی دەکراو سەرباری ئەوەی بە درێژای بیست و سێ ساڵ چەندین جار ڕووبەڕووی پلانی شەهیدکردن بوویەوە. بەڵام گیان سپاردنی ئەو بێ پاسەوان و ئێشکگر و بەوپەڕی ئاسودەییەوە لەسەر دۆشەکەکەی گیانی سپارد، ڕاستی عیصمەت و پارێزراوییەکەی سەلماند و وەك خۆر نیشانیدا کە ئایەتی "و الله یعصمك من الناس" چەندە حەقیقەتێکی بەهێز دەردەبڕێت و چەندە خاڵێکی پتەوی پشت پێ بەستنە."[١]

## بزاوتن و ژیانی دڵ

پرسیار: هەندێك کەس بەردەوام لە هەوڵی خزمەتکردندان بە گەل و نیشتیمانەکەیان، بەڵام لە ڕواڵەتدا زۆر گەرموگوڕ نین لە بەندایەتی و پەرستشدا. لە پەنا ئەمانەدا کەسانێك هەن کە بە ڕووی دونیای مەعنەویدا کراوەن و قوڵاییەکانی ناخ تەی دەکەن، بەڵام بە ڕووی دونیای دەرەوەدا تا ڕادەیەك داخراون. کام لەم دووانە زیاتر پەسەند کراون؟

وەڵام: هەریەك لەمانە کۆمەڵێك سیفەتی جوانی لەیەکجیان. هەریەك خاوەنی

١. بەدیعوززەمان، مەکتوبات.

جێگەیەکی تایبەتن و دەتوانن ببنە هۆی بەختەوەری مرۆڤ. بەڵام باشترین و کامڵترین ڕێباز ئەوەیە هەم پەیوەندیی نێوان خۆمان و پەروەردگارمان لەوپەڕی دروستیدا بپارێزین و هەست بە ڕێژنەکانی ڕەحمەتی بکەین و وەك پێشتر باسکرا بەردەوام بە تاسەی پەرستش و یادی ئەوەوە بژین، هەم ئەندێشەی ئەوەمان بێت کە من دەبێت چ کارێك بکەم تا ئەم پەروەردگارەی بە نیعمەت و بەخششەکانی منی پەروەردە کردووە، بە خەڵك بناسێنم و لایان خۆشەیست بکەم. بەو شێوەیە مرۆڤی هەمەگیر (جامع) واتە ئەو مرۆڤەی کە زۆر تایبەتمەندی لە خۆدا کۆکردۆتەوە، دروست دەبێت. مرۆڤی کامڵیش هەر لە ناو ئەم جۆرە کەسانەدا دەردەکەوێت. واتە لە ڕوانگەی ژیانی ڕۆحی و قەلبیەوە، لە ڕوانگەی سیرڕ و خەفی ئەخفایەوە، لە ڕوانگەی هەستە ناسکە دەرەکی و ناوەکیەکانیەوە (لەطائیفی ظاهیری و باطینی)یەوە هەمیشە لە یەك خاڵدا دەوەستێت و سەرکەوتووانە لە بەرامبەر خوادا هەڵوێستێکی جێگیر دەنوێنێت. ئەو کەسانەی کە تەنها یەك لایەنی ژیان بگرن، ناتوانن ببنە کەسی هەمەگیر و پاشان کامڵ.

دیوێکی تری بابەتەکە ئەوەیە سروشتی هەندێك لە مرۆڤەکان بە ڕووی ڕێژنە میتافیزیکیەکاندا کراوەیە. لە کاتێکدا هەندێك مرۆڤی تر توانای بانگەوازی خەڵکی دیکە و ڕێنوێنی کردن و بەرەو خوا وەرچەرخاندن تێیاندا لە پێشترە. لە سروشتی هەندێکدا یەکەم هەیە و ئەوی دیکە نییە. لە سروشتی هەندێکی دیکەشدا بە پێچەوانەیە. بێگومان خوای باڵادەست گەر بیەوێت گۆڕان لە سروشتەکاندا دەکات. واتە کەسی وا هەیە بەردەوام دەستەویەخەیە لەگەڵ تاریکییەکانی بێباوەڕی و کوفردا و شەو و ڕۆژ خەبات دەکات بەرامبەریان، بەڵام لەولاوە زۆر خۆی پشتگوێ خستووە و پەرستش و بەندایەتی، ئەوراد و ئەزکار، شەوانە هەستان، گەر بۆ چەند ساتێکیش بوویێت، سەر لەسەر بەرماڵ

دانان، تا ڕادەی نەبوون کاڵ و کەم ڕەنگە لە ژیانیدا. بەڵام گەر خوا بیەوێت سروشتەکان دەگۆڕێت، بارێك بۆ بارێك هەڵدەگێڕێتەوە. ئەمە بۆ ئەو زۆر ئاسانە، بۆیە هەمیشە ئەم دوعایە دەکرێت کە وەك دوعای "مەئسورات" دەدرێتە پاڵ سەروەرمان - هەرچەندە من لە نێو دوعا قورئانیەکان و سەرچاوەکانی سوننەتدا بەرچاوم نەکەوتووە - "یا محول الحال و الأحوال، حول حالنا الی أحسن الحال"[1] "ئەی پەروەردگاری بار بۆ بار گۆڕێنم، بارمان بگۆڕە بۆ باشترین بار".

ئەوەی لەسەر ئێمە پێویستە جوان ڕوانین و جوان بینینە. بە شێوەیەك کە دەبێت لامان وابێت ئەو کەسانەی بێ سکاڵا کردن لە دەست سەختییەکان و بێ وتنی ئەوەی "ئەم کارە بۆچی بەم شێوە شێواوە؟" بە گیان و ماڵ کۆشش دەکەن و خزمەتی گەل و نەتەوەکەیان دەکەن، لە هەموو کەموکوڕییەك پاك بوونەتەوە. چونکە ئەم حاڵە لای پەروەردگار زۆر بەنرخ و مەزن تەماشا دەکرێت و کارێکی وەهایە کە تەواوی کەموکوڕییەکان پڕ دەکاتەوە.

گەر حاڵی هەندێك لە زاتە مەزنە تایبەتەکان پەرگیر بکەین، چێژی پەرستش لای مرۆڤ دەکرێت بگۆڕێت و کەلێنی تێبکەوێت. گەرچی کەلێنەکانی ئاسمەمەندی بۆ پەرستش لای هەندێك لە کەسەکان دەکرێت بچووك بێت، بەڵام لای مرۆڤە زۆر کامڵەکانیش ئەگەری دروستبوونی کەلێنی لەم شێوەیە هەیە، ئەمە نابێت بە هەڵەماندا ببات. بۆ نموونە کەسێك کە هەرگیز شەونوێژی نافەوتێت، هیچ شەوێك بەشداریکردنی ئەم خوانە ئاسمانییە پشتگوێ ناخات و گەر لە کیسی بچێت لۆمەی خۆی دەکات، ڕەنگە هێشتاش نەتوانێت بەردەوام ئامەزرۆیی لە هەمان ئاستدا بهێڵێتەوە. جاری وا هەیە ڕەنگە بگاتە حاڵێك کە خەریکە ویست و ئارەزووی ئەو پەرستشە لە لای نزیکی نەبوون ببێتەوە. جا لێرەدا

---

١. بڕوانە: فەتحوڵلا کولەن، القلوب الضارعة.

مرۆڤ دەبێت خاوەنی بڕیار و پێداگری بێت و وەفاداری نیشان بدات.

بە شێوەیەکی ئاسایی خواوەند ئیرادەی مرۆڤی بەلاوە زۆر گرنگە. وە بایەخێکی زۆری بۆ وەفای ئەو داناوە، وەفای مرۆڤی وەك خاڵێکی پەیماننامەی وەفاداریی خۆی داناوە لەگەڵ ئێمەدا. ئەواتا دەفەرموێت "وَأَوْفُوا بِعَهْدِي أُوفِ بِعَهْدِكُمْ" واتە "لە پێشدا ئێوە پەیمانەکەتان بەرنە سەر تا منیش پەیمانی خۆم بەرمە سەر" ئەمە نیشانەی نرخ دانانیەتی بۆ مرۆڤ. واتە تۆ هەنگاوەکەت بنێ من وەڵامت دەدەمەوە و هەنگاو بەرەو ڕووتدەنێم. بە پێچەوانەوە ئەمە ناکرێت وەك داخوازی و بەرپرسیارێتییەك تەماشا بکرێت. هەروەك ئەو ئایەتەی دەفەرموێت "فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ"، جا لێکدانەوەی جۆراوجۆر بۆ دەربڕینی "فَاذْكُرُونِي" یادی من بکەن، کراوە " بە پەرستش و گوێڕایەڵی یادی من بکەن، تا منیش بە لوتفەکانم یادی ئێوە بکەم. ئێوە بە سوپاسگوزاری ئەو نیعمەتانەی پێم بەخشیون یادی من بکەن تا منیش بە بەخشینی نیعمەتی نوێ یادی ئێوە بکەم. لەسەر زەویدا ئێوە لە چوارچێوەی ئەرکەکانی سەر شانتاندا یادی من بکەن، تا منیش لە لای دانیشتوانی "مەلەئی ئەعلا" یادی ئێوە بکەم". ئەمە بەهادانانە بۆ ئێوەی مرۆڤ. قەبوڵکردنی ئیرادەی ئێوەیە وەك بنەمایەك بۆ کارە سوبحانییەکانی خۆی. تێگەیشتن لەمە وەك ئەوەی وترابێت "ئێوە ئەم بێگارە ئەنجام بدەن، تا منیش یادتان بکەم"، بێ ڕێزییە بەرامبەر جەنابی حەق. دەبێت وەك دیمەنی ئەو دایك و باوکە لەمە تێبگەین کە بە منداڵەکەیان دەڵێن: "دەی شەقێك لەو تۆپە بدە تا بتخەمە سەر شانم" بەڵێ نموونەی ئەم دووانە وەك یەکن - وللە المثل الأعلى.

نیشاندانی پەیوەندیی پەروەردگار بە بەندەکانییەوە بەوەی پەیوەندییەکی نەرم و دۆستانەیە و بەخاتری بەندە داڕێژراوە، کە هەر واشە، زۆر گرنگە و داخوازیی ڕێزداریمانە بەرامبەر بە ئەو. پێویستە هەوڵبدەین تەواوی ڕووداوەکان بەو چاوەوە

تەماشا بکەین کە بەخاتری باشەی ئێمەیە و بە جۆرێك بەرنامە ڕێژیی کراوە کە سود بە ئێمە بگەیەنێت. گەر هەر جۆرە تێگەیشتنێکی هەڵە یاخود نادروست لەم بابەتەدا هەبێت دەبێت ڕاست بکرێتەوە. وەگەرنا دەکەوێتە ناو زۆنگاوی کەموکوڕی کردن بەرامبەر پەروەردگارمان. چونکە ئەو لە دایك و باوکیش بۆمان میهرەبان ترە. لێرە وادەڵێین میهرەبانترە چونکە هیچ دەربڕینێکی تر شك نابەین کە لە پلەی باڵا بەرزتربێت، پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بەهەمان شێوە بەکاری هێناوە "اَللّٰهُ أَرْحَمُ..." "خوا لە ڕەحمی دایك بۆ منداڵەکانی زیاتر بە ڕەحمە بۆ بەندەکانی...."[1]، ئەمە بەرتەسکی وشەکانی ئێمەی مرۆڤە. وە گەر نا ناکرێت ڕادەی شەفەقەت و ڕەحمی ئەو بەرامبەر بەندەکانی دابنێین و بەراوردیان بکەین. تەنانەت نەخۆشییە بە ڕواڵەت خراپەکانیش وەك دەفتەرێکی ڕاهێنانن بۆ بەدەستهێنانی ژیانی هەمیشەیی لەم ژیانە بەندەدا. بۆ نموونە نەخۆشییەکی وەهاتان گرتووە کە لەسەر تا پێ دەردەدار بوون،. دەرزییەك لە قۆڵتان دەدرێت کە زریکە لە گیانتان دێنێت، ئازارێکی زۆرتان پێ دەگات و هاوار دەکەن "ئاخ، یارمەتی!" بەڵام لە دەرەنجامدا بە کاریگەری ئەو دەرزییە نارەحەتییەکەتان کۆتایی پێدێت و چاك دەبنەوە. جا دەبێت هەروەك ئەم نموونەیەش لەو ڕووداوانە بگەین کە بە ڕواڵەت نەرێنی و خراپ دەردەکەون.

حەزرەتی ئوستاز بەدیعوززەمان باس لە فەزیلەتی هەندێك کەس دەکات و دەڵێت "ئەو کەسەم بە شێوازێکی جیاواز دەهاتە پێش چاو، دواتر تێگەیشتم کە نەخۆشییەکی هەیە و دەیشارێتەوە، ئارامگرە لەسەری و دان بە خۆیدا دەگرێت. لە کەسێکی تریشدا کەماڵێکی لەو شێوەیەم دی، دواتر زانیم زۆر بە جوانی خزمەتی دایك و باوکی دەکات."

---

١. البخاري، الأدب ١٨، مسلم، التوبة ٢٢.

# ڕۆحی خۆتەرخانکردن

## ئیخلاس و خۆتەرخانکردن

لوتفی پەروەردگار بەرامبەر ئیخلاسی بەندە لوتفێکی زۆر جیاواز دەبێت. مرۆڤ دەبێت هەموو ڕۆژێك دڵی بە ئاوی بۆ ئەو ژیان بشواتەوە و پاشان دەست بە کارەکانی بکات. تەنانەت نابێت کارە ڕێپێدراوەکان تێکەڵی ئەو کارانە بکات کە بە خاتری خوا ئەنجام دەدرێن.

تۆ هیچ بیر لە خۆت مەکەرەوە. تا وای لێدێت ئەوانی دی بیر بۆ تۆ بکەنەوە. با براکانت بە زۆر قایلت بکەن تا ئاوڕ بە لای چێژ و خۆشییە ڕێپێدراوەکاندا بدەیتەوە. بێ باکانە لە هەوڵدابە، تا ئەو ڕادەیەی کە براو دۆستەکانت بڵێن ”ئیدی بەسە!“ و بە زۆر بەرەو ژووری مارە بڕین پەلکێشت بکەن، "خۆتەرخانکردن" ئەمەیە. خۆتەرخانکردن بۆ خوا بریتییە لەوەی جگە لەو کارانەی لە پێناو ڕەزامەندی خوادا ئەنجام دەدرێن، هەموو شتێکی دی بۆ خۆت بە حەرام بزانیت. لەم پێناوەدا دەبێت لەگەڵ سروشتتدا بجەنگیت. جا ڕێی مۆصعەبیی لێرەوە دەست پێ دەکات، لەم خاڵەدا دەتوانیت ببیتە ئیبنی جەحش. دڵت تەنها بۆ ئەو تەرخان دەکەیت و دەڵێیت ”ئەم دڵە بەیتی هودایە، جێی کەسی دیکەی تێدا ناکەمەوە“.

تەنها ناوی "الله" بڵێنەوە، تا بەرەکەتی کارەکانتان بە چاوی خۆتان ببینن. بە هیچ شێوەیەك خۆتان تێکەڵ بە کارەکە مەکەن. گەر هەموو گیانتان هەوڵدان بێت و خۆتان بپڕوکێنن و زار زار گرییە بکەن، بەڵام دەنگی دڵتان دەنگی ئەو نەبێت و لە ئیخلاس سەرڕێژ نەبن، ئەوە بێ دەنگی و دەم داخستن باشترە بۆتان. تەنانەت گەر لە کاتی وتنی "سبحان الله"شدا بۆتان ڕوون بوویەوە کە ئەوەی دەیڵێن دەنگی دڵتان نییە، لە بڕگەی "سب..."دا بیبڕن و بێدەنگ ببن.

ئەمڕۆ جیهانی ئیسلامی لەگەڵ کارەساتگەلێکی وەها سەختدا ڕووبەڕووە کە دەبێت باوەڕداران هێندە بە کوڵ دوعا بکەن لە تاواندا لە مردن نزیك ببنەوە. وە تەنها کاتێکیش وازبهێنن کە بگەن بەم هەستە "پەروەردگارا! وا چەندین کاژێرە دەپاڕێمەوە، وا ئێستا خەریکە دڵم شەق ببێت. ئیدی گەر لەمە زیاتر سوریم لەسەر پاڕانەوە نیشاندانی بێ متمانەیی دەبێت بە ڕەحمەت و بەخشینی تۆ".

## ئامانج و ئیستیقامەت

دڵێکی باوەڕدار هەمیشە بەم هەست و بیرەوە دەژی "گەر من لە دونیایەکدا بژیم کە نەتوانم ناوی پەروەردگاری تێدا بڵێمەوە و بیگەیەنم بە کەسانی دی، ئەوە مردنم باشترە". لە ڕاستیدا گەر گەیاندنی ناوی ئەو و خۆشویستنی ئەو و لای خەڵکی خۆشەویست کردنی نەبێت، هەر کارێکی دیکە لەم ژیانەدا سەرقاڵ بوونە بە شتی پڕوپوچ و بێ ماناوە. پێویستە سەری هەموو بیرێکی دەرەوەی ئەمە بە کوتەك پان بکەینەوە. هەموو باوەڕدارێك دەبێت بڵێت "ئەم ئاینە ئاینی منە و پێویستە هەستم بە گەیاندنی". موسوڵمان ناتوانێت بە تەنها خۆی بمێنێتەوە، گەر بتانەوێت بە تەنها و هەر بۆ خۆتان بمێننەوە، ئەوە نابود دەبن و

لەناودەچن. تەنها کاتێك کە بەرهەمتان هەبێت، دەتوانن پارێزگاری لە ژیانتان بکەن. گەر بە هەستی دەستخستنی ڕەزامەندیی "جەنابی الله"وە کۆشش نەکەن بۆ ئەنجامدانی خزمەتێکی باش، ئەوا گیان و دڵتان ژەنگ دەگرێت و دەڕزێت.

کەواتە پێویستە ئێمە ببینە ڕووناکییەك بۆ مرۆڤایەتی. گەر هێندەی تینی مۆمێکیش بێت، پێویستە هەوڵ بدەین چواردەورمان بە نووری ئیمان ڕووناك بکەینەوە. ڕووناك کردنەوەی تاریکی تەنها لە ڕێی موسوڵمانێتییەکی باشەوە بەدی دێت. ئێمە وەك مسوڵمانانێکی خاوەن ئیستیقامەت پێویستە بە ڕەفتارە دڵنیایی بەخشەکانمانەوە دەرگای دڵەکان بکەینەوە و بڕۆینە نێویانەوە، ڕەنگە ئەمڕۆ هەندێك لە مرۆڤەکان باوڕیان پێمان نەبێت، ڕەنگە لە پشت هەوڵە دڵسۆزە موسوڵمانانەکانی ئێمەوە بۆ مەبەستی دیکە بگەڕێن. لەمەشدا پێویستە لە جێی تاوانبارکردنی کەسانی دی، پەنجە بۆ شکستی خۆمان لە گەیاندنی پەیامەکاندا بەو شێوەیەی پێویستە ڕابکێشین. مرۆڤەکان پێویستە بە لایەنی کەمەوە چل ساڵ لە ئێمە بڕوانن و ببینن کە بێ هیچ لادانێك و بێ هیچ چاوەڕوانییەك جگە لە ڕەزامەندیی جەنابی حەق، هەوڵ دەدەین ژیانی موسوڵمانێکی ڕاستەقینەمان هەبێت. بەڵێ، جا کاتێك گەیشتینە ئاستێکی لەم شێوەیە، دەبینن مرۆڤایەتی دەستە بە دەستە دێن بەرەو لاتان و بە گیان و دڵ بەرەو ئەو حەقیقەتانە ڕادەکەن کە ئێوەی کردووە بە ئێوە و هێناونیەتە ئەم ئاستە.

## بزاوتی خۆبەخشان

تەنانەت لەم باری نەخۆشییەشمدا، هێشتاش کەسانێك هەن کە کۆمەڵێك دەستەواژەی وەك "سەرکردەی کۆمەڵە" و "شێخی تەریقەت" بۆ من بەکار دەهێنن. ئەم وشانە لەسەر دڵی من زۆر سەختن. بێزم دێتەوە لە دەستەواژە گەلێکی

وەك "فەتحوڵڵاچی". هەر لە کۆنەوە ناڕەحەت بووم بە پاشگری "چی" و "یی". ئەمجۆرە دانەپاڵانە وەك هۆکاری دابەشکاری کۆمەڵگە دەبینم. من هەرگیز بەخۆمم نەوتووە "سەرکردە" بەرهەڵستی هەر جۆرە ناولێنانێکی لەو شێوەیەش دەکەمەوە. چونکە من بیر و بۆچوونەکانم بە درێژایی سی ساڵ لەسەر مینبەر و کورسی مزگەوت خستەڕوو. کەسانی هاوهەست و هاوبیر سۆزیان بۆ قسەکان نواند و ڕێزیان بەرامبەریان نیشاندا. منیش ئەم سۆز و ڕێزەم وەك کارتێکی بەهێز بۆ خزمەتکردنی گەلەکەم بەکارهێنا. هەوڵمدا ئەو کەسانەی دەربارەی من گومانی باشیان هەیە بەرەو ئەو کارانە ئاڕاستە بکەم کە بە باشم زانیون. بۆ نموونە وتم کۆرسی ئامادەسازیی زانکۆ بکەنەوە، قوتابخانە بکەنەوە، ئەو کەسانەش وەك نیشاندانی ڕێزیان بەرامبەر بە من نرخیان بۆ قسەکانم دانا. بینیم کە وەك چۆن من دەڵێم ''قوتابخانە'' کۆمەڵێك کەسی زۆری دیکەش دەڵێن ''قوتابخانە'' و ئەم دامەزراوانەیان بەلاوە گرنگە. وە بەم شێوەیە هەزاران کەس لەسەر یەك هێڵ بە یەکگەیشتن بۆ خزمەتکردنی گەلەکەیان.

بە پێداگرییەوە لەسەر ئەم بابەتە وەستامەوە: پەروەردگار هەریەکەمان بە شێوەیەك بەکاردەهێنێت. گەر هەندێك کەس لە چاوتاندا گەورە بکەن و ئەو بەرهەمانەی خوا لوتفی کردوون بدەنە پاڵ ئەو کەسانە، ئەوە لە شیرك (هاوەڵ بۆ خوا پەیداکردن)ەوە دەگلێن. ئیمام ئەڵوار وتەیەکی هەبوو زۆر دووبارەی دەکردەوە: ''هەموو باشن، نە من؛ خەڵك گەنمن و کام من''.

من کەمێك بە وابەستەیی بەو قسانەوە ئێستاش هەمان شت دەڵێم ''ڕوولێنانی خەڵکی بەرامبەر بە خۆم وەك تاقیکردنەوەیەك دەبینم. ڕەنگە ئەوان بە هەڵەدا چووبن. ڕەنگە ئیجتیهادێکی هەڵەیان کردبێت. ئەوان بەم کارەیان گوناهێکیان نەکردووە بەڵام گەر من دڵبەستەی ئەو پایەیە ببم کە ئەوان بە ڕوانینی باشی خۆیان بۆ منی دادەنێن، ئەوە خۆم نابود دەکەم''.

دەمەوێت هەمووان باش بزانن کە فەرسەخ فەرسەخ لە پێشەوایەتی و سەرکردایەتی و شێخایەتییەوە دوورم. من تەنها موسڵمانێکی سادەم. گەر هەر جۆرە پابەندیم بە تەریقەتێکەوە هەبووایە ئەوەشم دەگووت. بەڵام پابەندییەکی لەو شێوەیەم نییە. تەریقەت کۆمەڵێك ڕێوڕەسم و ئاکار و سەیر و سلوکی تایبەت بە خۆی هەیە. تاك لە سەرەتاوە بە شێخەوە دەبەسترێتەوە، پاشان گەر گەشە بکات و بتوانێت خۆی بسەلمێنێت، پایەی پێ دەدرێت و دەرفەتی وانە وتنەوەی بۆ دەڕەخسێنرێت. ئەویش دەست دەکات بە وانە وتنەوە بە کەسانی دی. هەروەها شێخایەتی و موریدایەتی وەك زنجیرەیەك ڕیشەی دەبرێتەوە تا پێغەمبەری سەرومرمان (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). من نە زنجیرەیەکی لەو شێوەیەم هەیە و نە وەك تەریقەتەکانیش ویرد یاخود وانەی تایبەتم هەیە، جگە لەو پەرستش و ئەوراد و ئەزکار و تەسبیحاتانەی لە نێو قورئان و سوننەتدا هەن. بۆیە من لایەنێکی پەیوەندیدارم بە تەریقەتەوە نییە.

لە ڕاستیدا مرۆڤ لە بەرامبەر ئەنجامدانی کارێکەوە بۆ ئوممەت و وڵات و گەلەکەی، پێویستی بە هیچ پایەیەك نییە. من هاوڵاتییەکم هەرچییەکم کردبێت بۆ گەلەکەم وەك هاوڵاتییەك ئەنجامم داوە. هیچ پایەیەکیش بەرزتر لە هاوڵاتیی بوون نابینم. ئەوانەی ئەنجومەنی نوێنەران و دادوەری و دارایشیان پێکهێناوە هەر هاوڵاتین. منیش تەمەنێك خۆشحاڵانە خزمەتی دەوڵەت و گەلەکەم کردووە. جا پشتگوێ خستنی هەموو ئەو شتانەی عەرزم کردن و گەڕاندنەوەی هەموو ئەم کارە باشانە بۆ توانای تەنها کەسێك زۆر لەسەر دڵم قورسە.

لەو لاشەوە دەبێت تەماشا بکەین بزانین ئەو کەسانەی بە "جەماعەت، کۆمەڵە" ناودەبرێن کێن؟ ئەم ئاپۆڕە خەڵکە چۆنە وا بە ئاسانی و ئاسودەیی لە دەوری یەك کۆدەبنەوە؟ ئەم مرۆڤانە پاش پەسەندکردنی قسەی کەسێك کە متمانە

و بڕوایان پێی بووە و قسەکانیان بە گونجاو دیوە بۆ خزمەتکردنی گەلەکەیان لە دەوری یەکدی کۆبوونەتەوە. پاشان ئەو هەنگاوە دروستانەی ئەم کەسانە ناویانە بەرەو گەیشتن بە ئاشتییەکی سەرتاسەری بۆ جیهان، لە لایەن هاوڵاتیانی و وڵاتانی دیکەشەوە پەسەند کراوە. ئەوانیش لە وڵاتی خۆیاندا هەمان ڕێگەیان گرتووەتە بەر. تەنانەت هەندێك لە مەسیحی و یەهودی و بودیەکانیش ئەم کارەیان لە خۆ گرتووە و هاتوونەتە سەر ئەو باوەڕەی پێویستە بە هەمان شێوە کار بکەن بۆ گەیشتن بە خۆشبەختی تەواوی مرۆڤایەتی، بۆیە ناکرێت یەکبوونی بیر و هەستی ئەم هەموو مرۆڤە لە نێو وشەی "کۆمەڵە، جەماعەت"دا کۆبکەنەوە.

هەروەك چۆن بۆ ئەنجامدانی نوێژی هەینی کەسانی جیاواز لە مزگەوتەکاندا کۆ دەبنەوە و یەکبوون و یەکڕیزییەك پێکدەهێنن لە کاتێکدا هیچ کەس بە زۆر کۆینەکردوونەتەوە. بە هەمان شێوە ئەم پێکهاتەیە بزاوتێکە دەرئەنجامی گردبوونەوەی کۆمەڵێك مرۆڤ کە بە ئامانجی بەرزی و شکۆمەندیی ماددی و مەعنەویی گەل و ئوممەتەکەیان دەجووڵێنەوە، ئەمە "بزاوتی خۆبەخشانە".

پاشان من لە سەدا حەفتای ئەوانەی دێنە لام ناناسم. خودی ئەو کەسانەش یەکتری ناناسن. ئەمانە هەریەکە خەڵکی جێیەکن، یەکێك لە ئەستەنبوڵ و یەکێك لە ئەنقەرە و یەکێك لە ئیزمیر، ئەو شتانەی باسکراون پەسەندیان کردووە و لای خۆیانەوە بزاوتێکیان بەدی هێناوە. خوێندنگە و دامەزراوەی پەروەردەییان کردۆتەوە. پاشان وتوویانە "با ئەم بزاوتە بەرینە دەرەوەی وڵات"، بە ڕووی وڵاتانی دیکەشدا کراونەتەوە. لەم وڵاتانە زۆر گەورەییان نیشان داوە، بۆ تێربوونی کەسانی دی خۆیان برسی کردووە و بۆ پۆشتەییان خۆیان بێ جل هێشتووەتەوە. ئەو مامۆستایانەی چوونەتە دەرەوەی وڵات تەنها بە مووچەیەکی کەم و هەر هێندەی بەشی گوزەرانیان بکات خزمەتیان کردووە. دانەپاڵی ئەم کارە مەزن و فیداکارییە

بێ وێنانەی ئەو جوامێرانە ئەنجامیان داوە بۆ کەسێکی نەخۆش و لاوازی وەك من هەم بیرکردنەوەیەکی هەڵەیە، هەم پێشێلکردنی مافی ئەو کەسانەیە کە بەهەر چوار لای جیهاندا بۆ گەیاندنی ئەم پەیامە پیرۆزە بڵاوبوونەتەوە، بە تایبەت ئەوەتا من ئەم چەند مانگەی کۆتایی ناتوانم چارەسەرێك بۆ خۆم بدۆزمەوە کە ئازاری قوڵم بسرەوێنێت. تەنانەت نوێژەکانیشم کە لە پێنج ساڵییەوە هەرگیز وازم لێنەهێناون، ناچارم بە دانیشتنەوە ئەنجامیان بدەم، بەڵام چیم لە دەست دێت!...

گەر فەزیلەتێك لە مندا هەبێت ئەوە: گەرچی مافیشم هێشتا نەداوە، دەستخۆشیکردن و چەپڵەلێدانم بووە بە درێژایی تەمەنم بۆ ئەو کەسە مەزنانەی خزمەتی ئەم گەلەیان کردووە. هەمیشە ویستوومە وەك تاکێکی ئاسایی منیش لەگەڵیاندا خزمەت بکەم. کات هەبووە کێشەی ماددیم توش بووە، بەڵام لە هیچ چرکەیەکی ئەم چەندین ساڵەی تەمەنمدا بە گۆشەی خەیاڵمدا نەهاتووە کە لە دزی و گەندەڵی و خواردنی مافی گەلەکەمەوە بگلێم. من لە ژێر باڵی باوکێکدا پەروەردە بووم کە بۆ ئەوەی ئاژەڵەکانی لە گیای زەوی ماڵە دراوسێکانی نەخۆن، لەماڵەوە دەمی ئاژەڵەکانی دەبەستەوە تا دەگەیشتە سەر زەوییەکەی خۆی. بە درێژایی ژیانم منیش بە شوێن پێکانی ئەودا ڕۆشتووم.

هیچ کاتێك نەبوومەتە خاوەنی ماڵ و سامان. ئێستاش بە هەمان شێوە ماڵ و سامانێکم نییە. جلەکانی بەرم و خواردنی ڕۆژانەی لێدەرکەیت هیچ جۆرە خەرجییەکی دیکەم نییە. بۆ خواردنیش گەر سێ جۆر خواردن لەسەر سفرەکەم هەبێت وەك زەقومی لێدێت بۆم. ئەو فەرشەی بەسەریدا دەڕۆم، وەك ئەوەی لەسەر شانم هەڵمگرتبێت هەست بە قورساییەکەی دەکەم. ئەوە با بوەستێت کە هەمیشە هەوڵمداوە خۆم بپارێزم لەوەی بەسەر فەرشێکدا بڕۆم کە بە ماڵی خەڵك کڕا بێت. لە وەقفێکی سەر بە دەوڵەتدا بووم، بۆ ئەو ڕاخەرانەی بەسەریاندا

دەرۆیشتم پارەی دڕانیانم دانا. هەوڵم داوە پارەی هەر شتێك كە خواردوومە یاخود خواردوومەتەوە بدەم. نەك تەنها لە وەقف یاخود شوێنێكی دیكەدا بگرە لە ماڵی خوشكە گەورەكەشمدا كاتێك ویستم پارەی ئەو پەرداخە ئاوە بدەم كە خواردبوومەوە ڕووبەڕووی چاوە پڕ ئەسرینەكانی ئەو بوومەوە كە لێی پرسیم "تەنانەت لێرەش؟" بەڵام من نەمدەتوانی بە جۆرێكی دیكە ڕەفتار بكەم. ئاخر هەمیشە بە ترسی ئەوەوە ژیاوم كە قومێك ئاو یاخود پاروویەك نان لە گەرووم بنێم كە لە داهاتوودا بە هۆیەوە بخرێمە بەر لێپرسینەوەوە.

پاش بەسەربردنی تەمەنێك لە پێناوی زیندووكردنەوەی ئەم گەل و ئوممەتە، تۆمەت بۆ دروستكردن و دادگایی كردن وەك تاوانبارێك زۆر لەسەر دڵم سەختە. دیوی سەخت و ناڕەحەتكەری ئەم بابەتە تەنها پەیوەندیی بە خودی منەوە نییە. زیاد لەوەی ئەم جۆرە مامەڵە بە من ڕەوا دەبینرێت، ئەوەی مایەی نیگەرانییە گومانی خراپ بردنە بەو كەسانەی لەم بزاوتەدا هاودڵییان كردووە و لە هەر چوار لای دونیادا خزمەت دەكەن. ئەم جۆرە كەسانە كە وەك باڵوێزێكی فەرهەنگی وەهان و بە هەر چوار لای دونیادا بڵاوبوونەتەوە، هەر چەندە خۆیان دەستیان لە هەموو شتێكی كەسیی خۆیان شۆردبێت و هیچ داواكاری و چاوەڕوانییەكیان نەبێت، بەڵام ئەوەی لەسەر ئەم گەلەیە بە ئێستایشەوە بریتییە لەوەی پاڵپشتی و پشتیوانی لەو كەسانە بكەن.

بستێك خاكی نیشتیمانەكەم ناگۆڕمەوە بە بەهەشتی هیچ جێگەیەكی دی. گەر ئێستا ناڕەحەتییەكانم ڕێیان بداما یە یەكسەر دەگەڕامەوە بۆ وڵاتەكەم. بەڵام گەر بشگەڕێمەوە نیدی باوەڕ ناكەم بتوانم بۆ ماوەیەكی درێژ لەوێ بمێنمەوە. ئەم حاڵەتەش زۆر بەلامەوە ناخۆشە و دووری نیشتیمان وەك بڵێیت ناخم دەخوات.

## ئەو ئامانجەی لە پەروەردە و فێرکردن چاوەڕێ دەکرێت

یەك دوو جار لە هاوڕێکانم[1] پرسیووە: ئایا تا ئێستا مامۆستاکانتان پێیان وتوون ئامانجی ئێمە لە خوێندن بریتییە لەوەی بتوانین جوانییەکانی ئاینەکەمان بە مرۆڤایەتی و منداڵی هەتیوی وڵاتانی وێرانبووی زەوی بگەیەنین؟! ئەو منداڵانەی لەوپەڕی بێ دەرەتانی و داماویدا چاویان لە ئاسۆی خۆرئاوابوونی حەقیقەتەکان بڕیوە، بۆخاتری خوا بڵێن "بەڵێ"، وەڵامێکی ئەرێنیم بدەنەوە و بڵێن "بەڵێ". تا منیش ئاسوودەبم و دڵم بگەشێتەوە. ئایا بۆ تەنها جارێکیش وتوویانە "ئێمە خۆمان لە هەموو ئامانج و شەڕێکی سیاسی و حیزبایەتی دەپارێزین و تەنها و تەنها لەبەر خاتری خوا خۆمان شارەزای ئاینەکەمان دەکەین و پاشانیش بێ هیچ چاوەڕوانییەکی دونیایی دەست دەکەین بە گەیاندنی ئاینەکەمان. تەنانەت گەر بکەوینە هەلومەرجی هێندە سەختەوە کە ناچاربین، بە ئارەقی نێو چاوانمان بەردبکەنین نان پەیدا بکەین. بەڵام هەرگیز کۆڵ نادەین لەوەی ئاوی کەوسەر ئاسای حەزرەتی موحەممەد بە دڵەکان بگەیەنین. ئامانجی بوونمان ناسینی خوای پەروەردگار و ناساندن و خۆشەویستکردنیەتی لە لای کەسانی دی. گەر هەڵنەستین بە ئەنجامدانی ئەم ئەرکە ئەوە مانەوامان لەسەر زەویدا و هەناسەدانیشمان هیچ واتایەکی نابێت و ژیانمان پوچ دەبێت. کەوایە وەرن با لە پوچی دوور بین". "ئایا ئەمانەیان وتووە؟" خۆزگە کاتێك من ئەم پرسیارانەم دەپرسی وەڵامی ئەرێنیم دەست بکەوتایە!... چ دەبوو خۆزگە وەڵامی بەڵێم دەست بکەوتایە!...

گەر ئەم ئاگرە تەنانەت لەو کوورانەشدا کە بڕیارە ببنە سەرچاوەی "فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگری کردن لە خراپە"، تا ئەم ڕادەیە کوژابێتەوە،

---

١. مامۆستا مەبەستی لەو قوتابیانەیە کە پاش تەواوکردنی خوێندنی شەرعی دەرۆنە لای ئەو بۆ وانە خوێندن.

واتە ئەم بابەتە بە تەواوی وەستاوە. ئەمە لە کاتێکدا لە پشت بنیاتنانی ئەو قوتابخانانەوە هیممەتی تەواوی گەلێك هەیە. واتە کەسانی جوامێر و خێرخواز، دەرگا بە دەرگا و کارگە بە کارگە گەڕان و وەك بلێیت سواڵیان کرد و پارەیان کۆکردەوە بۆ دروستکردنی قوتابخانەی پێشنوێژی و وتارخوێنی و لە هیچ جۆرە فیداکارییەك دوا نەکەوتن. دەی دەبوو لە بەرامبەر ئەم هەوڵ و ماندووبوونانەی ئەو کەسانەدا بەلایەنی کەمەوە مامۆستا و قوتابییەکانی ئەویێ بیانوتایە ''ئەم کەسانە، تەنها بە خاتری ئەوەی ببینە خاوەن مووچە دەرفەتی خوێندنیان بۆ ئێمە فەراهەم نەکردووە. تەنها بۆ ئەوەی خاوەن کار بین و بە شوێن پلە و پایە و پێشکەوتنی کارەکانماندا بڕۆین، ئەم هەموو هەوڵ و ماندووبوونەیان نەداوەتە بەر خۆیان. بەڵکو دەرفەتی خوێندنیان بۆ فەراهەم کردین تا دووبارە بونیادی ئەم ئاینە بنێینەوە''. بەڵێ، دەبوو وەها بڵێن و بە گوێرەی ئەوە بجوڵێنەوە. ناڵێم ئەمە نەبووە و ئەوەی پێویستە نەوتراوە و ئەوەی پێویستە نەکراوە. بیرکردنەوەیەکی لەم شێوەیە دەبێتە گومانی خراپە بردن. کێ دەزانێت لەو دامەزراوە پیرۆزانەدا چ پاڵەوانگەلێك و چ سینەگەلێکی پڕ دەرد و چ عاشقانێکی بەرزکردنەوەی وشەی "الله" هەیە!! بەڵام هێندە هەیە ناتوانم بڵێم هەستێکی بەرچاوی گەیاندن و بەکردەکردنی ئاین و گۆڕانی ئەم هەستە بۆ بزاوت و جوڵانەوە هەیە.

خەڵکی ئەرزڕۆم دەربڕینێکیان هەیە، دەڵێن ''گۆچانەکەی فڕێدایە نێو خەرمانەکە'' کاتی خۆی کە گێرە دەکرا، گەر ئەو کەسەی لە گوێرەکەکەی دەدا گۆچانەکەی فڕێ بدایەتە نێو خەرمانەکەوە، واتای ئەوە بوو کە "چیتر ئەم کارە ناکەم، دەست لە گێرە کردن هەڵدەگرم". جا، ئەمڕۆش لە مەیدانی ئەرکی فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگریکردن لە خراپەدا، بە واتایەکی دی لە فەرمانبەریی بەرزکردنەوەی ناوی خوادا "گۆچانەکە فڕێدراوەتە نێو خەرمانەکەوە" و هەموو

شتێك وەستاوە و دەستی لێ شۆراوە.

بۆیە لە ئێستادا ئەنجامدانی ئەم ئەرکە زۆر گرنگە. حەزرەتی ئوستاز بەدیعوززەمان سەبارەت بەم ئەرکە لە سەردەمێکدا کە تا ڕادەیەك ئەنجام دەدرا فەرموویەتی "فەرزی هەموو فەرزەکانە" ئەو بە دەربڕینی "فەرز دەر فەرز"[١٤٤] دەریبڕیووە: کەواتە لە مرۆماندا ئەرکی "فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگری کردن لە خراپە" گرنگییەکی زیاتریشی بەدەستخستووە و هاتووەتە پێش هەموو کارەکانی دیکەوە.

فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگریکردن لە خراپە "أمر بالمعروف و النهي عن المنكر" وەك پێشتریش باسم کردووە. بریتییە لە باسکردن و گەیاندنی ئەوەی باش و چاکە و خواوەند فەرمانی پێکردووە. وە هەوڵدانە بۆ ڕێگری کردن و گێڕانەوەی خەڵکی لەو شتانەی لار و خراپ و ناشرینن. گەر ئەم ڕوکنە بەجێ نەهێنرێت پایەیەکی تەلاری ئاین دەڕوخێت. چونکە بۆ ئەوەی ئاین هەمیشە بەرپابێت پێویستە دوو بنەمای سەرەکی بە بەردەوامی لە ناو کۆمەڵگەدا زیندووبن. یەکێك لەم دوو بنەمایە "فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگری کردن لە خراپە"یە و ئەوی دیکەشیان خوێندنی "رقائق - رەقائیق"ە واتە ئەو شتانەی دڵ نەرم دەکات و فرمێسك لە چاو دەهێنێت. موتاڵاکردنی ئەو شتانەی دەربارەی زیندووبوونەوەی دوای مردن و پەیوەندی مرۆڤ بە جەنابی حەق و ژیانی دونیا نەویستن. سەلەفی صالح بەردەوام سەرگەرمی " رقائق - رەقائیق" بوون. ئەوان پێویستییان بە هاندان نەبوو بۆ "فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگری کردن لە خراپە" چونکە خۆیان لە نێو ئەوپەڕی گەرموگوڕی مێتافیزیکیدا بوون. گەر چاوێك بە کتێبەکانی "رجال"دا بخشێنین کە دەربارەی ژیانی ئەو کەسانەن فەرموودەیان گێڕاوەتەوە، کەسی وەها

---

١. بەدیعوززەمان، خوتبەی شامیە؛ وتەکان؛ مەکتووبات (تۆوەکانی حەقیقەت).

دەبینین کە تا پلەی عەشق بەستراوەتەوە بە گەیاندنی ئاینەوە. بۆ نموونە ئەبو عوسمانی نەهری (عەبدورڕەحمانی کوڕی موللی بەصری). یەکێکە لەمانە. ئەم شوێنکەوتووە هێندە ماڵی هەبوو کە هەمووی دەدا بە کۆڵیدا و لەگەڵ خۆیدا بۆ هەر کوێ بڕۆیشتایە دەیبرد. شار بە شار دەگەڕا، لە شوێنێك بارگەی لێ دادەنا و بە پەرستش و بەندایەتییەوە سەرقاڵ دەبوو. ویرد و زیکرەکانی دەخوێند. تەفسیری قورئانی دەکرد، فەرموودە پیرۆزەکانی دەگێڕایەوە و بانگەوازی خەڵکی دەکرد. لە کاتێکدا سەرگەرمی ئەم کارە باشانە بوو فەرمان دەهات کە غەزا هەیە لە فلان جێگە، بنە و بارگەی دەپێچایەوە و سواری ئەسپەکەی دەبوو و بەرەو ئەو جێگەیە دەکەوتە ڕێ. هەر کە ئەو ئەرکەشی بەجێ دەهێنا یەکسەر بەرەو شارێکی دیکە بەڕێدەکەوت و دووبارە بارگەی لێ دادەنا و دەستی دەکردەوە بە گەیاندنی ئاین و بەجێهێنانی ئەرکێکی تری بەندایەتییەکەی.

## چۆنێتی بەکردەکردن و بەرجەستە کردن

پرسیار: چۆن بتوانین ترسمان لە بەردەوام نەبوون لە ئەرکی بە کردەکردن و بەرجەستەکردنی ئاین بڕەوێنینەوە؟

وەڵام: پێویستە ئەو ترسە هەرگیز نەڕەوێتەوە و هەردەم لە گیانماندا ترس و بیری بە کردەکردن و بەرجەستەکردن بە زیندوویی بمێنێتەوە. بەڵام ئەم ترس و بیرە پێویستە بمانکێشێت بەرەو ئەوەی وەڵامی پرسیاری "دەبێت چی بکەم بۆ بەکردەکردن و بەرجەستەکردنێکی باشتر؟"

دەبێت هاوکاری یەکدی بین بۆ باشتر بە ئەنجام گەیاندنی ئەرکی بە کردەکردن و بەرجەستەکردنی ئەو شتانەی دەیزانین. بە ڕەچاوکردنی هەستی

خۆویستی کەسەکان و وریابوون سەبارەت بە ئاماژەکانی دەموچاومان (کاتێك ڕووبەڕوو لەگەڵ برایەکمان دەدوێین)، هەروەها دوور لە دروستکردنی ناڕەحەتی بۆ بەرامبەرەکەمان پێویستە یادخەرەوە و دەستنیشانکەری هەڵەکانی یەکدی بین. پێویستە لە نێو باوەڕداراندا کەسانێك بێنە پێشەوە کە ببنە نموونەی باش بۆ ئەوانی دی و خەڵکیش چاویان لێ بکەن و بە پێشەنگیان دابنێن. گەر هەندێکمان نەمانتوانی لەسەر پێی خۆمان بڕۆین پێویستە یەکسەر پەیوەندی بە براکانمانەوە بکەین و دەستیان بگرین و بە شوێنیاندا بڕۆین. واتە ڕەنگە هەموو لە یەك کاتدا نەتوانین ڕەفتار و کردارێك بنوێنین کە هاوتای گوشادیی ناخمان و هەڵقوڵاوی حاڵەتێکی سازگاری وەك "بەسط" بێت. بەڵام گەر لەگەڵ ئەو کەسانەدا هەستین و دانیشین کە توانای دەستخستنی حاڵەتی "بەسط" یان هەیە، ئەوا ئەو کاتانەی خۆمان توانای ڕێکردنمان نەبوو، بە کۆمەکی ئەوان دەتوانین لەسەر پێ بوەستین و ڕێبکەین.

قورئانی پیرۆز وەك نموونەی گۆڕانی قەبض بۆ بەسط لە ڕێی تۆبە و ئیسغفارەوە و دووبارە گەڕانەوە بۆ نێو صادیقان و ڕێکردن بە هەنگاوی ئەوان، سەرگوزەشتەی ئەم سێ هاوەڵەمان پێش چاو دەخات کە بەشداریی غەزای تەبوکیان نەکرد، ئەوانیش "کەعبی کوڕی مالك و هیلالی کوڕی ئومەییە و مورارەی کوڕی ڕەبیع"ن. سەبارەت بەوان بەم شێوەیە دەفەرموێت:

﴿ وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُواْ حَتَّىٰٓ إِذَا ضَاقَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَرۡضُ بِمَا رَحُبَتۡ وَضَاقَتۡ عَلَيۡهِمۡ أَنفُسُهُمۡ وَظَنُّوٓاْ أَن لَّا مَلۡجَأَ مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيۡهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيۡهِمۡ لِيَتُوبُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴾

(التوبة: ١١٨)

واتە "پەروەردگار لەو سێ کەسەش خۆش بووە کە لە جەنگ جێمابوون و حوکم دەربارەیان دوا کەوتبوو. چونکە ئەوان بە شێوەیەك دڵتەنگ بوون، کە دونیا بە هەموو فراوانی خۆیەوە بۆیان تەسك بوویەوە. دەروونیان تا ئەوپەڕی گوشرا. لە کۆتاییدا تێگەیشتن کە هیچ پەناگەیەك نییە لە خەشمی خوا مەگەر بۆ لای خۆی نەبێت، بۆیە خواش تۆبەی لێ قەبوڵ کردن تا بگەڕێنەوە بۆ باری باشی پێشویان، چونکە خوا تەوواب و ڕەحیمە. تەوبەکان بە زۆریی قەبوڵ دەکات، تەوبەکارانی خۆش دەوێت و زۆر میهرەبانە".

هەر پاش ئەو ئایەتەی کە باسی قەبوڵ کردنی تەوبەی ئەو سێ هاوەڵە دەکات کە بە درێژایی پەنجا ڕۆژ تاقیکردنەوەیەکی هێندە سەختیان تێپەڕاند کە بە پەنجا ساڵ لێیان گوزەرا و بۆ قەبوڵ بوونی تەوبەکانیان بە بەردەوامی دوعایان دەکرد و بە هۆی نیشاندانی ڕاستگۆییانەوە تەوبەیان لێ قەبوڵ کرا، یەکسەر ئەم ئایەتە هاتووە:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾ (التوبة: ١١٩)

واتە "ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! پارێزکار بن و خۆتان لە خەشمی خودا بپارێزن و بڕیارو فەرمانەکانی بە جوانیی جێبەجێ بکەن، وە لە هەموو قسەو کردەوەیەکتاندا ڕاستگۆ بن و لەگەڵ ڕاستگۆیاندا بن و مەبەستتان تەنها ڕەزامەندیی پەروەردگارو لێخۆشبوونی ئەو بێت."

بەڵێ، گەر ئەو ژینگەیەی تێیدا دەژین و ئەو دۆست و هاوڕێیانەی بە چواردەورماندان بۆ کاری باشە ڕاپێچمان بکەن و بە حوکمی ئەو شوێنەی تێیداین ناچاربین کاری باشە ئەنجام بدەین، ئەوا پارێزراو دەبین لەوەی جارێك لە جاران گەرچی دوور لە ویستی خۆشمان بێت، بکەوینە نێو بازنەیەکی چەپەڵی گوناە و

سەرپێچییەوە. لە سایەی چواردەورێکی لەم شێوەیەوە بە ئاسانی ڕێبوارییەکەمان دەبەینە سەر و بە ئاسانی دەژین. چونکە گەر مرۆڤ جارێك بکەوێت، جارێکی دیکە بکەوێت، پاشان جارێکی دیکەش بکەوێت، ئیدی بە یەکجاری دەکەوێت و ڕووی بە زەویدا دەچەقێت و ژیانێکی بە خاك ئالودە بەسەر دەبات. هەر لەبەر ئەمەیە کە قورئان دەفەرموێت "لەگەڵ صدیقین (ڕاستگۆیان و سەرڕاستان)دا پێکەوە بن"[١].

ئەوانەی بەشداری غەزای تەبوکیان کرد، صادیقەکان بوون. کەسانێکیش هەبوون بەشداری غەزایان نەکرد و لە صددیقەکان جیابوونەوە. سێ لەو کەسانەی وەڵامی بانگەوازی جیهادیان نەدایەوە و لەمەدینەدا مانەوە باوەڕداری ڕاستەقینە بوون و ئەوانی دی کۆمەڵێك دووڕوو بوون. سێ دانە باوەڕداری ڕاستەقینە لەگەڵ دووڕوو و درۆزناندا پێکەوە مابوونەوە. لەبەر ئەمەش بۆ ماوەی پەنجا ڕۆژی ڕەبەق ڕووبەڕووی تاقیکردنەوەیەکی زۆر سەخت بوونەوە و تەنها پاش ئەوەی سەر ڕاستی و ڕاسگۆییان سەلماندەوە لە نێو ڕیزی صدیقاندا وەرگیرانەوە. وەك پیرۆزیایی و بەرزڕاگرتنیش قورئان ئەم حاڵەی ئەوانی بەم ئایەتانە باس کرد.

کەوایە، دەستگرتن بە دەستی ئەو کەسانەوە کە هەمیشە لە پێشەوەی بابەتەکاندان و هەموو جارێك یەکەم کەس ئەوان پێشەنگی دەکەن بۆ ئەنجامدانی کارەکان و بە نموونە وەرگرتنی ئەمانە، بۆ ئێمە هۆکارێکی سەرکەوتن دەبێت لەو تاقیکرنەوەیەدا کە تێیداین. بە حوسنی میسال وەرگرتنی ڕەفتار و هەڵسوکەوتەکانی ئەوان و لەگەڵ ئەواندا ژیان بەرەو ئەوەمان دەبات ئەرکەکەمان بە ماف پێدانی تەواوەتییەوە جێبەجێ بکەین، هەرچەندە شەرم لە خۆمان بکەین کاتێك هەندێك جار حاڵی

---

١. التوبة: ١١٩.

خۆمان بە حاڵی ئەوان بەراورد دەکەین، بەڵام ئەو کاتانەی ناتوانین لەسەر پێی خۆمان بوەستین گەر دەست بە دەستی ئەوانەوە بگرین و لەگەڵ ئەوان ڕێبکەین، بە وێنەی ئەو تەوافکەرەی دەوری کەعبە کە هەندێك جار بەر لێشاوی حاجیان دەکەوێت و گەر بیشیەوێت ناتوانێت لە ڕیزی تەوافکەران بێتە دەرەوە و بە ناچاریش بێت دەبێت لە تەواف بەردەوام بێت، - إن شاء الله - ئێمەش بە بەرەکەتی ئەو کۆمەڵەیە گەر بە زۆر و ناچاریش بوو بێت لە ڕێگەکەمان بەردەوام دەبین و کاروانی بەندایەتیمان بە پایان دەگەیەنین.

## پاراستنی زیندوێتی ڕۆحمان

لە بەرامبەر ئەو وەبەردانە سروشتییەی لە ڕووەك و ئاژەڵەکاندا هەیە و جۆرێك لە تەجەللی ئیرادەی کوللی جەنابی حەقە، ئیرادەیەکی جوزئی بە ئادەمیزاد دراوە. هەموو وەرچەرخانێکی مرۆڤ دەبێت بە گوێرەی ویستێك بێت. پاراستنی زیندوویەتی ڕۆحی و ژیانی ئاینی و دەستخستنی وزە و هێز لەم بوارەدا پێش هەموو شتێك پابەندە بە ویست و ئیرادەی خودی مرۆڤەوە. واتە پێویستە ئەو ئیرادەی بخاتە گەڕ و بڵێت: "من پێویستە ئەوەندە ئەوراد و ئەزکار بخوێنم، بەو پێیەی زیندوێتی ڕۆحی من هۆکارێکی کاریگەرە لە ژیان بەخشین بەوانی دیکەدا، بۆیە پێویستە وەك خضر لەملا بۆ ئەولا ڕابکەم و هەناسەی ژیان ببەخشمەوە" بەڵێ پێویستە وەها بڵێت و لەم ئیستیقامەتەدا ڕێ بکات. مرۆڤ گەر لەگەڵ نەفسی خۆیدا بە تەنها بمێنێتەوە و مافی ئیرادەی نەدات ئەوا ئارەزووی خولیاگەلی بێ مانا دایدەگرێتەوە و ئاینیشی تەنها لا دەبێت بە شتێکی فەرهەنگی. فەرهەنگێك کە لە باوانیەوە بۆی مابێتەوە و تەواو. پاشان فەرمانە ئاینییەکان بە سووك تەماشا دەکات و دەڵێت "نوێژی ئێمە، زەکات لای

ئێمە" و توشی کەمتەرخەمی دەبێت و پەرستشەکان بەو شێوەیەی پێویستە لە دڵدا ڕەنگ بداتەوە بەجێ ناهێنێت.

ئەگەر باوەڕدار هێندە بە هەستیاری لەگەڵ ئەرکی بەندایەتیدا مامەڵە نەکات کە وای لێبێت بڵێت "خوایە، ئەمانەتەکەت ببەرەوە بۆ لای خۆت گەر بڕیارە نوێژی بەیانیم بفەوتێت ، نامەوێت ئەمڕۆ وەك مونافیقێك کە نوێژی بەیانی فەوتاوە لە ڕۆشنایی خۆر سوود وەربگرم". گەر ئەم زایەڵەیە لە ناخیدا جۆش نەدات، واتە ئاین بۆ ئەو تەنها شتێکی فەرهەنگییە. بە داخەوە ئەمڕۆ ئاین لە جیهانی عەرەبی و تورکی و وڵاتانی دیکەشدا وەك شتێکی فەرهەنگی و بۆماوەیی و وەك داب و نەریتێکی کۆمەڵایەتی و بێ هیچ هەست و جۆش و خرۆشێك و بێ هەستانە مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت.

ئەنجامدانی ئەرکە ئاینییەکان بە شێوەیەکی هەستمەندانە بەستراوە بە هەوڵ و لێبڕانی خودی مرۆڤەوە. کاتێك پەرستش و گوێڕایەڵیی خوا دەبێتە بەشێك لە سروشتی مرۆڤ، کەمێك ئاسانتر دەبێت. بەڵام هێشتاش زیندوو ڕاگرتنی ژیانی ڕۆحی و وشك نەبوونی هەستی ئاینپەروەری پێویستی بە ئیرادە و نییەت و لێبڕاوی هەیە. بۆ نموونە، بەردەوام دارشتنی بیرۆکە و پرۆژە بۆ ڕزگار کردنی ژیانی هەمیشەیی کەسانی دیکە، لە هەمان کاتدا مەرجێکی زیندوو مانەوەی ئێمەشە. زیندوو مانەوەی ئەو مرۆڤەی لێرە هەوڵێك نادات بۆ ڕزگارکردنی ژیانی هەمیشەیی ئەوانی دی و ڕزگاربوونی لە دواڕۆژدا شتێکی زۆر سەختە.

کەوایە، داخۆ ئێمە لە هەر دەرفەتێکدا لەگەڵ چەند برایەکمان بۆ موتاڵاکردنی ئەو بابەتانەی بۆ ژیانی دڵمان وەك ئاو و هەوا گرنگن کۆ دەبینەوە؟ داخۆ خواست و هیممەتی گەیاندنی چەند پەیامێك بەو کەسانەی ئاتاجی نووری ژیانبەخشی ئیسلامن لە ناخماندا هەیە؟ ئایا ڕۆژانە لەم پێناوەدا کارێك ئەنجام دەدەین؟

وەگەرنا ئەو باوەڕدارەی ئەم هەستەی نەبێت کە بڵێت "چی بکەم تا بڕۆمە ناخی مرۆڤەکان و ناوی پەروەردگارم بە گوێی ڕۆحیاندا بدەم" سەرەنجامی ئەوەیە کە وەك درەختێکی بێ ئاو لاواز ببێت و پاشان وشك ببێت.

بۆ بەردەوامیی ئامەزرۆیی و جۆش و خرۆشی ئاینیمان خوێندنی ئەوراد و ئەزکار زۆر گرنگە. دووبارەکردنەوەی بەردەوامی ئەو دوعایانەی لە قورئانی پیرۆز و پێغەمبەری سەروەر و سەلەفی صالحەوە فێری بووین و پەنابردن بۆ جەنابی حەق هۆکارێکی زۆر گرنگە بۆ پارێزراویمان لە پێ هەڵخلیسکان، هەروەك قورئانی پیرۆز فێرمان دەکات: "رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنْتَ الْوَهَّابُ" واتە "ئەی پەروەردگاری خاوەن کەرەممان، پاش ئەوەی ئێمەت گەیاندە هیدایەت، دڵەکانمان ڕەش مەکەرەوە."[1] پێویستە بەردەوام بەوپەڕی جدییەتەوە بە گوفتار و کردار و حاڵمان هەوڵ بۆ دەستخستنی ئیستیقامەتی دڵ بدەین و هەمیشە چاوکراوە و ئامادە باش بین لە بەرامبەر ئەو شتانەی بەرەو لادان و پێ هەڵخلیسکانمان دەبەن".

حەزرەتی ئوستاز بەدیعوززەمان لە "بریسکەی حەڤدەهەم"دا باس لە جیاوازی نێوان ئەو ئامراز و لەتیفە مەعنەوییانە دەکات کە لە ماهییەتی مرۆڤدا دانراون "هەندێك لەوانە گەر هەموو دونیای بدرێتێ تێر نابێت و هەندێکیشیان تەنانەت بەرگەی هەڵگرتنی گەردیلەیەك ناگرێت، وەك چۆن لە کاتێکدا سەر دەتوانێت بەردێکی گەورە هەڵبگرێت کەچی چاو ناتوانێت تاڵە موویەکیش لەخۆیدا جێ بکاتەوە، هەرواش هەندێك لە لەتیفەکان بەرگەی حاڵەتێکی بچووکی غەفڵەت و گومڕایی کە هەر هێندەی تاڵە موویەك سەنگین بێت ناگرن، مادەم وایە کەواتە وریابە و بە هۆشیارییەوە پێت دابنێ! بە یەك پاروو، بە یەك وشە، بە یەك شتی

---

١. آل عمران: ٣/٨.

بچووك، بە یەك تروسكایی، بە یەك ئاماژە یاخود بە یەك ماچ خۆت نوقمی گومڕایی نەکەیت."[١]

بەڵێ، هەندێکجار ڕەنگە تەنها پارووییەك، تەنها شتێکی بچووك، تەنها ماچێك یاخود تەنها نیگایەك مرۆڤ نقوم بکات. هەندێك جاری دیکە شاشەی کۆمپیوتەرێك، دەسکی تەلەفۆنێك دەبێتە هۆی مردنی دڵ و مرۆڤیش هەستی پێناکات. چاو داخستن و خۆگێلکردن لە ئاست ئەو حەقیقەتەی کە "بازنەی چێژە حەڵاڵەکان بەسن بۆ تێربوونی ئارەزووەمان و هەر چێژێکی دەرەوەی بازنەی حەڵاڵیش هەزاران ئازاری لەگەڵدایە"، دڵ بەرەو مردن ڕاپێچ دەکات. هەندێك جار وتەیەکی ڕیاکارانە کە لە دڵی بێژەرەکەیەوە دەرناچێت، دونیای مەعنەویی ئەو کەسە خاپور دەکات. گریانی ڕیاکارانە، پێکەنین بەدەم وشەی "با وەها بڵێن دەربارەم" و ڕەفتار نواندن بۆ ئەوەی "با خەڵك ببینێت"، دڵ و ڕۆح توشی فەلاکەت دەکات. پاروویەکی حەرامی بە ناحەق ژەهرێکە دونیای دەروونی بخۆرەکەی وێران دەکات. بگرە نوێژ کردن لەسەر بەرماڵی یەکێکی دیکە کە ماڵی خۆمان نییە، ڕەنگە خشتێك لە دیواری تەلاری دڵ بڕوخێنێت.

بۆیە دەبێت ئەو کەسانەی لە ڕەنگ پەڕین و لاوازبوونی ڕۆحیان دەترسن باش ئاگاداری ئەم شتانە بن. ئەو کەسەی تا ئەم ڕادەیە ئاگاداری ڕۆحی خۆی نەبێت، تەنها دەبێت لۆمەی نەفسی خۆی بکات. ئەگەر هەمیشە لە دڵیدا خرۆشان و هەیەجانێکی نوێی ئیمانی هەست پێ نەکات دەبێت لەم بنەمایەدا کە پشتگوێی خستوون بە شوێن هۆکاری ماندوێتی و بێزاریدا بگەڕێت. بە دەربڕینێکی قورئان تەنانەت شەیتانیش لەو دونیا دەڵێت "لۆمەی من مەکەن،

---

١. بەدیعوززەمان، بریسکەکان، بریسکەی حەڤدەهەم.

بەڵکو لۆمەی نەفسی خۆتان بکەن"[١] واتە "لە جێی ئەوەی هەموو شتێك بدەنە پاڵ من و تاوانبارم بکەن، لۆمەی نەفسی خۆتان بکەن، من هێزێکم نەبوو تا خواستەکانم بسەپێنم بەسەرتاندا. من تەنها بانگم کردن و ئێوەش یەکسەر وەڵامی بانگەکەتان دامەوە. بۆیە ئێوە خۆتان تاوانبار بکەن."

بەڵێ، لە ناخی مرۆڤدا هەندێك لەتیفە هەن کە ڕەنگە بەهۆی پشتگوێ خستنێك یاخود هەڵەیەکەوە نووریان بکوژێتەوە. جا نازانم داخۆ دوای کوژانەوەیان دووبارە دادەگیرسێنەوە یاخود نا. هەندێك جار حەقیقەتی ئایەتی: "کَلَّا بَلْ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ مَا كَانُوا يَكْسِبُونَ"، واتە "نەخێر، ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ئەو خراپانەی ئەنجامیان داوە دڵی ئەوانی ژەنگاوی کردووە و ڕزاندوویەتی"[٢] تەجەللی دەکات و دڵ مۆری لێدەدرێت. ئیدی جارێکی دیکە ئەم لەتیفانە هەرگیز زیندوو نابنەوە. گەر بێت و ئەمانە لەو بنەمایانە بن کە پاراستنی هەیەجان و عەشقی مرۆڤانەیان لەسەرە و بە هۆیانەوە مرۆڤ پارێزراوە لە وشك بوونەوە و ڕەنگ پەڕین، ئەوا بەو کارەمان دەبینە هۆی ڕووخاندنی ئەو بنەمایانە و کوشتنی ئەو دینامیکانە. جارێ ئەو کەسەی گوناهی گەورە ئەنجام بدات، پەنا بە خوا بە دیوێکدا وەك کەسێك وەهایە کە دەستێکی یاخود قاچێکی توشی ئیفلیجی بوو بێت. ئەو کەسە بە درێژایی ژیان وەك کەسێکی گۆج یاخود شەل ژیان بەسەر دەبات.

کاتێك کافرێك دەبێتە موسوڵمان، ئیمان هەموو شتێکی کوفری لێ گسك دەدات و پاکی دەکاتەوە. بەڵام کاتێك کەسێکی ئیماندار ئەم هەڵانە ئەنجام بدات، واتای ئەوەیە لە نێو بازنەی مەحرەمیدا هەڵەی ئەنجامداوە، کە زۆر ترسناکە. جا ئەو کەسەش کە لە قەڵای بەرزی ئەم خزمەتەوە بکەوێتە خوارەوە،

١. إبراهيم: ٢٢.
٢. المطففين: ١٤.

ناكەوێتە زەوییەكی تەختەوە، بەڵكو ڕەنگە بكەوێتە بیرێكی قوڵەوە. بە گوێرەی دەستوری "بحسب المغنم المغرم - بە هێندەی دەستكەوت، سەختی دەبێت" چەندە لە دەستكەوتەكانی ئەم خزمەتەوە نزیك بن هێندەش سەختی و ئازاری ئەم خزمەتە دەتانگرێتەوە. ئێمە بە هۆی موسوڵمانێتیمانەوە، زۆر نیعمەتی خوایی بەسەر سەرمانەوە هەست پێ دەكەین. ئەم نیعمەتانەش پێویستییان بە شوكرە. گەر ئەو نیعمەتە "پێگە" یەك بێت بە ئێمە درابێت ئەوا بە گوێرەی خۆی پێویستیی بە هەڵوێست و وەستانێك هەیە. گەر پێویستیی ئەو پێگەیە بەجێنەهێنین توشی كەوتن دەبین. سووكترین جۆری كەوتن بریتییە لە ڕەنگ پەڕینی ڕۆح و ماتبوونی دڵ و لەدەستدانی شەوق و تامەزرۆیی و هەستكردن بەو هەیەجان و گەرم و گوڕییەی لە سەرەتای كارەكانەوە هەستمان پێ كردوون.

جەنابی حەق دەفەرموێت "ئێوە ئەو بەڵێنەی پێتان دابووم بیپارێزن، تا منیش ئەو بەڵێنەی پێم دابوون بیبەمە سەر"[١]. خوا "جَلَّ جَلَالُهُ" پەیمانێكی مرقەددەسی لەگەڵ ئێمەدا بەستووە، چ بەختیارییەكە كە ئێمەی وەك لایەنێك قەبوڵ كردووە بۆ پەیمان لەگەڵ بەستن. ئیمان لەو پەیماننامەیەدا وەك ئیمزایەكە. "بەڵێ كردنە" بۆ ئەو پەیماننامەیەی لە نێوان ئێمە و پەروەردگارماندایە. بێ بەڵێنی لەم كایەیەدا شتێكی یەك لایەنەیە و تەنها لە لایەن بەندەكانەوە ئەگەری ڕوودانی هەیە. تا ئەو كاتەی ئێمە وەفادارییین لەگەڵ ئەو بەڵێنەی داومانە و ئەو پەیمانەی بەستوومانە، ئەوا هەرگیز خوا بە تەنها جێمان ناهێڵێت و ناهێڵێت داوێنمان بە خاكی دونیای بێكەسی و چڵپاوی زۆنگاوی بێ نەوایی ئالوودەبێت.

نیشانەی یەكەمی ئالوودەبوونی دامەن بە خاكی دونیا و دڵبەستن بە دونیاوە مات بوونی دڵ و ڕەنگ پەڕینی رۆح و لەدەستدانی هەیەجان و خرۆشانە.

---

١. البقرة: ٤٠.

گەر ئەم حاڵەتەمان لە خۆماندا بەدیکرد ئەوە دەرخەری ئەوەیە کە ئێمە بە وەفا نەبووین لەسەر بەڵێنەکەمان و ئەویش ئێمەی لە نیعمەتەکانی بێ بەش کردووە. وەفاداربوون بەرامبەر بەڵێنەکانمان کۆمەڵێك نیشانەی هەیە.ئەو کەسەی بۆ بابەتێکی پەیوەست بە نەفسی خۆیەوە دڵی خەریك بێت لە لێدان بکەوێت، بەڵام لەو بابەتانەدا کە پەیوەندییان بە خوا و پێغەمبەر و ئاینەکەیەوە هەیە هیچ دڵی نەلەرزێت، ئەوە بەڵێنەکەی بیرچووەتەوە و ئەو شتانەی پێویستە پێش بخرێن و پێشینەییان پێ بدرێت ئەم پشتگوێی خستوون. ئەو باوەڕدارەی لە بەرامبەر ئینکاری کردنی بوونی خوا و قسە وتنەوە بە پێغەمبەرەکەی دڵی نەگاتەوە لێواری وەستان، بەڵام لە بەرامبەر بچووکترین هێرشەوە بۆ سەر نەفسی گەورەترین ئازار بچێژێت، نیشانەی ڕوونی دووڕوویی و بەڵێن شکێنی ئەو کەسە نییە؟ ئایا هەڵەیەك نییە لەمەدا کە بۆ بابەتێکی پەیوەست بە خودی خۆیەوە و لەبەر هەنگاوێك کە عیززەت و خۆویستی دەشکێنێت دەڵێت "دڵم شکا!" بەڵام لە جێگەیەکدا کە ئینکاری بوونی خوا دەکرێت و پێغەمبەری تێدا ناناسرێت، هەمان هەستی نییە؟

بەڵێ مات بوون و وشك بوون بۆ ئێمە دەگەڕێتەوە -حاشا- گومانی ئەوەی ئەمانە لە خواوە بن هەڵەیە. مرۆڤ پێویستە لە بەرامبەر ئولفەتەوە بجەنگێت، دەستەویەخە ببێتەوە لەگەڵ خوو پێوەگرتن و ئونسییەتدا هەوڵ بدات بە هەستی بەرپرسیاریەتییەوە ڕەفتار بکات و دوور لەوەی بۆ ئارەزووە دونیاییەکانی بژی هەوڵی ڕاپەڕاندنی ئەرکی سەرشانی بدات.

لەم بوارەدا، دەمێت زۆر نزا بۆ یەکدی بکەین. پێویستە بڵێین "خوا سەرکەوتوومان بکات بتوانین وەفادارانە و بە دڵسۆزی و ڕاستگۆییەوە تا کۆتایی ئەم کاروانە شان بدەینە بەر ئەم ئەرکە." نزاکردن بەمشێوەیە بۆ دۆست و هاوڕێیان

و تەواوی مسوڵمانان لە پاشملە (بێ ئاگاداری خۆیان) نیشانەیەکی زۆر بەهێزی ئەمەکدارییە بەرامبەر بە ئاینی پەروەردگار، من بە قەرزی سەرشانمی دەزانم ڕۆژانە بەلایەنی کەمەوە پێنج جار دوعا بۆ دۆستانی دوور و نزیکم بکەم و داوای ئیخلاس و دڵسۆزی و وەفا و مەعریفەت و یەقینیان لە جەنابی حەق بۆ بکەم.

گوناهە کەسییەکانیش جۆرێك لە پەیمان شکاندنن و بێوەفایین بەرامبەر بە پەروەردگار. بەڵام گەر تاك لە دوای ئەنجامدانی گوناهـ تەوبە بکات، پەروەردگار ڕەنگە لێی خۆش ببێت، بەڵام پەیمانشکێنی هەرە گەورە و بنەڕەتی بێوەفایی بەرامبەر ڕۆحی ئاین، بێ وەفاییە بەرامبەر ئامانجی مەزنی "گەیاندنی ناوی پەروەردگار بە کەسانی دی، دوور لە هەر جۆرە چاوەڕوانییەك."

بەڵێ، مرۆڤ پێویستە بڵێت "گیانێك قەرزاری جەنابی حەقم" و هەرچییەك لە ئەوەوە بۆی دێت بە خۆشحاڵییەوە قەبوڵی بکات و تا ئەو کاتەی ئەم قەرزەی دەداتەوە وەك بەندە و کۆیلەیەکی ڕاستگۆ و بە وەفا ژیان بەسەر بەرێت، ڕۆحێك کە خۆی تەرخانی خوا کردووە، دەبێت هەمیشە دەست لەسەر سینە بوەستێت و ئامادەی فەرمان بێت، کە پێشی وترا بۆ شوێنێك بڕوات بێ ئاوڕدانەوە بۆ دوای خۆی بەرەو ئەو شوێنە هەنگاو هەڵگرێت.

حەزرەتی بەدیعوززەمان لەم بابەتەشدا زۆر بە بەصیرەتە. لە هەموو شتێکدا ڕووی ڕەحمەت دەبینێت، ڕەهەندەی قەستەمۆنی دەکەن ڕووی ڕەحمەت، ڕەهەندەی بارلای دەکەن ڕووی ڕەحمەت، ئەمیرداغ، دەنیزلی ،ئیسپارتا... بەچاوی خێرەوە دەرەنجامی هەموویان دەبینێت و لەڕاستیشدا ڕووداوەکان هەر بەو جۆرە دێنە پێشەوە. ئەو بکەوتایەتە هەرجێیەکەوە وەك پشکۆیەك بوو، دەگەشایەوە تێیدا. وایان دەزانی بە گواستنەوەی ئەو پشکۆیە لە جێیەکەوە بۆ جێیەکی دی دەتوانن خامۆشی بکەن. بەڵام خۆ ئەو ئەرکی بنەڕەتیی هەر ئەوە بوو.

بەرپرسیاریەتییەکەی ئەوە بوو، کەوتە هەر جێیەکەوە شوعلەئەفشان ببێت تێیدا. مۆمێك هەڵکات و چواردەورەکەی ڕووناك بکاتەوە، وە لەو جێیەدا نوورەکان و بریسکەکان و تیشکەکان بێنێتە مەیدان.

مامۆستا ئەمانەی دڵسۆزانە و لە قووڵایی دڵ و بێ زویربوون لە هیچ کەسێك ئەنجام دەدا. پاشانیش دەیوت "مادەم نووری حەقیقەت، لە دڵە بە ئیمان تینووەکاندا کاریگەری دروست دەکات. نەك یەك سەعید، هەزار سەعید بەفیدا بێت. لە ئازار و ناڕەحەتی بیست و هەشت ساڵەم و هەموو ئەو ئەشکەنجانەی چەشتوومن، هەموو ئەو چەرمەسەرییانەی ڕووبەڕوویان کردوومەتەوە، گەردنیان ئازاد بێت، گەردنی هەموو ئەوانە ئازاد دەکەم کە زوڵمیان لێکردووم، ئەم شار و ئەو شاریان پێکردووم، سوکایەتییان پێکردووم، ویستویانە بە تۆمەتی جۆراوجۆر تاوانبارم بکەن و لە زیندانەکاندا جێگەیان بۆ ئامادە کردووم. بە قەدەری دادپەروەریش دەڵێم "من شایەن بووم بەم زللە میهرەبانییانەی تۆ، گەر ئەمانە نەبوونایە و منیش وەك هەموو کەسێك ڕێگەیەکی تەواو بێ زیان و سادە و ڕێپێدراوم هەڵبژاردایە و تەنها بیرم لە خۆم بکردایەتەوە و فیوضاتە ماددی و مەعنەوییەکانم بەخت نەکردایە، ئەم هێزە مەزنە مەعنەوییەی خزمەتکردنی ئیمانم لەدەستدەدا." بەڵێ، مامۆستا لە ڕێی ئەم وشانەیەوە خاڵی یەکگرتنی سێگۆشەی زوڵمی ئەهلی دونیا و دادپەروەریی قەدەر و لەخۆپرسینەوەی خودمان نیشان دەدات.

بەڵێ، کاتێك مرۆڤ ئەم ڕاستییەی دەرك پێکرد و لێی تێگەیشت، ئیدی کەس تاوانبار ناکات و دەڵێت "تاوانبار منم، خوا دەرفەتی ئەرك ڕاپەراندنی بۆ ڕەخساندم، بەڵام من مافی ئەرکەکەمم بە تەواوی نەدا، ئەویش بە چەشتنی هیجرەت و هیجران دادپەروەریی لەگەڵ نواندم، گەر ئەهلی دونیاش زوڵمیان لێم

کردووە، ئەوا من نابمە سزادەریان بەڵکو ئەو کارە خاوەنی خۆی هەیە".

بەڵێ کەموکوڕی و عەیبی ئێمە ئەوەیە لەو ڕووداوانەی بە سەرماندا دێن ڕووی ڕەحمەت نابینین، مافی ئیرادەمان لە بەرامبەر نەخۆشییەکانی ئولفەت و ئونسییەتەوە نادەین. ئەرکی بەندایەتیمان بە عەشق و شەوقەوە بە ئەنجام ناگەیەنین، ناتوانین زوڵمی کەسانی دی حەواڵەی خوای دادپەروەری ڕەها بکەین و بە لێپرسینەوەی خۆمانەوە خەریك بین. ناتوانین تەنها بە کاری خۆمانەوە سەرقاڵ بین. بۆچی دەنگ و سەدای ئێمە وەك ئیکسیرێك بەفری ڕۆحی دوێنراوەکانمان ناتوێنێتەوە؟ بۆچی ناتوانین ئەم ئاینەمان کە پڕ لە جوانیی بێ وێنەیە بە شێوەیەکی دروست بەرجەستە بکەین؟ دەبێت دەردی ئێمە هەر ئەم خاڵەبێت.

## کەسێتیی مەعنەوی

وەك پێشتر لە دەرفەتی جۆراوجۆردا باسم کردووە، ئایەت و فەرموودە پیرۆزەکانی وەك "دەستی خوا لە سەروو دەستی هەموو بەیعەتکارانەوەیە"[1] و فەرموودەی "لە کۆمەڵدا ڕەحمەت و لە جیاییدا سزا هەیە"[2] و "ئوممەتی من لە سەر گومرایی یەك ناگرن!"[3] دەربڕی گرنگیی ژیانی کۆمەڵن لە نێو پەیڕەوانی ئاینی ئیسلامدا. لە ئاینی ئێمەدا یەککگرتن لەگەڵ کۆمەڵ و ژیان بەشێوازی کۆمەڵەیی زۆر گرنگە. دەبێت ئەوە بڵێم کە مەبەستم لە واژەی "کۆمەڵە - جەماعەت" واتا سۆسیۆلۆژییەکەی نییە بە واتای پێکهاتە یاخود

---

١. الفتح: ١٠.
٢. أحمد بن حنبل، المسند ٢٧٨/٤؛ البزار، المسند ٢٢٦/٨.
٣. إبن ماجة، الفتن ٨؛ عبد بن حميد، المسند.

گردبوونەوەیەکی کۆمەڵایەتی، بەڵکو بە تەواوی واتا وەك واژەیەکی ئاینی و بەو واتا مەزنەی کە لە ئایەت و فەرمووده پیرۆزەکاندا باسی کراوه و بە واتای ئەو کەسێتییە مەعنەوییە بەکاری دەهێنم کە تاکەکانی کۆمەڵەکە پێکی دەهێنن و وایان لیَ دێت هەست و بیر و خۆشی و خەمیان یەکانگیر بێت و یەکبوونێکی تەواوەتی لە نێوانیاندا بێتە دی.

بەڵێ یەکبوون و بە هەمان ئاراستە جووڵان و بەرەو هەمان شوێن ڕۆشتن.

بە وێنەی ئەو کۆمەڵە هونەرمەندەی لە ئۆرکێستراکەدا هەریەکە ئامێرێکی جیاوازیان پێیە بەڵام هەموو بەیەکەوە پیَ دەدەن بە زەویدا و بۆ یەك ئاواز دەژەنن و هەوڵی دروستکردنی یەك دەنگی هاوبەش دەدەن، هەرواش لەم کۆمەڵەیەدا تاك بە ئازاری ئەوانی دی ئازار دەچێژێت و لە خۆشحاڵ بوونیان چێژ دەبات، لە هەمان کاتدا "ئاخ" یان لەگەڵ هەڵدەکێشێت و هاوبەشی خەمیان دەبێت، هەروەها بە ئاسودەییان ئاسوده دەبێت و زیاد لەوەی بۆ چەرمەسەرییەکانی خۆی خەم بخوات لە بیری نارەحەتییەکانی ئەواندایە و بۆ ئازاری برایەکی لە دڵەوه دەڵێت "خۆزگە ئەمە بەسەر ئەودا نەهاتەیە و بەسەر مندا بهاتایە". جا ئەم حاڵەتی خۆشحاڵ بوونە بە خۆشی ئەوانی دی، ئەو پەسنەیە کە ئیسلام چاوەڕێیە موسوڵمانان لە خۆیاندا بیهێننە دی.

وەك چۆن ئەندامێکی ئیفلیج بووی لەش بە جۆرێك لە جۆرەکان لە جەستە دابڕاوه و بە تێکچوونی ئەو سەنتەرەی لە مێشکدا کۆنترۆڵی دەکات لە ژیانی هاوبەشی لەش جیابۆتەوه، هەرواش کاتێك تاك لەگەڵ کۆمەڵدا یەکبوون بەدەستنەهێنێت، ناتوانێت لە پیت و بەرەکەتی کۆمەڵەکە سوودمەندبێت. لەڕاستیدا کۆمەڵێکی باوەڕدار نوێنەرایەتی پلەی ویلایەت دەکات. بەتایبەت لە سەردەمێکدا کە خۆپەرستی و خۆویستی زۆر زەق بوویێتەوه، پلەکانی قوطبییەت

و غەوسییەت لە لایەن ئەو کەسێتییە مەعنەوییەوە نوێنەرایەتی دەکرێت کە کۆمەڵی باوەڕدارە صالحەکان پێکیانهێناوە. هەر باوەڕدارێکیش چەندە خۆی بە تاکێکی نێو کۆمەڵی باوەڕداران بزانێت و ژیان و هەستەکانی لەگەڵیان بەش بکات، هێندە بەشی دەبێت لەم پلەی غەوسییەت و قوطبییەتەدا. بە پێچەوانەوە گەر پلەی غەوسییەت بە کۆمەڵێك ببەخشرێت و تاکێکی نێو ئەو کۆمەڵەیە هەمان هەست و بیری باوەڕدارانی دیکەی نەبێت و خۆی بە تاکێکی ئاسایی نێو براکانی نەبینێت، هێندەی تاکە کەسێکیش لەو لوتفانە بەهرەوەر نابێت کە بەو کەسێتییە مەعنەوییەی کۆمەڵەکە دەبەخشرێت. بۆیە پێویستە هەموو تاکێك بە تەواوی واتا لەگەڵ یەك بەیەکی ئەندامانی کۆمەڵەکەدا هاوگیان بێت و دڵی لەگەڵ ئەواندا لێبدات و خۆشییەکانیان لە دەروونیدا هەست پێ بکات و سوێ بۆ ئازارەکانیان بچێژێت و گەر خۆشی برسی بووە هەوڵ بدات ئەوانی دی تێر بکات.

لە نێو کۆمەڵێکدا کە تاکەکانی بەمشێوەیە بەیەکەوە گرێدرابن دەشێت هەمیشە قوطبییەت و غەوسییەتیش هەبێت. ڕەنگە هەریەکە لەو قارەمانانەی لە داستانی چەنەککالەدا شەهیدبوون، بۆخۆیان وەلییەك بن، بەڵام ئەوەی ناوی ئەوانی کردۆتە داستان، لەڕاستیدا ئەو کەسێتییە مەعنەوییەیە کە لە یەکبوونی قەلبی و ڕۆحی ئەوانەوە لەگەڵ یەکدیدا دروست بووە و ویلایەتی ئەو کەسێتییە مەعنەوییەیە. کۆمەڵێکی لەم شێوەیە خۆ بە خۆ وەك پارێزەرێکیان لێدێت بەرامبەر بەڵا و موسیبەتەکان، خودای مەزن دەفەرموێت:

﴿ وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا مُصْلِحُونَ ﴾ (هود: ١١٧)

واتە "پەروەردگارت هەرگیز شوێنێك بە ناحەق تەفروتونا ناکات کە خەڵکەکەی دروست ڕەفتار بکەن و هەوڵی چاککردنی نەفسی خۆیان و ئەوانی تریش بدەن."

بەڵێ، گەر لە ناو گەلێکدا کۆمەڵێك خێرخواز و هزرپاك و چاکەکار بوونیان هەبێت، خوا (جَلَّ جَلَالُهُ) ئەو دێیە و ئەو شارە و ئەو وڵاتەی ئەوانی تێدان، وێران ناکات. ئەو گەلێك لە ناو نابات کە یەکبوونیان لە نێودا بێت و بوویێتنە (دیوارێکی زۆر پتەو) و تاکەکانی وەها دەست و دڵ یەك بن کە مەگەر بە لێدانێك کە گیانی هەموویان بە جارێك بکێشێت بتوانرێت بڕوخێنرێن، پەروەردگار کۆمەڵێکی لەم شێوەیە بە هیلاکەتدا نابات. بەڵام گەر ئەو تاکانەی گەلێك دروست دەکەن لەم کەسە چاکەخواز و سەرڕاستانە نەبن، ئەوە دەبێت لە سەرەنجامی ئەو گەلە بترسین.

ڕەنگە وەلییەك بتوانێت تەواوی مەزهەریەتە ئیلاهییەکان بەدەست بخات. بەڵام ئەو وەلییەش پێویستە لەگەڵ کۆمەڵی باوەڕداران یەکبوونی خۆی بپارێزێت و هاوشان لەگەڵ ئەو مرۆڤانەدا ژیان بەسەربەرێت. پێویستە دامەزراوەکان لە ڕێی دەستەکانەوە بەڕێوەببرێن، لە دەستەی بەڕێوەبردنی مزگەوتێکەوە تا ئەنجومەنی شارەوانی، مەبەستمان لە "دەستە" گردبوونەوەی چەند کەسێکە لە چوارچێوەیەکدا و ڕاپەڕاندنی کۆمەڵێك ئەرکە کە دەکەوێتە سەر شانی هەر ئەندامێك و تاووتوێکردنی ڕاوبۆچوونە دەربارەی ئەو ئەرکانە. لێرەدا تاك بۆچوونێك کە بە دروستی دەزانێت بۆ هاوڕێکانی باس دەکات و هەوڵی قایل کردنیان دەدات بۆ بەئەنجام گەیاندنی، جا گەر بۆچوونەکانیشی پەسەند نەکرێن دووبارە یەکبوون و هەماهەنگیی خۆی لەگەڵ دەستەکەدا بەوپەڕی توندوتۆڵی دەپارێزێت. دەتوانێت لە دەرفەتێکی دیکەدا ئەو بۆچوونانەی لای پەسەندبوون دووبارەیان بکاتەوە، گەر دووبارەش پەسەند نەکرێن ئەم هەر وەك تاکێکی کۆمەڵەکە بەردەوام دەبێت لە هاوکاروانی دەستەکەی. بۆی نییە وەك (ئەو ناڕەزاییەتییانەی لە نەریتی دادگاکاندا باوە) ناڕەزایەتی دەرببڕێت لە ناو کۆمەڵەکەیدا. لە دەرەوەش هەرگیز ڕەخنە و ناڕەزایەتی دەرنابڕێت.گەر وەهای کرد ئەوە غەیبەتی کردووە.

غەیبەتی دەستە و كۆمەڵەش گوناهێكە لێخۆشبوونی نییە، چونكە ئەو كەسەی غەیبەتی كۆمەڵێك بكات پێویستە گەردنی خۆی بە تەواوی ئەندامەكانی ئەو كۆمەڵەیە ئازاد بكات، وە گەرنا لە دوارۆژدا ناتوانێت خودی خۆی دەرباز بكات. ئەو كەسەی غەیبەتی كۆمەڵ و جەماعەتێك بكات و كەسێتی مەعنەویی ئەو كۆمەڵەیە بە بچووك دابنێت و لە ئەرزشی كەم بكاتەوە، گوناهێكی زۆر گەورەی ئەنجام داوە. بۆ نموونە لە كۆبوونەوەیەكدا كە بە مەبەستی هەماهەنگی نێوان قوتابخانە و خێزانی خوێندكار رێك دەخرێت هەمووان دەبێت هەر بۆچوونێكیان هەیە لەوێدا دەریببڕن. لەوێدا ڕەنگە ئەو بۆچوونە لە لایەن بەشداربووانی كۆبوونەوەكەوە پەسەند بكرێت، رەنگە پەسەندیش نەكرێت. جا ئەو كەسەی بۆچوونەكەی پەسەند نەكراوە بۆی نییە بڵێت "عەقڵیان هێندە تیژ نەبوو تا لە بۆچوونەكەی من تێبگەن و پەسەندی بكەن" بە هیچ شێوەیەكیش بۆی نییە لە دژیان قسەبكات. ئەمانە ئەو تایبەندمەندییانەن كە ئاینەكەمان زۆر بە هەستیارییەوە جەختی لێكردوونەتەوە و پێشێل كردنیشیان دەبێتە غەیبەت و ڕەنگە بە گوێرەی حاڵەتەكە ببێتە بوختانیش، كە هەردووكیان دوو گوناهی زۆر گەورەن.

هەندێك جاریش، كەسانێك لە ڕێگەی بێ گوناه دانانی خۆیانەوە خۆیان دەخەنە نێو شیوی غەیبەتەوە، هەر هێندەی دەرفەتێكیان دەستبكەوێت ناخیان خاڵی دەكەنەوە و كەسێكی دی دەخەنە بەر پاچی تانە و تەشەر و بیرە خراپەكانیانەوە. لە كاتی ئەنجامدانی ئەمەشدا نەفسی خۆیان تەزكیە دەكەن، لە پێشدا بە وتنی وتەیەكی لەم شێوەیە "هێندەی گەردیلەیەك نیازی خراپ لە دڵمدا نییە بەڵام..." نەفسی خۆیان پاك نیشان دەدەن و پاشان دەست پێ دەكەن و ئەوەی بوترێت و نەوترێت سەبارەت بەو كەسەی مەبەستیانە دەیڵێن. گەر دەرفەتێكی تریشیان دەست بكەوێت ئەم جارە سەبارەت بە كەسێكی دیكە دەدوێن و هەوڵی

شکاندنی کەسێتی ئەو دەدەن. بەمشێوەیە هەر دەرفەتێك و کەسێکی دیکە، تا وای لێدێت جگە لە خۆیان هەموو کەسێکی دیکە بە خراپ دەزانن و هەوڵی شکاندنیان دەدەن. کەچی هێشتاش بەردەوام دەبن لە وتنی "بە غەیبەت نەبێت، بەڵام..!!" ئەمە.. ببورن کە وا دەڵێم، بەڵام... هێندە غەیبەتێکی موونافیقانەیە کە وێنەی نییە و گوناهێکە کە پێویستە هەر بەندەیەکی سەرڕاست و هەر قوتابییەکی دڵسۆزی قورئان فەرسەخ فەرسەخ خۆی لێ بەدوور بگرێت. بەڵێ غەیبەتکردن لە ڕێگەی شاراوە و بە تێکدان و بە لاڕێدا بردنی بابەتەکان و خۆ بە بێ گوناه نیشاندان خودی خودی نیفاقە.

بەڵێ، لە دوای ئەمە ئەوەی پێویستە هەستی "دەستەجەمعی"ە گەر ئیجتهادیش بکەین بەهەستی دەستەجەمعییەوە و گەر قورئان تەفسیر بکرێت و گەر فەرمودەش لێکبدرێتەوە هەر پێویستە بە شێوازی دەستەجەمعی بێت. ئەوانەش کە دەتوانن خزمەتی ئوممەت بکەن هەر ئەوانەن کە وابەستەی ئەم هەستە دەستەجەمییەن لە جموجۆڵەکانیاندا، ڕەحمەتی خوا بەسەر ئەمانەوەیە و سزا و نەگبەتیش بۆ ئەوانەیە کە بە تەنها ڕێ دەکەن، ئەوانەی بە هەستی "من خۆم بۆ خۆم بەسم"ەوە دەجوڵێنەوە و بە تەنها ملی ڕێیەکیان گرتووەتە بەر، گەر ئەمانە زۆر زیرەك و بگرە بلیمەتیش بن ناتوانن ڕێگەی دروست بدۆزنەوە.

ئەو مژدانەش کە لە خەون یاخود بێداریدا دەبینرێن بە زۆری پەیوەستن بە کەسێتیی مەعنەوییەوە نەك بە خودی کەسەکەوە. بۆ نموونە شانازیی مرۆڤایەتی (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) دێتە لای یەکێك لە هاوڕێیانی ئێوە، دەیدوێنێت و مژدەی پێدەدات، لە خەوندا یاخود لە بێداری ڕەنگە ئەمە ڕووبدات. لە ڕاستیدا ئەو گرنگی پێدان و مژدەیە بۆ کەسێتی مەعنەوی کۆمەڵەکەتان دەگەڕێتەوە. وەك چۆن کاتێك سەرکردەیەك دەستی سەربازێکی دەستەی یەکی فیرقەی یەکی

لیوای یەك دەگرێت و دەڵێت "هاورێیان لە جێی هەمووتان لەگەڵ ئەم هاوڕێیەتان تەوقە دەکەم"، تەواوی سەربازەکان هەست بە گەرمی دەستی سەرکردەکەیان دەکەن لەدەستیاندا، هەرواش ئەو گرنگی پێدانەی لە خەونەکەدا دەبینرێت بۆ کەسێتی مەعنەوی دەگەڕێتەوە نەك بۆ خودی کەسەکە. هێندە هەیە، دەکرێت مژدە و گرنگی پێدانەکان بە گشتی لەسەر دەستی ئەو فیداکارانە بێت کە نەفسی خۆیان لە نێو کۆمەڵەکەیاندا تواندووەتەوە و لە جێی ئەوەی بۆ خودی خۆیان بژین بۆ کۆمەڵەکەیان دەژین.

بەڵێ پێویستە زۆر دڵنیابین لەوەی لەم سەردەمەدا خودی کەس نییە، بەڵکو کەسێتی مەعنەوی هەیە. ویلایەت گەر هەبێت هی کەسێتی مەعنەوییە و گەر قوطبیەتیش هەبێت دووبارە هی کەسێتی مەعنەوییە. بەڵام ئەمە بەواتای ئەوە نیە هەوڵی ئەو کەسانەی بە جۆرێك لە جۆرەکان زووتر هاتوونەتە ئەم مەیدانە و ساڵانێك خزمەتی ئاین و ئوممەتیان کردووە بە هیچ دابنێین. ڕێزگرتنی بچوك لە گەورە و لە سینەگرتنی بچوکەکان لە لایەن گەورەکانەوە دروشمی هەمیشەیی باوەڕدارانە.

لە لایەکی دیکەوە دەبێت ئەوە بزانین کە گەر خۆمان ئەو هاوڕێیانەمان نەنرخێنین کە ئەرکیان لەسەرشانە و خزمەتی کۆمەڵگا دەکەن، کەسانی دیکەش نرخ و بەهایان نازانن. گەر ئێمە قسەکانیان پەسەند نەکەین، کەسانی دیش پەسەندیان ناکەن. خەڵکی ئەرزڕۆم قسەیەکی زۆر جوانیان هەیە، دەڵێن "قەدری میوان لای خاوەن ماڵە." کاتێك لە تەمەنی چواردە پانزە ساڵیدا بووم، تا ڕادەیەك بەهۆی ویستی باوکمەوە و بۆ ئەوەی ڕابێم بە درێژایی مانگی ڕەمەزان لە گوندەکەی خۆمان وتارمدا. مامێکم هەبوو کەسێکی زۆر ژیر و بە ڕووی مەعنەوییەتدا کراوەبوو لەلام. ناوی ئەنوەر بوو. کە بە کۆڵانێکدا بەیەکەوە

بڕۆشتینایه له دوای منهوه دهڕۆشت و ههوڵی دهدا به هیچ شێوهیهك پێش من نهکهوێت. زۆر بهڕێزهوه مامهڵهی لهگهڵ دهکردم. ڕۆژێك پێم وت "مامه، زۆر ناڕهحهت دهبم بهم شێوهیه، خۆزگه وههاتان نهکردایه"، لهوهڵامدا وتی "کوڕم، ئهوه خاوهن ماڵه که قهدر به میوانداریی دهبهخشێت. گهر من ڕێزت بهرامبهر نیشان نهدهم، خهڵك قهبوڵت ناکهن".

ڕێزگرتنی مامم بهم شێوهیه و لهبهر ڕێزی وتار و ئامۆژگاریهکانی من بۆ خهڵکی، سهرباری ئهوهی من لهو تهمهنم بچوکتر بوو و برازای ئهوبووم ههرگیز لهیادم نهچووه. منیش ههوڵمداوه ڕهچاوی ئهم خاڵه بکهم لهگهڵ ئهو هاوڕێیانهمدا که بڕوام وابووه دهتوانن سوودبهخش بن بۆ کهسانی دی. بۆ نموونه کاتێك له مزگهوت و مهدرهسهی "کهستانهبازاڕی" بووم یهکێك له هاوڕێیانمان که قوتابیی پۆلی شهشهمی دواناوهندیی بوو، کردمانه مامۆستای خولی فێربوونی قورئان. ئهو هێشتا قوتابی بوو، بهڵام چونکه ئهرکی مامۆستایهتیشمان پێدابوو، ههوڵمدهدا شایان به پایهی مامۆستایهتییهکهی ڕهفتاربکهم. ڕۆژێك یهکێك له مامۆستاکانی خولهکه ناوی قوتابییهکانی دههێنا، به "عهبدوڵڵای خۆمان.. ئیسماعیلی خۆمان .." ناوی دهبردن. منیش دهموت "مامۆستا عهبدوڵڵا وههای وت. مامۆستا عهبدوڵڵا وههای کرد." بهم شیوهیه چهند جارێك به "مامۆستا" بانگم کرد. ئهو مامۆستایه پرسیاری لێکردم "ئهم مامۆستا عهبدوڵڵایه کێیه؟"، لهوهڵامدا وتم "مامۆستا گیان، گهر ئێمه مامۆستایهتی ئهو قهبوڵ نهکهین، کهس قهبوڵی ناکات. مادهم کردوومانه به مامۆستا له خولهکهدا، دهبێت خۆشمان مامۆستایهتییهکهی قهبوڵ بکهین و وهك مامۆستا ڕهفتاری لهگهڵدا بکهین."

بهڵام، بهداخهوه ههندێك شت ههیه ڕوویهڕووی لێکدانهوهی ههڵه دهبێتهوه. بۆ نموونه وتهی "برا نابێته باوکی برا و پلهی مورشید و ڕێبهر بهرامبهر براکهی

وەرناگرێت" پێوەرێکی زۆر ڕاست و گوفتارێکی وەك ئاڵتونە. بەڵام کاردانەوەکان بەرامبەر بەم وتەیە دەبێت بەگوێرەی کەسەکان جۆراوجۆر بێت. هیچ کەس نابێت خۆی لە کەسێکی دیکە بە باشتر بزانێت، یاخود بە هیچ شێوەیەك بیر لە بەرزیی خۆی بکاتەوە بەرامبەریان. بەڵام هاوڕێکانی ئێوە و ئەوانەش لە ئێوە بچوکترن، دەبێت لێپرسراوێتی خۆیان بزانن و ڕێز و قەدری پێویست نیشان بدەن. ئێوە مافی ئەوەتان نییە داواکاری یەك لەسەر دەی ئەو ڕێزەش بکەن کە بەرامبەرتان نیشان دەدرێت. گەر داواکارییەك لەسەر دەی ببن ئەوا بە سەد هێندە زوڵمتان کردووە. بەڵام نازانم داخۆ گەر هاوڕێکانیشتان دە هێندەی ئەو ڕێزەی ئێستا نیشانی دەدەن بنوێنن، هێشتا ئەرکی سەرشانیان بەجێ گەیاندووە؟

ئەمانە شتانێکی لە یەك جودان و نابێت تێکەڵ بە یەکدی بکرێن. هەر لە دێرینەوە لە فەرهەنگی ئێمەدا بەڕێزەوە ڕەفتار لەگەڵ گەورەکان کراوە. بەڵام پایە و پێگە و مەقام لە ڕێبازی ئێمەدا بوونی نییە. هەمووان تاکێکی سادەی نێو کۆمەڵین، هێندەی بتوانین خزمەتی ئاین و گەلەکەمان دەکەین، هەرگیزیش سکاڵاکار نین لەسەر ئەو حاڵەی کە تێیداین.

من، گەر شەرەفی فەتحی ئیستانبوڵم لە عەرشی ڕەحمەتەوە بۆ بکەنە نێو پاکەتێکی دیاری و بۆمی بنێرن، قەبوڵی ناکەم... حاشا... ئەمە بە واتای نرخ کەمکردنەوەی ئەو فاتیحە مەزنانە ناڵێم، بەڵکو بۆ ڕوونکرنەوەی نرخ و چێژی بەندە بوون و بەندایەتی و باوەڕداریی بە نموونەی دەهێنمەوە. بەندایەتیی بەندەیەك وەك هەموو بەندەکانی خودا و باوەڕدارێك لە ڕیزی هەموو باوەڕداراندا. لە بەرامبەر پێشنیارێکی وەهادا من حاڵی خۆم هەڵدەبژێرم. کوڕی مامۆستایەك لە دێیەکی بچوك ژیانی نێو بینای کەڕووگرتوو، تاقی پەنجەرە، بنجی دیوار، کولبەی بچوك، دابڕان، بەشخوران، ئەشکەنجە، ئازار، ڕەهەندیی... بەڵێ، دووبارە ئەم ڕێگایە هەڵدەبژێرم کە "ئەو" بۆی هەڵبژاردووم.

چونکە لەم ڕێبازەدا کەس و کەسێتیی تاك نییە، بەڵکو تاکی نێو کەسەکان هەیە ... وەك ئەوەی مامۆستا دەڵێت "سەعید نییە"[1]، لەم ڕێیەدا کە بەشوێن ڕەزامەندیی ئیلاهییەوەین زمانی نەفس و ئەنانیەت و هەوا و هەوەس بوونی نییە، تەنها حەقیقەتە کە باسی لێوە دەکرێت. کێ حەددی هەیە بڵێت "من" و لە بەرامبەر بانگەوازی یەکتاپەرستییەوە بگلێتە نێو هاوبەش بۆ خوا دانان.

## هاوسەنگیی نێوان هەوڵدان بۆ پەیداکردنی ڕۆزی لەگەڵ خزمەتکردنی ئاین

پرسیار: پێویستە هاوسەنگیی نێوان هەوڵدان بۆ پەیداکردنی ڕۆزی لەگەڵ خزمەتکردنی ئاین چۆن بێت؟

وەڵام: باوەڕدار مرۆڤی هاوسەنگییە، دڵی باوەڕدار وەك تەواوی بوارەکانی دیکە لەم بوارەشدا بە باشی دەزانێت خۆی بپارێزێت لە زیادەڕەویی و کەمتەرخەمی (افراط، تفریط). گرنگیدان بە دونیا هێندەی تێیدا دەمێنیتەوە و گرنگی دان بە دوارۆژ دووبارە بە هێندەی ئەو ماوەیەی تێیدا دەمێنیتەوە، ئەو دەستوورەیە کە دەبێتە خاڵی دۆزینەوەی ئەم هاوسەنگییە، لەبەر ئەم هۆیە پەیوەندیی ئێمە لەگەڵ دونیادا بەندە بە مەشخەڵی "نیشاندانی عیززەتی ئیسلامەتی لە هەموو جێیەك"، بەندە بە گەیاندنی ئەو ڕاستییە وەك ئەڵماس درەخشانانەی لە خۆماندا بەرجەستەمان کردوون، بەندە بە نیشاندانی ئەم ڕێگە نوورینە بە هەموو مرۆڤایەتی. پاش ئەوەی ئامانجی سەرەکیمان ئەمە بوو، لاکردنەوەیەکی نیونیگایی ناوبەناویشمان بۆ دونیا و بە لاچاو تەماشاکردنێکمان بۆی دووبارە هەر خزمەت بەم مەفکورە مەزنەمان دەکاتەوە.

---

١. بەدیعوززەمان، پاشبەندی ئەمیرداغ.

بەڵێ، پێویستە لەسەر ئێمە ژیانمان بە تەواویی بە گوێرەی وانەکانی ئەم ئایەتە پیرۆزە ڕێك بخەین:

﴿ وَٱبۡتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنۡيَاۖ وَأَحۡسِن كَمَآ أَحۡسَنَ ٱللَّهُ إِلَيۡكَۖ وَلَا تَبۡغِ ٱلۡفَسَادَ فِي ٱلۡأَرۡضِۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴾

(القصص: ٧٧)

واتە "هەوڵبدە بەو (گەنج و سامان)ەی خوا پێی داوی دوارۆژت بەدەس بێنیت و بەشی خۆشت لە دنیادا بەحەڵاڵی فەرامۆش مەکە، چاکە لەگەڵ بەندەکانی خوادا بکە هەروەك خوا چاکەی هێناوەتە ڕێت، نەکەیت هەوڵی فەساد و گوناه و تاوان بدەی لە زەویدا، چونکە بەڕاستی خوا ئەو کەسانەی خۆشناوێت تۆوی خراپە دەچێنن."

چونکە لەو ئایەتە پیرۆزەدا خواوەند بۆ دەربڕینی "دوارۆژت بەدەست بهێنە" وشەی "ابتغا" ی داناوە کە بە واتای ئەوە دێت "بە تەواوی بوونتەوە ڕوو لە دوارۆژ بکە و هێندەی مەزنی دوارۆژ نرخ و گرنگی پێ بدە." وەك لەمەشەوە تێدەگەین، پێویستە تەواوی هۆکارەکان بۆ دەستخستنی دوارۆژ بەگەڕبخرێن و بۆ دونیاش لەسەر بنەمای "بەشی خۆت بیر نەچێت" مامەڵە بکەین.

لەم دونیایەدا، هەموو کارێك لە دەرەوەی ناسینی جەنابی حەق و ناساندنی بە کەسانی دی و بەجێگەیاندنی ئەرکی بەرزکردنەوەی ناوی الله "اعلاء کلمة الله" کارگەلێکن لە پلەی دووەم و سێیەمدا دێن. کار، مووچە، خوێندن، هاوسەرگیری، ماڵ و لانە...هتد هیچ کام لەمانە ئامانج نین، بەڵکو هۆکاری یارمەتیدەری ئامانجی سەرەکین. باوەڕدار پێویستە نەخشەی ژیانی بەگوێرەی ئەم پێوەرە دابڕێژێت. دەبێت بڵێت ئامانجی ژیانی من بڵاوکردنەوەی ئاینەکەمە. بەڵام

بۆ ئەوەی بتوانم بژیم، گوزەرانی ماڵ و منداڵم -گەر هەبێت- بەڕێ بکەم، چمکێکی ئەم ژیانە فانیەش دەگرم. خوا هەرچیم پێ ببەخشێت قەناعەتی پێ دەکەم. کەمم پێ ببەخشێت بەو کەمە ڕازی دەبم، گەر زۆریشی پێبەخشیم، هەم لێوانلێو لە هەستی شوکرانەبژێری، هەم هەوڵی خزمەتکردنی ناینەکەم دەدەم، هەم پێداویستییەکانی خۆم دابین دەکەم و ماڵ و منداڵەکەم بەخێودەکەم. هەڵپە ناکەم بۆ ژیانی دونیا، هەستی حیرص و هەڵپەکردنم تا دواین هەناسە لە پێناو بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوادا بەکاردەهێنم و بۆ بەدەستهێنانی ئەو ڕەزامەندییەش هەوڵی بەرزکردنەوەی ناوی پەروەردگار دەدەم لە هەموو جیهاندا. تا ئەوپەڕی بە هەڵپەم و حیرصم هەیە، تا ئەو ڕادەیەی کە ئامادەم لە پێناویدا بمرم، بەڵام من لە بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوادا هەڵپە و حیرصم هەیە. بەڵێ، باوەڕدار پێویستە بەم شێوەیە بیربکاتەوە و ژیانی لەسەر ئەم ڕێڕەوە بخاتە ڕێ، کارەکانی سەر بە دواڕۆژ بخاتە پێش هەموو کارەکانی دیکەوە و پاشان هەر کاتێك بۆ حەوانەوە کەمێك کەناری گرت، کارە دونیاییەکانی بە ئەنجام بگەیەنێت.

ئەو کەسانەش کە بونیادیان بە جۆرێك خوڵقێنراوە خاوەن توانایەکی دەروونین بۆ گەیاندنی ئەو پەیامە و بەرزکردنەوەی ناوی خوای گەورە، گەر بێت و ئەو تواناییە جوانانەی جەنابی حەق ئەوانی پێ ڕازاندۆتەوە بۆ بەدەستهێنانی کۆمەڵێك شتی سووك و پوچی دونیایی بە خەرج بدەن، خوا بە پێچەوانەی ئەوەی مەبەستیان بووە زللەیان لێدەدات، کەسێك کە بەم شێوەیە بێت، بە درێژایی ژیانی لە ڕاکردندا دەبێت کە چی هێندەی درێژیی سوژنێك ڕێگە تەی ناکات. چونکە بەدیهێنەری مەزن ئەم تواناییە ناوازانەی بۆ بەدەستهێنانی کۆمەڵێك شتی پوچی دونیایی بەو کەسە نەداوە. باری لە زەوی نوقمبووی کۆمەڵێك لەو کەسانەی خوێندنی ئایینییان تەواو کردووە و حاڵی پەرێشانیان نموونەیەکی

گرنگی ئەم باسەیە، بەداخەوە ئەوان لە دەرەوەی بیری گەیاندنی ئاین بیری دیکەیان کردووەتەوە و بەشوێن کارە بێ ئەرزشەکانی دونیا کەوتوون،

لە کاتێکدا ئەم دونیایە ئەرزشی بیرلێکردنەوەی نییە، ئەم تەمەنە کورتە بەم جۆرە بێت یاخود بە جۆرێکی دیکە هەر تێدەپەڕێت. مرۆڤ کە کارێکی ئاسان نەدۆزێتەوە دەتوانێت بڕوات لە جێیەك بەرد بکەنێت، گەر ئەوەش نەبێت لە جێیەك خاکەنازێك بە دەستییەوە دەگرێت و لە شوێنی وەستانی بێ ئیشەکاندا دەوەستێت، گەر ئیشی بۆ بوو، دەڕوات لە باخی کەسێکدا کاردەکات، خاکی بەر ماڵی کەسێك لادەبات و بەم شێوەیە گوزەرانی دابین دەکات. پاش نییەت و هەوڵی بەدەستهێنانی ڕۆزی حەلاڵ ئیدی ئەو کارەی ئەنجام دەدرێت، هەر کارێك بێت، زۆر گرنگ نییە. بۆ کەسێکی موسوڵمان ژیانی چینە ئەرستۆکراتییەکان بە هیچ شێوەیەك جێی بیرلێکرنەوە نییە، بەڵام گەر جەنابی حەق لوتف و ئیحسانی ماڵ و موڵکێکی لە ڕادەبەدەری بەخشی بە یەکێك ئەوە دەتوانێت بە دەم شوکرانەبژێری و پاراستنی خاکیبوونیەوە لەو شتانەی خوا پێی داوە سوودمەند بێت.

هەندێکجار کرانەوەی دەرگاکانی دونیا بە ڕووی مرۆڤدا و دەستکەوتنی نیعمەتە جۆراوجۆرەکانی ڕەنگە لە زەرەر و دژی ئەو کەسە بێت. جار هەیە دەوڵەمەندی و خۆشگوزەرانیی مرۆڤ توشی بێ شەرمی دەکات. ئاسان ڕۆزی پەیداکردن توشی لە خۆبایی بوونی دەکات و ژیانی کەشخەیی توشی ئیفلیجی دەکات. شێوازی ژیانی پڕ خۆدەرخستن و باق و بریق و ڕازاوەیی دەیکوژێت. لە کاتێکدا ڕێی خزمەتکردنی حەق مرۆڤی زیندووی پێویستە. مرۆڤی زیندوو ئەو کەسەیە کە دەتوانێت بە چەند پارچە نانێکی وشك تێر بخوات و لە سەر تاشە بەردێك سەری بنێتەوە و پێش ئەوەی بنوێت بڵێت "زۆر سوپاس بۆ خوا، تێرمان خوارد و جێگەیەکیشمان دۆزییەوە تێیدا بنووین."

مرۆڤێکی لەم شێوەیە بێ ئەوەی بۆ ئەو ڕووداوانەی لە دژی ڕوودەدەن و ئەو سەختییانەی دێنە ڕێی چۆك دابدات، بێ ئەوەی نائومێدیی و ساردبوونەوە بەرۆکی پێ بگرن، بێ ئەوەی واز لە کاروان هێنان و گەڕانەوە بە سوچی خەیاڵیشیدا گوزەر بکات لە ڕێکردن بەردەوام دەبێت. هەرگیز مەحاڵ قەبووڵ ناکات و هەموو هەوڵێك دەدات بۆ کردنەوەی ئەو دەرگایانەی پێویستە پێیاندا تێبپەڕێت. لە بۆنەیەکی دیکەدا باسم کردبوو، مێرووله گەر بزانێت لە نێو پۆلادا هەنگوین هەیە، دێت و شەش مانگ بە چواردەوریدا دەسووڕێتەوە و هەوڵ دەدات لە سوچێکەوە کونێك بدۆزێتەوە و بڕواتە ناویەوە. لە شوێنێکەوە لیکی دەڕژێنێت بە پۆلاکەدا و هەوڵ دەدات ژەنگی پێ بێنێت و کونی بکات. یاخود زۆر جار سەری زۆر شوێنی وەها هەڵدەدمیتەوە کە هەرگیز چاوەڕێ ناکرێت هیچ شتێکی تێدا بێت، لەو شوێنەدا مێرووله دەبینیت، ئەو بە ئامانجەکەیەوە بەستراوەتەوە و هەرچییەکی کردبێت ڕێگایەك دەدۆزێتەوە کە بەرەو ئەو ئامانجەی بەرێت، بە هەمان شێوە دڵێکی باوەڕداریش خۆی بۆ ئەرکی بەندایەتیی نەزر دەکات و ئەو کارانەی پێویستە بەجێیان بهێنێت هەرچۆن بووە و بە هەر شێوەیەك بووە بەجێی دەگەیەنێت.

لەم بابەتەدا سێ خاڵی گرنگ هەن کە پێویستە ڕەچاو بکرێت یەکەم: "امعان النظر - یەکلایی کردنەوە" ڕوانین واتە ڕووکردنە لایەك و ڕامان تێیدا و خۆ یەکلایی کردنەوە بۆی. دووەم: پاش ڕوانین، "اتصاق القلب - وابەستەیی دڵە"، واتە وابەستەییەکی وەها کە بە هیچ شێوەیەك ئەو بابەتە فەرامۆش نەکەیت و بێ ئەو نەتکرێت و هەر کات تەماشای دڵت کرد ئەو ببینیت، سێیەمیش ئەوەیە تەنانەت لە سەختترین مەرجەکانیشدا بتوانیت خۆت لە داوی لەمپەڕەکان ڕزگار بکەیت و هیممەت و هەڵمەتی بەردەوام بوون لەسەر ڕێ نیشان بدەیت، هەوڵی ڕزگاربوونت نەبێت بەڵکو عەزمی بەردەوامبوون لە ڕێت هەبێت.

مرۆڤ کە ڕەچاوی ئەم سێ شتەی کرد، ئیدی گەر جارێك پێشی هەڵکەوێت و لە سەردەم بە زەویشدا بدات دووبارە دەتوانێت خۆی ڕاست بکاتەوە و بەرەو وێسگەی ئامانج و ڕوانینی خۆی ڕێ بکات. گەر دەرگایەك بە ڕوویدا دابخرێت ئەو هەوڵی کردنەوەی دە دەرگای تر دەدات، گەر پەناشی بردە بەر حەزرەتی "مفاتح الابواب - گوشادکەری دەرگاکان" ئەوا لە بەرامبەر دەرگایەکەوە کە بە ڕوویدا دادەخرێت شاهێدی کرانەوەی دە دانە دەرگا دەبێت. بەڵێ، ئەوەی لە بەندەیەکی باشی خوا چاوەڕێ دەکرێت ئەوەیە بڵێت "يَا مُفَتِّحَ الأَبْوَابِ إِفْتَحْ لَنَا خَيْرَ الْبَابِ إِنَّكَ كَرِيمٌ جَوَّادٌ وَهَّابٌ" "ئەی خاوەنی کلیلی هەموو دەرگاکان، گوشادکەری گشت دەروازەکان، پەروەردگارا! باشترین دەرگا بۆ ئێمەش بکەرەوە، بێگومان تۆ پەروەردگاری میهرەبان و بەخشندە و بەخشەری فراوانی ئێمەیت" بەم شێوەیە پەنای بۆ بەرێت و پاشان ئەو ئەرکەی لەسەریەتی بەجێی بهێنێت.

بەڵێ، لەسەر بنەمای ئەم پێوەرانە دەبێت میراتگرانی سەرزەوی لە دونیا تەنها بۆ دواڕۆژیان سود بەرن و گەر پێویستیشی کرد بتوانن هەموو شتێکی دونیایی واز لێ بهێنن و دەستی لێ بشۆن، دەبێت بە ڕۆح ئامادەبن دونیا و جوانییەکانی وەك پێڵاوێك لە پێ داکەنن و بڵێن من هەر تۆم دەوێ هەر تۆ.

جەنابی حەق بە حەزرەتی موسا دەفەرموێت "فَاخْلَعْ نَعْلَيْكَ إِنَّكَ بِالْوَادِ الْمُقَدَّسِ طُوًى" واتە "پێڵاوەکانت دابنێ تۆ لە دۆڵی پیرۆزی (طوی) دایت"[1]، تەفسیری ئەم ئایەتە بێجگە لەو واتا گشتییەی موفەسسیرینی قورئان لێی تێگەیشتوون، ئێمە دەکرێت بەم شێوەیەش لێی تێبگەین، هەموو شتێك جگە لە ڕەزامەندیی ئەو دەبێت وەك پێڵاوەکانی حەزرەتی موسا لە دڵ بکرێتە دەرەوە.

بەڵێ، باوەڕدار دەبێت لە هەموو جێیەکدا هەست بە بوون و ئامادەیی ئەو

---

١. طه: ١٢.

بکات، دەبێت بتوانێت هەموو کاتێك بڵێت دونیا و ئەوانەی لە ناویدان بۆ من پێویست نییە و، ڕۆژی چەند جار ئامادەیی خۆی بۆ فیداکردنی هەموو دار و نەداری لە ڕێی ئەودا دووبارە بکاتەوە. دەبێت بەیانی کە هەستا بڵێت من کۆیلەی بەر دەرگاتم، بەندەی زریّ لە مل و زنجیر لە پێتم، سوێند بێت لە تۆ دوورناکەومەوە، تەنانەت گەر خۆشت دەرم بکەیت دوورناکەومەوە. بە ئەندێشەی ئەوەی کە ئەم بەڵێنەی کاڵبووەتەوە دەمی نیوەڕۆ ئەم پەیمان و بەڵێنەی دووبارە بکاتەوە. عەسریش جارێکی دیکە و ئێوارەش جارێکی دیکە پەیمان بۆ خوای مەزن نویّ بکاتەوە. کە ڕۆشتە نێو پێخەفەکەیەوە لەبەر خۆیەوە بڵێت "کێ دەزانێت چی ڕوودەدات"، و جارێکی دیکەش دەستی بەرزبکاتەوە و بەدەم زایەڵەی "خوایە، بە ئومێدی ڕەحمەت و ترسی سزاتەوە، خۆم تەسلیمی تۆ دەکەم، ڕوو بۆ لای تۆ وەردەگێرم، پەنایەك بێجگە لە تۆ و پاڵپشتێك جگە لە خۆت شك نابەم. پەروەردگارا باوەڕم هێناوە بەو کتێبەی داتبەزاندووە و بەو پێغەمبەرەی ڕەوانەت کردووە. سا پەروەردگارا، ئەو ڕۆژەی بەندەکانت زیندوو دەکەیتەوە لە سزای خۆت بمپارێزە." دەبێت هەم بەندایەتیی خۆی بۆ خوا نیشان بدات و هەم وەفا و ڕاستگۆیی بەرامبەر خاتەمی ئەنبیا بخاتە مەیدان.

گەر بەندە بەم شێوەیە بەرنامەڕێژیی بۆ ژیانی بکات، هێندەی ماوەی مانەوەی لە دونیادا ئاوڕ بە لای کارەکانی دونیادا بداتەوە و هێندەی ماوەی مانەوەشی لە قیامەتدا بۆ کارە قیامەتییەکان خۆی یەکلایی بکاتەوە و، پاشان ڕۆژانە چەند جارێك بەڵێن و پەیمانی بەندایەتیی نویّ بکاتەوە، ئەوا توانیویەتی هاوسەنگی نێوان دونیا و دوارۆژ ڕابگرێت. ئیدی بەندەیەکی لەم شێوەیە لە ڕوخساری هەموو ڕووداوێکدا ڕاستیی ئەم وتانە بەدیدەکاتەوە کە ئیبراهیم حەقی کردوونی بە شیعر:

لەو جێ کەوا نیتە چارێ،

لەناکاو پەردە لادەدرێ،

دەرمانی هەرچی دەردە دێ،

ببینە مەولا چی دەڵێ،

چی ئەو بیڵێ جوانی دەڵێ،

## دووبارە ڕێکخستنەوەی سفرەکان

ئەمرۆ کە کۆمەڵێك مرۆڤی زۆر لە چەندین ناوچەی جیا جیای جیهاندا خەریکی بەسەربردنی ژیانێکی کوللەمەرگی و هەژارین، کەسانێك کە وەك ئەوەی بارێکی قورس بێت لەسەر شانیان ژیان بەسەر دەبەن. لە جیهانێکی لەم شێوەیەدا دەبێت بەرامبەر هەمەچەشنی و زیادەڕەویی جۆرەکانی خواردنی سەر سفرەکانمان دڵمان بلەرزێت. خۆزگە چەندە کالۆریمان پێویستە هێندەمان خواردن بخواردایە و ئەمەشمان وەك پرۆتۆکۆڵێکی کۆمەڵایەتی لێبکردایە لە نێو خۆماندا، بۆ لەمەودواش چاوێکمان بە سفرەکانماندا بخشاندایەتەوە و دووبارە بەگوێرەی ئەمە ڕێکمان بخستایەتەوە، وەگەرنا جەنابی حەق ئەو جیهانە دەڕووخێنێت کە لەسەر بنەمای نادادپەروەری بنیات نرابێت. ئەم بابەتە شتێکە لە بیری خەڵکی ئێمە دەچێتەوە، بۆیە پێویستە دووبارە و دووبارە بیریان بخرێتەوە.

## خۆزگە!...

خۆزگە!... وەك مرۆڤێکی سادە و بێ ئەوەی هەرگیز بیر لە جیاوازبوون و بەرزتربوونی خۆمان بکەینەوە، هەستاینایە بە کاری خزمەتکردن. خۆزگە بە

هەر چوار لای دونیادا بگەڕاینایە و بێ جیاوازیی ئاین و زمان و ڕەنگ و ڕەگەز هەوڵی یارمەتیدانی مرۆڤەکانمان بدایە. ئاینەکەمان، ئەو حەقیقەتانەمان بگەیاندایە کە بە ڕاستیان دەزانین، بەڵام بێ هیچ چاوەڕوانییەك ئەمانەمان ئەنجام بدایە.

خۆزگە!... دوور لە لێڵ کردنی بیر و هەستە پاك و سازگارەکانمان بە شتانێکی وەك پلە و پایە و ناوبانگ و شان و شەوکەت، پێویستییەکانی بەندایەتیمان بە جێ بگەیاندایە. ژیانمان تەنها بە گەیاندنی ئاینەکەمان و ناساندنی پەروەردگارمانەوە ببەستایەتەوە. لە هەر شوێنێك بوینایە و لە هەر پلەیەکدا بوەستاینایە، تەنها و تەنها ئامانجمان ئەوە بووایە پەیامی ئیلاهی بە زایەڵەیەکی بە گوڕترەوە بگەیەنین بەو مرۆڤایەتییەی وەك ئاو و نان پێویستی بەم پەیامەیە. وەستانەکەشمان بە داهاتووی خۆمانەوە نەبەستایەتەوە، بەڵکو بمانبەستایەتەوە بە خۆشبەختی و ئاسودەیی مرۆڤایەتییەوە. تەنها بیرمان لای خوا بووایە و بە ناو و یادی ئەوەوە هەستاینایە و دانیشتینایە، ڕێمان نەدایە خەیاڵێکی دیکە بە بینایی و بیرماندا گوزەر بکات، خۆزگە!...

لەم ڕێیەدا کە بەشوێن ڕەزامەندیی جەنابی حەقەوەین، دەستکەوتە ماددیەکان لە لایەك، بگرە دەبێت دەستکەوت و فیوضاتە مەعنەوییەکانیش لە بیرببەینەوە و وەك تاکێکی سادە خزمەتکردن بکەینە ئامانجمان. بەشوێن ڕەزامەندیی ئەوەوە بوون، وەك بەندەیەکی سەرڕاست و بە ئیخلاس بەخششێکی هێندە مەزنە کە بە هیچ شتێك ناگۆڕدرێتەوە. پایە مەعنەوییەکان، کەرامەت، کەشف، خوێندنەوەی ناخی بەرامبەر و لەم ڕێیەوە کاریگەریی دروست کردن لە سەریان نابێت ئەو ئامانجانە بن کە ئێمە بە شوێنیانەوە بین. گەر وەك لوتفێکی پەروەردگاریش نیعمەتێکی لەم شێوەیەمان پێ بەخشرا، پێویستە بە سوپاسگوزارییەکی فراوانەوە مامەڵەی

لەگەڵدا بکەین و بابەتەکە ببەستینەوە بە خاوەنی هەموو بەخششەکانەوە. بگرە لە ترسی هەر جۆرە هەنگاوێکی هەڵەش تەواویی بوونمان بلەرزێت. بەڵێ، دەلەرزین و بۆ هەڵنەخلیسکانی پێمان، دووبارە پەنا بۆ ڕەحمەتی فراوانی ئەو دەبەین.

مرۆڤ ڕەنگە نەتوانێت هەمیشە ئەم حاڵەتەی بە هەمان گەرموگوڕییەوە بپارێزێت. بەڵام گەر لە بنەڕەتی کاردا پابەند بێت بەم هەستەوە هەرگیز شکست ناهێنێت. ڕەنگە مرۆڤ هەندێك جار هەڵە بکات. ئەوەی داواکراوە هەڵە نەکردن نییە، بەڵکو دەستگرتنێکی توندە بەو دەرگایەی پێوەی بەندین و جێنەهێشتنی ئەو ئاستانەیە. مەگەر پێغەمبەری خواش نافەرموێت "هەموو مرۆڤێك هەڵە دەکات و باشترینی هەڵەکارانیش تۆبەکارانن." جەنابی "الله" (جَلَّ جَلالُهُ) گوناهبارانی لە دەرگاکەی دەرنەکردووە و دەرفەتی تەوبەکردنی پێ بەخشیون، ئەو کەسانەی پاش پێ هەڵکەوتنێك دووبارە هەستاونەتەوە و پابەندی ڕێکردن بوون لە ڕێگای بەندایەتیدا، هەمیشە شاهیدی گوشادبوونی دەرگای ڕەحمەت بوون بە ڕووی خۆیاندا. بەڵام ئەوانەی سوودیان لەم دەرفەتانە وەرنەگرتووە و مکوڕبوون لە سەر هەڵە و تاوانەکانیان، لە دەرگای ڕەحمەتی ئەو دوورخراونەتەوە و فڕێدراون.

دەبێت وریابین لەو دەرگایە دانەبڕێین و دوورنەخرێینەوە. سەرەنجامێکی خراپی لەم شێوەیە چارەی نابێت و کەس ناتوانێت هیچ کارێکی بۆ بکات. گەر شتێکی خراپ بە بیرتاندا گوزەری کرد یەکسەر دەبێت هەستن و سەر لە زەوی بنێن، سوجدە بەرن، بپاڕێنەوە و داوای لێخۆشبوون بکەن. بەڵام گەر ئەم هەستەتان لە دەستدابێت، ئەوە واتای ئەوەیە دابڕانێك لە ناختاندا بەرامبەر بە ئەو دروست بووە. گەر ئارەزووی تۆبەکردن لە ناختاندا نەجۆشێت و هەست بە پێویستیی دووبارە گەڕانەوە بۆ لای ئەو نەکەن، ئەوە واتای ئەوەیە توشی دەردێکی بێ دەرمان بوونەتەوە.

دکتۆرەکان هەموو ساڵێك ڤایرۆسی ئەنفلۆزای ئەو ساڵە دەستنیشان دەکەن

و پاشان ڤاکسینێك ئامادە دەکەن کە بە هۆیەوە لەش بتوانێت بەرگری لە دژی هەموو ئەو ڤایرۆسانە پەیدا بکات. یەك جار وەرگرتنی ئەو ڤاکسینە بۆ ماوەی ساڵێك، لە نەخۆشییەکانی ئەو ڤایرۆسانە دەتپارێزێت. پاشان بە تێپەڕبوونی کات ڤایرۆسەکان لە دژی ئەو دەرمانەی بەکارهێنراوە بەرگری پەیدادەکەن یاخود کرداری بازدان تێیاندا ڕوودەدات. میکرۆبەکان کرداری بازدان تێیاندا ڕوودەدات و شێوازی جیاواز وەردەگرن، تا وایلێدێت ڤاکسینەکە چیتر کاریگەریی بەسەریانەوە نامێنێت. لەبەر ئەم هۆیە، بۆ ساڵی داهاتوو پێویست دەکات ڤایرۆسە نوێیەکانیش لەبەرچاو بگیرێن و پاشان ڤاکسینەکە بە پێکهاتەیەکی نوێ ئامادە بکرێت.

هەروەك ئەمە، مرۆڤیش ڕۆژانە لەگەڵ کۆمەڵێك گومان و هەڵوێستەی خراپ و هەڵە و چەوتیدا ڕووبەڕوو دەبێتەوە. گەر ئەمڕۆ بەهێزترین ئیمان کە وەك دژەڤایرۆسە لە بەرامبەر ڤایرۆسە مەعنەوییەکاندا بەدەستبهێنێت، ئیمانێکی وەك ئیمانی شاهی گەیلانی بەدەستبهێنێت، بۆ ڕۆژی دواتر ڕووبەڕووی کۆمەڵێکی تر ڤایرۆسی مەعنەوی دەبێتەوە، جا بۆ ئەوەی لە بەرامبەریاندا شکست نەخوات پێویستە هەموو ڕۆژێك چاو بە ئیمان و ژیانی دڵیدا بخشێنێتەوە و هەموو ڕۆژێك جارێکی دی ئەو ئاستە ئیمانییەی پێویستە بەدەستیبهێنێتەوە. سەرکەوتنە سەر لوتکەی ئەمڕۆی گرنگییەکی ئەوتۆی بۆ سبەینێ نییە، حاڵی ئەمڕۆ تەنها ئەرکی پێپلیکانەیەك دەبینێت، واتە مرۆڤ پلەیەکی دیکە بەرز دەکاتەوە، مرۆڤ پێویستە سبەینێ بۆ سبەینێ ئامادە بکات یاخود ئامادەیی پێویست بۆ سبەینێ ساز بدات. مرۆڤ پێوستی بەوە هەیە هەموو ڕۆژێك گڕوتینی نوێ و کەشفی نوێی هەبێت لە ئیمان و قورئان و ئیحساندا و بە هەستێکی نوێوە لە گیانیدا هەستیان پێبکات، وەگەرنا مەحاڵ دەبێت بتوانێت خۆی لە کۆن بوون و گەرد گرتن بپارێزێت.

نابێت پێشوازیی ڕۆژێکی نوێ بە کۆمەڵێك هەستی گەردگرتووەوە بکرێت،

هەموو ڕۆژێك ئیماندارێکی نوێ، ئیمانداریکی تەواو نوێ پێویستە... دەتوانین ئەم فەرمووده پیرۆزەش بەم واتایە تێ بگەین "ئەو کەسەی دوو رۆژی وەك یەك بێت دۆڕاوە".

## گەورەبوون

گەورەبوونی مرۆڤێك لە ڕوانگەی تەمەن و پلەو پایەوە و گەورەبوونی کۆمەڵگەیەکیش لە ڕوانگەی ژمارە و قەبارەوە لەگەڵ ئەوەی هەندێك بەهاو نرخ و سوود لەگەڵ خۆی دەهێنێت، کۆمەڵێك مەترسیش دەهێنێتە پێشەوە. وەك چۆن هەندێکجار لە پێکهاتەی بایۆلۆژی لەشدا بەهۆی تێکچوون لە دەردانی هۆڕمۆنەکاندا گەورەبوونی ناناسایی دێتە ئاراوە، هەرواش ئەگەری هەیە گەورەبوونی ناناسایی و ناساز لەگەڵ ژیانی دڵدا ڕوویدات، لە بارێکی وەهادا دڵ گەورە نابێت، "سیرڕ" گەورە نابێت، خەفی بەدەر ناکەوێت، ئەخفا ناناسرێت و خوای پەروەردگاریش بەوشێوەیەی پێویستە نایەتە ناسین. بەڵکو تەنها لە پلەی کەسەکان و ڕوکاریاندا گەورەبوون ڕوودەدات.

دەرەنجام ئەمە لەکۆمەڵگەشدا ڕەنگ دەداتەوە، بە دەربڕینی فەیلەسوفەکان کۆمەڵگە "عرض - واتە پێکهاتەیەکە لە کۆمەڵێك یەکەی بنیاتنەر پێکهاتووە" ئەو یەکە بنیاتنەرانەش گەوهەری تاکەکانە، ئێوە دەتوانن بەرامبەر دەربڕینی گەوهەری تاکی زانا دێرینەکان "گەردیلە" بەکار بهێنن. بۆ ئەوەی "عرض" بە دروستی و سەلامەتی بمێنێتەوە دەبێت لە "جزء الصواب - بەشی ئەرێنی" پێکهاتبێت. "صواب - ئەرێنی بوون" بە واتای ئەوە دێت لە بیر و هەست و درك و جووڵەدا هانگاوی دروست بنرێت. بۆ ئەوەی کۆمەڵگایەك چاکەکار و فەزیلەتمەند بێت، دەبێت یەکە بونیاتنەرەکانیشی چاکەکار و فەزیلەتمەند بن.

ساڵانێك پێش ئێستا، له مزگەوتی "کەستانەپازاڕی" یاخود مزگەوتێکی دیکەدا بوو، کەسانێکم دەبینی که هەمیشه یەك بوون و دەست له نێو دەست له حەوشەی مزگەوتدا دەهاتن و دەچوون، له شێوازی دەرەوەیاندا یەکبوونیان پێوە دیار بوو، بەڵام تا به تاقیکردنەوەدا تێپەڕ نەبیت ڕوون نابێتەوە داخۆ له دڵدا یەکبوونێکی ڕاستەقینه هەیه یاخود نە؟ ئەو ڕۆژانه تەنها گوێ له وتار گرتن و دڵ ئاسکبوونەوە و پاشان بەدەم فرمێسکەوە باوەش بەیەکدا کردن و هاوبەشی پێکردنی خۆشی و ناخۆشی هەبوو. مرۆڤەکان بەگوێرەی حاڵەکانیان خۆیان به بچووك دادەنا. لەو ڕۆژانەدا یەکبوون و برایەتی کەمێك ئاسانتر بوو.

بەڵام ئەو کەسانەی پلەی دونیاییان بەرز دەبێتەوە و دەبنه خاوەنی شتێك له دونیادا، گەر هاوشانی ئەم گەورەبوونەیان گەورەبوونێکی دەروونیی دڵ و ڕۆح و سیرڕ و مەعریفەتی ئیلاهی بەدی نەهاتبێت، زۆر سەخت دەبێت بتوانن ئەو باری خاکیبوونەیان بپارێزن و بگرە مەحاڵیش دەبێت. مرۆڤ که بوو به خاوەن پله و پایه و ماڵ و سامان ئەوجا مرۆڤایەتی ڕاستەقینەی دەردەکەوێت. هەر وەك چۆن کاتێك ئامرازێکی یاریکردن له منداڵێکی بێتاوانی بێوەی و بێدەنگ بسێنیت، زۆربەی جارەکان له ژێر پەردەی ئەو بێ تاوانییەیەوە تووڕەیی و ڕق بەدی دەکەیت. هەر بەو شێوەیه، مانەوە به پاکیزەیی منداڵییەوە لەسەر ئەو هەست و بیرانەی هەمانه زۆر شتێکی جوانه، بەڵام پاراستنی تابڵێیت شتێکی قورسه.

هاوڕێیەکم جارێکیان وتی "مرۆڤی بلیمەت و تێکۆشەر هەموو کاتێك دەکرێت بدۆزرێتەوە، بەڵام سەختترین شت، دۆزینەوەی مرۆڤی هاوسەنگی پارێزە." گەرچی ئەم وتەیه زۆر بەلامەوە پەسەندە، بەڵام وایه گۆڕینی مرۆڤی "هاوسەنگی پارێز" بۆ مرۆڤی "بەڕووی ڕاوێژکردندا کراوە" وتەکه دروستتر دەکات. مرۆڤی زۆر ژیر و زیرەك و زانا ئاسان پەیدا دەکرێت، بەڵام گرنگترین شت دۆزینەوەی

مرۆڤێکە بە ڕووی ڕاوێژکردندا کراوە بێت. ئەو مرۆڤەی کە تەنانەت سەبارەت بە کارە کەسییەکانی خۆیشی ڕاوێژ دەکات و سەبارەت بە چۆنیەتی پێ ڕاکێشانی ناو جێگەشی لەگەڵ کەسێکی دی ڕاوێژ دەکات، هەرگیز شکست بەرۆکی ناگرێت.

بەڵێ، سادەترین شتەکانیش دەبێت ڕاوێژیان لەسەر بکرێت. با بڵێین نووسینێکی وەهاتان نووسی کە ئاوی لێوی جوبرەئیلی بەسەرەوە بوو.. تەنانەت دەبێت ئەویش بدەن بە هاوڕێیەکتان و بڵێن "تەماشایەکی ئەم نوسراوە بکە، تا گۆڕینی تەواوی وشەکان ئازادیت لە دەستکاری کردنیدا". گەر بەمشێوەیە بن هەرگیز شکست ناهێنن. مەگەر جەنابی حەقیش نافەرموێت "وَفَوْقَ كُلِّ ذِي عِلْمٍ عَلِيمٌ"، واتە "لە سەروو هەموو خاوەن زانستێکەوە کەسێکی زاناتر هەیە"[1].

---

١. یوسف: ٧٦.

# میکانیزمی نەفس و ویژدان

## ئایا دەکرێت نەفس بە تێپەڕبوونی کات بەهێز ببێت؟

پرسیار : ئایا نەفسی مرۆڤ بە تێپەڕبوونی کات بەهێزتر دەبێت؟

وەڵام : دەکرێت نەفس بە تێپەڕبوونی کات هێز بەدەست بهێنێت. چونکە بە تێپەڕبوونی ساڵەکانی تەمەن هەندێك ئارەزوو، خواستی جەستەیی لە مرۆڤدا بەدەردەکەون. ئومێد درێژی، خواستی جەستەیی، بڕی سەروەت و سامان و هەڵپەکردن بۆ ماڵ و موڵك سەر دەردەهێنن. هەموو ئەمانە گەر بە ئولفەت بەهێز بکرێن و پاڵپشتی بکرێن دەکرێت مرۆڤ توشی نشوستی بێت و شکست بهێنێت. کاتێك ئەم هەستانە خۆیان نیشاندا، مرۆڤ دەبێت هەوڵبدات پتەوتر پێ دابنێت و زیاتر خۆی ببەستێتەوە بە ئامانجی خزمەتکردنی ئاین و ئوممەتەوە. پێویستە بەندە بە شوێن ئەو خاڵەدا بگەڕێت کە جەنابی حەق لە ماهییەتێکی تایبەتیدا دەبێتە پارێزەری.

لە قورئانی پیرۆزدا خوا دەفەرموێت "فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ"، واتە "ئێوە یادی من بکەن، تا منیش یادی ئێوە بکەم"[1]. "يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ تَنْصُرُوا اللَّهَ يَنْصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ"،

---

١. البقرة: ١٥٢.

واتە "گەر ئێوە پشتیوانی خوا بن و سەری بخەن، خواش ئێوە سەردەخات و جێ پێتان پتەو دەکات"[1] و بە واتایەك ڕێی گەیشتن بە بازنەی پارێزرانی خواییمان نیشاندەدات.

ئەودەم مرۆڤ دەبێت زۆر بە باشی بزانێت لە چ سەنگەرێکدا دەوەستێت. واتە ئەو پەیماننامە ئیلاهییە لەبەرچاو بگیرێت و بڵێت «کەواتە دەبێت من لە پایەی گەیاندنی ناوی ئەودا جێ بگرم، مافی ئەو پایەیە بدەم و زوو زوو لە ڕێك وەستانی خۆم دڵنیا ببەمەوە و لە شوێنێکی سەلامەتدا پێیەکانم دابنێم».

لە کاتێکدا هەندێك هەستی جیاواز لە ناخی مرۆڤدا بەدەربکەون و لەولاشەوە ڕێگاکانی زەفەرهێنانی دوژمن ڕوو لە زیاد بوون بکەن، گەر مرۆڤ هەر لە جێی خۆیدا بوەستێتەوە و هیچ پێشنەکەوێت، بێگومان نشوستی ڕووی تێدەکات. پێویستە مرۆڤیش خۆی بەرەو پێشەوە بەرێت. کاتێك ئیمان تەنها وەك کایەیەکی هزریی بە بەڵگەوە بەستراو کاری لەسەر دەکرێت، ڕەنگە تەنها وتنی ''باوەڕم هێنا'' بەس بێت بۆ باوەڕهێنانی مرۆڤێك، بەڵام مەرجە دواتر ئەم دانپێدانان و زانستە لە دڵدا جێیان بکرێتەوە و ببنە بەشێك لە سروشتی کەسەکە، واتە وەك خواردن و خواردنەوە و نوستن و پشوودان ببێتە ڕەهەندێکی سروشتی مرۆڤ. گەر مرۆڤ زانیارییە هزرییەکانی تا ئەو ڕادەیە نەکاتە بەشێك لە سروشتی، کە وەك چۆن لە کاتی نان نەخواردندا هەست بە ناڕەحەتی دەکات، هەرواش لە کاتی ئەنجام نەدانی پەرستشەکانیشدا هەست بە ناڕەحەتی بکات، ئەوە لە "دەمی ئولفەت"دا کە دواتر و پاش ماوەیەك لە باوەڕهێنان دێتە پێشەوە، ناتوانێت لەسەر پێ بوەستێت و دەکەوێت.

لەم ڕوانگەیەوەیە کە لە هەموو دەرفەتێکدا عەرزتان دەکەم، گەر ئیمانی

---

١. محمد: ٧.

دوێنێمان لە ئاستی ئیمانی شاهی گەیلانیدا بێت، ڕەنگە بۆ ئەمڕۆ بەس نەبێت. ئەمڕۆ دەبێت سەرلەنوێ، جارێکی دی بەگوێرەی ئاسۆی زانست و پەی پێبردن و تێگەیشتنمان، باوەڕمان بە پەروەردگار تازە بکەینەوە. لەسەرمان پێویستە کە هەموو ڕۆژێك جارێکی دیکە چاو بە ئایەتە تەکوینی و تەشریعییەکاندا بخشێنینەوە و ئیمانمان نوێ بکەینەوە. بەردەوام دەبێت بە چاوێکی لێکۆڵەرانەوە لە شتەکان بڕوانین و مکوڕانە لەسەر تێگەیشتن لە نهێنی ئەو شتانە بوەستینەوە کە ژێربی پەیان پێنابات و بڵێین "بێگومان حیکمەتێك لەمەدا هەیە."

حەزرەتی بەدیعوززەمان دەڵێت " ژمارەی ئەو هێشووە ترێیانەی لقی مێوێکم ژمارد کە تەنها هێندەی دوو پەنجە ئەستوور بوو وە لەبەرچاومدا وەك نموونەیەکی بچوکی هێشووی موعجیزاتی باخچەی کەرەمی ڕەحیمی زولجەلال بوو. سەد و پەنجا هێشوو دەرچوو. دەنکە ترێیەکانی هێشوویەکم ژمارد، نزیکەی سەد و بیست دەنك بوون. بیرمکردەوە و وتم "گەر ئەم لقە مێوە لولەی شەربەتی هەنگوین بێت و بەردەوام ئەو شەربەتەی لێوە بگات بە هێشووەکان، ئینجا بەشی ئەو سەدان هێشووە دەکات کە وەك ترومپا لەو شەربەتە هەڵدەمژن. دەی ئەم میوە هەندێکجار لە شێیەکی کەم زیاتر هیچی دیکەی دەستناکەوێت، بۆیە ئەوەی ئەم کارەی پێکهێناوە، دەبێت توانای بەسەر هەموو شتێکدا بشکێت."

ئەم جۆرە بیرکردنەوانە، پلەیەکی "علم اليقين"ن و تا جێیەکی دیاریش هەست و بیری لەم شێوەیە کە ئێمە لەسەر پێ ڕادەگرێت. بەڵام لە دوای خاڵێکی دیاریکراو ڕەنگە ئەمە بۆ ئێمە بەس نەبێت. پێویستە ئەم بیرە زیاتر بەرەو پێش ببەین و لە ناوەندی ئەنجامدانی لێکۆڵینەوە زانستییەکاندا دووبارە چاوی پێدا بخشێنینەوە. پاشان لەوێشەوە بەرێ بکەوین و بەرەو بەرزتر هەنگاو بنێین و لە پلەی بەرزی "علم اليقين" جارێکی دیکە شکۆفە بکەین. پاشان لە دەرفەتێکی

دیکەدا دووبارە بەرزببینەوە، پاشان بەرزبوونەوەیەکی دی... بەم شێوەیە پێویستە بەردەوام لە نوێکردنەوەی خۆماندا بین. گەر لە بەرامبەر ئەو گۆڕانانەی لە چواردەورماندا ڕوودەدەن، گەر لە بەرامبەر گۆڕانی هزر و جیاوازبوونی ئەو گۆڕانانەی بەسەر مەنطقی زانست و فەلسەفەی زانستدا دێن، ئێمە هەر لە شوێنی خۆمان بمێنینەوە، شەیتان ئەو بابەتە نوێیانە لە دژمان بەکاردەهێنێت و ئێمەش لە بەرامبەریەوە شکست دەهێنین و - خوا پەنامان بدات - هەڵدەگەڕێینەوە؟

پێویستە بەردەوام خۆمان نوێ بکەینەوە و لە کاتی ئەم نوێبوونەوەیەدا پێویستە دڵیشمان هاوشانی ژیریمان لە نوێبوونەوەدا بێت. نابێت دڵمان هەنگاوێك بکەوێتە دوای ژیریمانەوە و پێویستە زیندوێتی خۆی بپارێزێت. نابێت بیرمان بچێت ئەو کەسەی کە توانای داوەریی ژیری زۆر بەرەو پێش چووە و بووەتە کەسێکی زانستی و قسە ڕۆیشتوو لە بواری کایە عەقڵییەکاندا، گەر حاڵی دڵیشی تا ئەو ڕادەیە بەرەو پێش نەچوبێت، واتای ئەوەیە مەنطقی وشك و زانیارییە تیۆرییەکان دڵیان قووت داوە، دڵیان کوشتووە و لە لەتیفە ڕەببانییەکان مەحرومیان کردووە.

بەڵێ، ئاسۆی هزری تاك چەندەش بەرز بێت نابێت دڵی لەبیربکات و لە ژیانی دڵ دوور بکەوێتەوە. دەبێت سەر لەسەر زەوی دابنێت و شەو تا بەیان زار زار بپاڕێتەوە، چونکە گەر لە بەرامبەر جیهانی بەختەوەریی هەمیشەیی زنجیر بکەنە پێی و پێی بڵێن "دەبێت بە درێژایی تەمەنت لە سوجدەدا بیت و سەر لە زەوی بەرز نەکەیتەوە، بەڵام سەرەنجام دونیایەك دەبەیتەوە کە بۆ هەمیشە تێیدا خۆشبەخت دەبیت." ئەوە گەر عەقڵی هەبێت پەسەندی دەکات وسوجدە دەبات. چونکە لە پێشیەوە ژیانێکی بەختەوەریی هەمیشەیی هەیە، نە شەست حەفتا ساڵ، نە شەش سەد حەوت سەد ساڵ، نە شەش ملیۆن و حەوت ملیۆن ساڵ؛ ژیانێکی بێ کۆتایی و لە ژمارە نەهاتوو، دەی لە پێش ئێمەشەوە ئەو

ژیانە هەمیشەییە هەیە، بۆ بەدەستهێنانی چی ببەخشین ئەرزشمەندە، هەر لەبەر ئەوەشە کە ئێمەش بۆ بەدەستهێنانی بەختەوەریی هەمیشەیی دەبێت هەوڵبدەین، ئەرکی بەندایەتیمان بێ کەموکوڕی بەجێ بهێنین و پاشان پەنا بۆ سۆز و میهرەبانیی پەروەردگار بەرین. دەبێت بەردەوام لە بەرامبەر ئەوەوە بە پشتی چەماوە و دەستی بۆ دوعا کراوەوە بوەستین و لێی بپاڕێینەوە. بۆ نموونە دەبێت تا دەتوانین بڵێین "رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً"، واتە "ئەی پەروەردگاری ئێمە! پاش ئەوەی دڵت هیدایەت داوین، بیپارێزە لە لادان و لە لای خۆتەوە ڕەحمەتمان بۆ بنێرە"[1]، "اللَّهُمَّ يَا مُقَلِّبَ الْقُلُوبِ ثَبِّتْ قَلْبِي عَلَى دِينِكَ"، واتە "پەروەردگارا! ئەی ئەو کەسەی چۆنت بوێت دڵەکان هەڵدەگێڕیتەوە، دڵمان لەسەر ئاینەکەی خۆت دامەزراو بکە"[2]. قورئانی پیرۆز کاتێك باسی ئیماندارە ژیرەکان دەکات دەفەرموێت "ماڵ و گیان و هەموو شتێکیان دەفرۆشن بە خوا و لە پێناویدا بەختی دەکەن"[3].

بەڵێ پێویستە ئەمانە بڵێینەوە و بڵێین "دڵمان بە ئیمانەوە داکوتە تا نەکەوێتە ژێر پێ، بە توندترین شت مەحکەمی بکە بە ئیمانەوە تا هەرگیز لێی جیا نەبێتەوە." لە دوای ئەمانەشەوە دەبێت یەکسەر بڵێین "صَرِّفْ قُلُوبَنَا إِلَى طَاعَتِكَ" واتە "دڵمان وەرچەرخێنە بەرەو پەرستشی خۆت و مەیلی بەندایەتیی کردنی تێدا بچێنە"[4]. نەك دە جار، بگرە گەر هەزار جار ئەمانە بڵێینەوە هێشتا کەممان وتووە.

ئەوەتا پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە نزاکانی بەیانی و ئێوارەیدا سێ جار ئەم

---

١. آل عمران: ٨.

٢. الترمذي، القدر ٧، الدعوات ٨٩، ١٢٤؛ إبن ماجة، الدعاء ٢.

٣. البقرة: ٢٠٧؛ التوبة: ١١١.

٤. مسلم، القدر ١٧؛ عبد بن حميد، المسند.

نزایانە دووبارە دەكاتەوە و ئامۆژگاری ئێمەش دەكات بە كردنیان. ئەو پێغەمبەرە، هەم دوورە لە تاوان (معصوم)ە و هەم پارێزراو (مأصون)یشە لێی و دڵنیایی پێدراوە. دەی ئێمە نە بێ گوناهـ (معصوم)ین و نە لە لایەن پەروەردگارەوە لە گوناهكردن پارێزراو (مأصون)ین و دڵنیاییمان پێدراوە. جا لە كاتێكدا ئەو بەم شێوەیە نزا بكات، ئێمە نابێت لەرز بمانگرێت و موچركە بە گیانماندا بێت؟

با كەس نەڵێت "فڵانە شت بە دڵمدا دێت، ئەم گومانە لە ناخم دایە... فڵانە كێشەی دڵم هەیە". ئایا لە بەرامبەر شتێكی لەو شێوەیەوە تۆ چل شەو لەسەر یەك هەستایت و بۆی بگریت؟ ئایا سەر لەسەر زەوی نێوچاوانت نوقمی فرمێسك كرد بۆی؟ بۆچی پۆزش دەهێنیتەوە؟ بە دڵ ڕوو لە خوا بكە، بپاڕێرەوە و بلاڵێرەوە! بڵێ "دەستم بگرە خوایە، دەستم بگرە كە بێ تۆ ناتوانم."

تكا دەكەم، تا لە ڕێی ئەودا دڵتان شەق نەكردووە، چاوەڕێی ئەو شتانە مەكەن كە بە مرۆڤە دڵشەقكردووەكان بەخشراوە. ڕەنگە ئەو هەندێك جار لەسەر زیادە لوتفمان لەگەڵدا بكات، بەڵام بە شێوەیەكی گشتی چەندە سەختیتان ڕووبەڕوو ببێتەوە، چەندە هەوڵ و هیممەت نیشان بدەن، هێندە پاداشت وەردەگرن. ئێوە جارێك ڕەنگی ڕۆژ بەسەر ڕووی شەوتاندا بهێنن، تا ئەویش شەوتان بكاتە ڕۆژ. ئێوە شەوەكانی دونیاتان بكەنە ڕۆژ تا ئەویش تاریكییەكانی دواڕۆژتان بۆ بگۆڕێت بە ڕووناكی.

خواوەند ڕووی ئەوانە لەكەدار ناكات كە سەریان لەبەر دەرگاكەی داناوە و ڕوویان زەرد ناكات. هێندە بەسە كە ئێوە بە دڵ ڕوو لە ئەو بكەن و بڵێن "ناتوانم، بێ تۆ هەرگیز ناتوانم".

## تەڵەکانی شەیتان

لە هەندێك لە کتێبە تەسەوفییەکاندا دوو جۆر لە "مەکائیدی شەیتانی - فێڵی شەیتانی" و "دەسائیسی شەیتانی - دەسیسەی شەیتانی" تۆمار کراوە. یەکەمیان ئەوەیە کە ڕەنگە بەسەر هەموو کەسێکدا بێت لە هاندان بۆ ئەنجامدانی کاری خراپە و جوان کردنی کارە خراپەکان بە لای کەسەکەوە و لە خشتە بردنی. دووەمینیان ئەو دەسیسانەن کە بۆ هەندێك "مزلة الاقدام - خاڵی پێهەڵخلیسکان"ن کە واتە شەیتان لە ڕێی کارە بە ڕووکەش باشەکانەوە هەوڵی خستنی مرۆڤ دەدات. بۆ نموونە مرۆڤێك خەونی باش دەبینێت، هەست بە کۆمەڵێك شت دەکات و بگرە دەتوانێت دڵی مرۆڤەکان بخوێنێتەوە بەڵام ئەمانە دەداتە پاڵ خۆی و گومان دەبات کە بەندەیەکی پلە بەرزە. ئەمانەش بەکاردەهێنێت بۆ حوکم کردن بەسەر کەسانی دیکەدا و لە جێی نیشاندانی خاکیتی، بە ئەنانییەت خۆی لەناودەبات.

جا "اهل الله - مەردانی خوا" کاری خۆپەسەندی و خۆ پێ گەورەبوونی ئەم کەسانەیان بە "کبیرة -گوناهی گەورە" داناوە. لە دەرئەنجامی گوناهێکی لەم شێوەیەش -خوا بمانپارێزێت- لەناوچوون جێگەی باسە. کێ دەزانێت شەیتان بۆ ئەوەی ئەم مرۆڤانە بکات بە تەڵەی خۆیەوە ناچێتە خەونیان، خۆی بەشێوەیەکی جوان نانوێنێت و شتانێك ناڵێت کە ئەوان دڵیان پێی خۆش بێت؟! شتانێك لە جۆری کەشف و کەرامات و خوێندنەوەی ناخی کەسی بەرامبەر، گەر ڕاستەهێڵی ئەهلی سوننەتی تێدا ڕەچاو نەکرابێت ئەگەری هەیە ئیلهامی شەیتانی بێت.

## جەنگ لەگەڵ لاوازییەکانمان

ئێمە کۆمەڵێك لاوازیی زۆرمان هەیە. دەستنیشان کردنی ئەمانە و دان بە کەموکوڕیەکاندا نان، ڕامکردن و دەستەمۆکردنیان لە ڕێی ئیرادەمانەوە و بە عیففەت و پاکیزەییەوە ژیانمان سەرباری کەموکوڕییەکان، بەرزمان دەکاتەوە بۆ ئەوجی کەماڵات "لوتکەی مرۆڤی کامڵ".

## ئایا گوناه دەبێتە هۆکاری خێر؟

گوناه زۆر شتێکی خراپە، بەڵام دەکرێت لە شوێنێکدا بە باشە هەژمار بکرێت. ئەویش ئەو کاتەیە مرۆڤ پاش ئەوەی لە گوناهێکەوە دەگلێت، بۆ تەمەنێك ئاه و واهی بۆ دەکێشێت. بۆ نموونە، ئەو بەندەیەی جارێك بە تێڕامانەوە لە حەرامی ڕوانیووە، بەڵام دواتر کە پاش چەندین ساڵ ئەو گوناهەی بیردەکەوێتەوە، بە دەم هەنسکەوە ڕووی لە "دەرگای ڕەحمەت" دەکات، ئەوە دەکرێت گوناهەکەی کۆمەڵێك خێری زۆری بۆ هەڵگرتبێت.

## خەیاڵی جیاواز بوون لە شەیتانەوەیە

هەوڵدان بۆ جیاوازبوون و خەیاڵی جیاوازبوونی خود لە کەسانی دیکە هەمیشە لە شەیتانەوەیە. جیاواز بیرکردنەوە دەربارەی خود، خۆ بە بەرزتر بینین، ئارەزووی خاوەندارێتی شتانێکی جیاواز لە خەڵکی، هەموو تەڵەی شەیتانین. بیرکردنەوەی لەم شێوە کە "با دەرفەتێك بە من بدەن، بزانن چۆن قسە دەکەم! قەڵەمەکەم چۆن دەخەمە کار!" مرۆڤ بەرەو سەرەنجامی "ئۆدێتا" ڕاپێچ دەکات. سەرەنجامێك کە ڕۆحی وەك بەرد لێدەکات.

یەکێك لە گەورەترین بەڵاکان ئەوەیە مرۆڤ خۆی بە جیاواز لەوانی دی ببینێت. مەگەر ئەو کارەساتە مەزنانەی بەسەر مرۆڤایەتیدا هاتوون هۆکارەکەی هەر ئەمە نەبووە؟ ئەوانەی خۆیان بە ڕەگەزی باشتر و هەڵبژێردراو و ئاری دەزانی، ئەوانە نەبوون کە بوونە هۆکاری هەڵگیرسانی جەنگە جیهانییەکان؟

پەروەردگار بە پێغەمبەرەکەی خۆی فەرمووە "پێغەمبەرێکی بەندە بە!"[١] ئێمەش گەر تەنانەت ڕێگەیەك بدۆزینەوە کە هەموو مرۆڤایەتی پێدا بەرەو بەهەشت بەرین، هێشتاش دەبێت دوور لە بیری جیاواز بوون. هەستی "تاکێك لە نێو مرۆڤەکان" —گەر قەبوڵ بکرێین— بپارێزین و لەسەر ئەم هێڵە لانەدەین. ئەوەی کەمێك دەستی قەڵەم بگرێت و لە مەرەکەبی بسوێت. ناتوانێت لە دەردی خۆ جیاواز بینین ڕزگاری ببێت. وەك بڵێیت ڤایرۆسێك لە مەرەکەبدا بێت و هەر کەس دەستی بداتێ توشی ببێت.

## ڕۆحە نەخۆشەکان

گەر مرۆڤێك بەردەوام وابزانێت پێویستە باسی خۆی بکات و خۆی لای خەڵکی شیرین بکات، ئەوە واتای ئەوەیە بەندەیەکی سووکی خوایە. ئەوانەی هەموو دەرفەتێك دەقۆزنەوە بۆ باسکردن و خۆشەویست کردنی خۆیان، هەم لە ڕوانگەی ژیری و هەم لە ڕوانگەی ڕۆح و هەم لە ڕوانگەی باوەڕیانەوە کەسانێکی داماوی نەخۆش و کەمتەندامن. گەر خەڵکی بە ڕووتدا پێدەکەنن، گرنگیت پێدەدەن و وابەستەییەکیان پێوەت هەیە، ئەم کارتە تەنها بۆ گەیاندنی ئاینەکەت و بەرزکردنەوەی ناوی پەروەردگارەکەت دەتوانیت بەکاربهێنیت.

---

١. أحمد بن حنبل، المسند ٢٣١/٢؛ النسائي، السنن الكبرى ١٧١/٤.

## مرۆڤ و لاوازییەکانی

ئێمە گیرۆدەی نەفسی خۆمانین، نەفس زنجیری لە پێمانداوە. دەردەداری دەستی ڤایرۆسەکانی "هجومات الستة - شەش هێرشەکە"[1]ین. مرۆڤ بە پەرستشەکانی وەك نوێژ، ڕۆژوو، حەج و زەکات پلەی بەرز دەبێتەوە. بەڵام خۆڕاگرتنی بەرامبەر پەستانی دەروونیی کاتی هەڵچوونی شەهوەتی بۆ ئەنجامدانی خراپەیەك، خواردنەوەی توورەیی کاتی سەختییەکی تاقەت پڕوکێن، دەتوانن ببنە هۆکاری بەرزبوونەوەی بۆ ئاستێکی بەرزتر لەوەش کە لە ڕێی پەرستشە ئەرێنییەکانەوە پێی گەیشتووە.

گەر بتوانیت دان بەخۆدا بگریت و هێزە نەرێنییەکانی ناخت بگۆڕیت بۆ هێزی ئەرێنی، ئەوا بەو هێزەی کە دەستت دەکەوێت دەتوانیت بە خێراییەکی لە موشەك خێراتر بگەیتە ئەوجی کەماڵ. گەر ژیریت خاوەنی زرنگیەکی لە ڕادەبەدەر و توانایی داوەریەکی دەراسا بێت و بتوانیت دوور لە بەکارهێنانی بۆ دژایەتیکردنی هاوڕێ و براکانت لە ڕێی خزمەت کردنی حەق و حەقیقەتدا بیخەیتە گەڕ و بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوا بەکاری بهێنیت، ئەوا دەتوانیت ئەوە بەهۆی ئەو ئیرادەییەوە عەقڵت لە کاتێکدا شەڕێکی هەندەکی (جوزئی)یە، بگۆڕێت بۆ خێرێکی هەمەکی (کوللی).

گەر جەنابی حەق سەرپشکی بکردمایە لە نێو مرۆڤ بوون یاخود بوونەوەرێکی دی وەك ئەو فریشتە و ڕۆحانیانەی بەرامبەر هیچ ڕووداوێك لاوازی نیشان نادەن، من دەمگوت "پەروەردگارا هەر لەسەر ئەو شێوەیە بەدیم بهێنە کە ئێستا

---

١. هجومات الستة - شەش هێرشەکە: ناونیشانی ئەو نامیلکەیەیە کە مامۆستا بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی پاش ڕوخانی دەولەتی عوسمانی و داگیرکردنی ئەستەمبول لەلایەن ئینگلیزەکانەوە نوسی، تێیدا ئەو شەش خاڵە لاوازەی جەستەی کۆمەڵگەی ئیسلامی دیاری کردووە کە دوژمنانی بەکاریدەهێنن بۆ هێرش کردنە سەری.

هەم". دەمگوت "ڕازیم با تا دەڵێیت فشارم لەسەر بێت، بەڵام لە دەرئەنجامدا ئیرادەیەكی وەهام پێبدە كە بە خۆتەوە بمبەستێتەوە و بەرەو ڕەزامەندیی خۆت ڕامبكێشێت، تا بە هێزی ئەو ئیرادەیە بەرەو لای تۆ بەرز ببمەوە. بەڵێ، تۆ بەندەت هەن كە لە لاوازی بێبەرین، بەڵام من دەمەوێت مرۆڤ بم" ڕەنگە لە دەروونمدا فشار هەبێت بۆ لاڕێ بوون، ڕەنگە ئەمانە دونیای دەروونیشم وێران بكەن، بەڵام گەر بتوانم لەم وێرانەیەوە بە هێزی ئیرادە بگەم بە پەروەردگاری خۆم و جەنابی حەقیش ئەم تواناییەی پێدابم، كەواتە دەبێت منیش بە باشترین شێوە سوود لەم دەرفەتە ببینم.

لە پەنا مامەڵە كردنێكی خۆشحاڵانە و سوپاسگوزارانە بەرامبەر ئەو شتانەی خوا پێیداویت، لەسەرتە كە بەسەر لایەنە نەرێنییەكان و لاوازی و گوناهەكانتدا زاڵ ببیت و لە بەندی ڕەفتارە چەوتەكان خۆت ڕزگار بكەیت و بە تەواوی واتا ڕام و وابەستە ببیت بە جەنابی حەقەوە. پەروەردگار دروشمێكی دیكەی بۆ تۆ بەرز كردۆتەوە، دەیەوێت كارێك بكات لەگەڵ تۆ، هێندە بەسە كە تۆ زەبوونی دەستی لاوازی و كەلێنەكانت نەبیت و بزانیت چۆن بەسەریاندا زاڵ دەبیت.

چەندە بەختیارین كە پێغەمبەری سەروەرمان هەیە (علیه الصلاة وسلام). قورئانمان هەیە. گەر هیچ شتێكمان نەبێت، قورئانەكەمان بۆمان بەسە.

## ڕۆحە نەخۆش و بەدگومانەكان

ئەو كەسانەی كەموكوڕیی و ناتەواوی دەدەنە پاڵ ئەم و ئەو، بۆ باس كردن و پێش چاو خستنی خۆیان هەمووان بە سووك دەبینن. ئەمانە چونكە ناتوانن وەك ئەوەی دەروونیان دەیخوازێت خۆیان دەربڕن، بەردەوام بە كەموكوڕیی خەڵكییەوە سەرقاڵن. سەروەرمان (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) لە فەرموودەیەكیدا دەفەرموێت

"مَنْ قَالَ هَلَكَ النَّاسُ فَهُوَ أَهْلَكُهُمْ"، واتە "ئەوەی دەڵێت خەڵك بە هیلاکدا چووە و خێریان تێدا نەماوە، ئەوە خۆی خێری تێدا نەماوە و بە هیلاکدا چووە"[١]. هەروەها لە ڕێی فەرموودەیەکی ترەوە پێمان دەڵێت ئەوەی دەڵێت فلان کەس خراپە، فیسار کەس خراپە، ئەوی دیکەش هەر خراپە، ئەوە لە ڕاستیدا خۆی خراپ بووە"، بە واتایەکی دی دەڵێت: گەر دڵ و دەروونی تاك ڕوون و بێ خەوش بێت، هەمووان وەك خۆی دەبینێت. ئەو کەسانەی سروشتیان وەهایە لە هەموو کەسێکدا بەشوێن کەموکوڕیدا دەگەڕێن، گەر بۆ ماوەی چەند هەفتەیەك لەگەڵ حەزرەتی جبرەئیلیش بمێننەوە، کەموکوڕیی لەویشدا دەدۆزنەوە و بە بیری "چۆن دەتوانم پێی هەڵخلیسکێنم ؟"ەوە بە شوێن ڕێگاکانی شەڕدا دەگەڕێن.

لەڕاستیدا ناتەواوی و کەموکوڕییەکە لە خودی کەسیەتی ئەم مرۆڤانەدایە. ڕوانگەی ڕەفتاری ئەمانە هەڵنەکردنە لەگەڵ کەسانی دی. دەردی ئەوانەی کە لەگەڵ هیچ کەسێك ناتوانن هەڵبکەن، باس لە خۆ کردن و لە هەموو دەرفەتێکدا خۆ بەرەو پێشبردنە. ئەمانە دەیانەوێت بەردەوام باسی ئەوان بکرێت و هەمیشە نرخ و بەها و ڕێزیان بۆ دابنرێت و لە پێشی پێشەوە دەربکەون.

ئایا کاتێك کارێك بەسەرکەوتوویەکی زۆر دیارەوە ئەنجام دەدەیت، دەتوانیت بڵێیت "ئەگەر ئەو هاوڕێیەم یاخود کەسێکی دیکە ئەم کارەی ئەنجام بدایە دەرەنجامی ئەو کارە دەبووە هۆی خێر و چاکەی زیاتر و بەم شێوەیەش سەرکەوتنێکی گەورەتر بەدەست دەهات؟" دەی ئەم تێگەیشتنە دەربڕی ڕۆحی قورئانی و ئەخلاقی پێغەمبەرانەیە. بە پێچەوانەوە ئەوانەی بەردەوام لە چاوەڕوانیی دەستکەوتی کەسیدان و هەمیشە هەوڵی خۆ پێشخستن دەدەن، ئەوانەن کە وڕێنەکانی نەفسیان لە شێوەی نەخۆشییەکی ڕۆحیدا بەرۆکی پێگرتوون.

---

١. مسلم، البر ١٣٩؛ أبو داود، الأدب ٧٧.

## دواكەوتنی سزاكان

هەندێك لەتیفە (لایەنی ناسكی دڵ) هەیە لە مرۆڤدا كە بەرگەی قورسایی تاڵە برژانگێك لە پیسی ناگرێت، یەكسەر دیار نامێنێت و لەناودەچێت. مرۆڤ دەبێت هەمیشە بترسێت لەوەی سزای گوناه و هەڵەكانی لەم دونیادا نەدرێتەوە. ئەگەر هیچ ئاگاداركردنەوەیەكمان بۆ نەیەت، هیچ پێمان نەخلیسكێت و نەكەوین، توشی هیچ جۆرە نەخۆشی یاخود كێشەیەك نەبین و هیچ جۆرە بارێكی نەرێنی ڕوومان تێنەكات، پێویستە دابنیشین و بیربكەینەوە و بۆ ئەم حاڵەمان لە پاشەرۆژی خۆمان بترسین خوا پەنامان بدات، یەكێك لە گەورەترین مەترسییەكان لەسەرمان ئەوەیە كە سزاكانمان بۆ دواڕۆژ دوابخرێت.

گەر لە ڕەفتار و كردار و تەنانەت دەربڕینیشماندا ناخمان ڕوون و بێخەوش نەبێت، هەنگاوەكانمان بە ئیخلاسەوە نەنابێت و هەرچییەكمان كردووە بە خاتری ڕەزامەندیی ئەو نەمان كردبێت، جەنابی حەقیش ئەمانەمان لێنەپرسێتەوە و بە جێیبهێڵێت بۆ ڕۆژی دوایی، واتای ئەوەیە كارمان تەواو بووە و نقووم بووین. دەبێت تەواوی بوونمان لەبەر ئەمە لەرز بیگرێت. لە لایەكی دیكەوە دەبێت بە پێوەری ویژدان پەیوەندیمان لەگەڵ پەروەردگارمان هەڵبسەنگێنین، داخۆ لەسەر چ هێڵێك دەڕوات و حاڵی عیرفانیمان لەم بوارەدا لەكوێدایە. بەم شێوەیە پێگەی خۆمان دیاری دەكەین. بۆ هەندێ كەس كرانەوەیەكی ئاشكرا لە شوێنێك لە شوێنەكاندا مەترسیدارە. ئەم پێوەرانە گشتیی نین، بەڵكو بە گوێرەی پەیوەندیی نێوان تاك و پەروەردگارە. ڕەنگە بۆ هەموو كەسێك جێی باس نەبێت، واتا ئەم پێوەرانە لە كەسێكەوە بۆ كەسێكی دیكە گۆڕانیان بەسەردا دێت.

**ئارامگرتن، بەتایبەت گەر ئەو شتەی داوای دەکەیت زۆر گەورە بێت**

ئەو سەختییانەی دەیچێژین و ئەو ناڕەحەتییانەی بەسەرمان دێن، گەر لە ئاستی ئەو ئامانجەدا کە مەبەستمانە تەماشایان بکەین زۆر بچوك دەمێننەوە. حاڵی ئێمە لە بە ئامانجگرتنی بەهەشتدا وەك داستانی عاشق بوونی کەل ئۆغلانی داماوە بە کچی پاشا. ئەمە وەك داخوازیی کەرەم نیە بۆ "ئاسلی". من کە تەماشای حاڵی پەرێشانی خۆمان دەکەم پێکەنینم دێت. چونکە ئێمە زۆر بچوکین و ئەو شتەیش کە داخوازینی زۆر بە نرخە. بە دەربڕینی مامۆستا بەدیعوززەمان، ئێمە داواکاری بەهەشتێکین کە هەزار ساڵ ژیانی پڕ بەختەوەری ئەم دنیایە هاوتای کاتژێرێکی ئەوێ نییە.[١] لەودیو ئەوەشەوە ئارەزووی دیتنی جەماڵی جەنابی حەقمان هەیە. دەی بۆ گەیشتن بە ئەم ئامانجە پێویستە بەرگەی هەموو شتێك بگرین و سنگ بدەینە بەر هەموو ناڕەحەتییەك و هەموو سەختییەك قەبوڵ بکەین.

**ئیرادە**

موعجیزە و کەرامات، حەق و ڕاستین و گەر خوا بیەوێت پەردەی سەر ڕووی شتە ئاساییەکان دەدڕێت و شتانێکی دەراسا و بەخەیاڵدا نەهاتوو دێنێتە مەیدان. بەڵام هیچ پێغەمبەرێك نەبووە پلانەکانی بە گوێرەی ئەم ڕووداوە دەراسایانە دابڕێژێت. هەموویان کارەکانییان لە چوارچێوەی هۆکارەکاندا بەرنامەڕێژیی کردووە. دەوترێت کە پێغەمبەرمان لە شەڕی ئوحوددا زرێیەکی زیادەی بەسەر زرێکەی خۆیدا پۆشیووە و هەموو ڕێ و شوێنێکی خۆپاراستنی گرتۆتە بەر. چونکە هەڵنەگرتنی ئەو هەنگاوانەی لە چوارچێوەی هۆکارەکاندا پێویستە

١. بەدیعوززەمان، وتەکان (وتەی سی و دوو)؛ مەکتووبات (مەکتووبی بیستەم).

ڕەچاو بكرێن و حەواڵەكردنی هەموو شتێك بۆ جەنابی حەق دەبێتە تێوەگلان لە بیروباوەڕی "جەبریەت" (قەبوڵ نەكردنی ئیرادەی جوزئی و باوەڕبوون بەوەی كە كارەكانی مرۆڤ لە دەستی خۆیدا نییە).

حەزرەتی مامۆستا بەدیعوززەمان ئەو ئەمانەتەی لە قورئاندا بەسەر مرۆڤدا دراوە بە "انا — منێتی" لێكداوەتەوە .گرنگترین پایەی "انا"یش ئیرادەیە و ڕەفتارەكانی مرۆڤ بەوەوە بەستراونەتەوە[1]. بە واتایەك، مرۆڤ بە ئیرادە مرۆڤە. ئەوەی لەسەر ئێمەیە ئەوەیە دوور لە بەستنەوەی ژیانمان بە چاوەڕوانیی شتانی بانئاسایی و دەراسا وە، مافی ئیرادەمان بدەین و ئەوەی پێویستە ئەنجامی بدەین، پاشانیش دەرئەنجامەكان بۆ ویستی پەروەردگاری مەزنمان جێبهێڵین.

## دوو دیوەكەی تەقوا

هەموو شتێك بەلای خوای باڵادەستەوە ئاسانە. ئەوە ئێمەین كاتێك لە چوار چێوەی هۆكارەكاندا بیر دەكەینەوە، هەموو شتێك ناڕەحەت و سەخت دەبینین. بە تایبەت لەم سەردەمەدا گەیشتن بە ژیانی دڵ و ڕۆح بەلامانەوە وەك ئامانجێكی دەست پێ نەگەیشتووی لێهاتووە. بەڵام دڵەكان بە دەست "الله"وەیە. ئەو بیەوێت ئێمەش لە ڕیزی بەندە بۆخۆی سوڵحاوەكانیدا قەبوڵ دەكات.

هێندە هەیە ئەم ڕێیە فیداكاریی زۆری دەوێت. لەم پێناوەدا ئارامگرانە هەوڵ و تێكۆشانی دەوێت. دەبێت هەموو ئەو نیعمەتانەی ڕەزاقی حەقیقی (ڕۆزیدەری ڕاستەقینە) پێی بەخشیوین دووبارە لە ڕێی بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خۆیدا بەكاری بهێنینەوە.

---

١. بەدیعوززەمان، وتەكان (وتەی سێیەم).

پاشان ڕێبواری ئەم ڕێیە دەبێت هەمیشە تەقوا بنەمای كاری بێت، لە ڕوانینی بۆ بابەتە تەكوینییەكانیشدا دووبارە نابێت لە ڕاستەڕێی تەقوا لابدات. نابێت هیچ كام لە دوو دیوەكەی تەقوا فەرامۆش بكرێن. بەڵێ تەقوا دوو دیوی هەیە:

١. ڕەچاوكردنی ئەمر و نەهیە تەشریعییەكان. واتە گوێڕایەڵ بوون لە بەرامبەر ئەو شتانەوە كە ئاین فەرمانی "كردن" یاخود "نەكردن"ی داون.

٢. ڕەچاوكردنی ئەمرە تەكوینییەكان. واتە هەڵسوكەوتی گونجاو و هەماهەنگ لەگەڵ ئەو سوننەتانە (یاسایانە)ی پەروەردگار لە گەردووندا دایناون.

كاتێك لە ژیانی پیرۆزی سەروەرمان ورد دەبینیەوە دەبینین، ئەو بێ پشتگوێ خستنی هۆكارەكان و بەخوێندنەوەی زۆر دروست بۆ ئایەتە تەكوینییەكان هەردەم لە ژێر ساباتی تەقوادا ژیانی بردووەتە سەر. بۆ نموونە ئەو بە هاوەڵەكانی فەرموە "شەو كە نوستن، ئاگری نێو ماڵ بكوژێننەوە"[1]. بەڵێ، لێرەداو لە چەندین فەرموودەی تری هاوشێوەدا بانگهێشتی كردووین تا ڕەچاوی هۆكارەكان بكەین و نەهێڵین بەهۆی ئاگرەوە هیچ جۆرە زیانێك بە ماڵمان بكەوێت.

خواردن لەبەر خوا، بوونە خاوەنی ماڵ و منداڵ لەبەر خوا، كاركردن لەبەر خوا، دەست پێكردن لەبەر خوا... بەردەوام بن لە ڕیزكردنی ئەمانە تا دەتوانن. كاتێك هەموو ئەمانەتان لەبەر خوا ئەنجامدا و لە پێناو خوادا جوڵانەوە، ئەوا چوونەتە نێو بازنەی تەقواوە و هەر كارێك كە ئەنجامی دەدەن پاداشتی پەرستشتان لەسەری بۆ دەنووسرێت. بەڵام كاتێك وتتان "با نوێژێك بكەم تا ببینن"، "با قسە بكەم، تا فێر ببن دەبێت چۆن قسە بكرێت"، "با لە هەمووان زیاتر ببەخشم،

---

١. البخاري، استئذان ٤٩؛ مسلم، الأشربة ١٠٠.

تا بزانن بەخشندەیی و دەست کراوەی کامەیە" ئیدی ئەو کاتە زۆر شتتان لە کیس دەچێت.

## هاوئاهەنگیی ژیانی دەروون و دەرەوە و هەڵویست وەرگرتن لە بەرامبەر گوناهدا

مرۆڤ پێویستە وەك چۆن گرنگی بە ڕوخساری دەدات، هەرواش بە وریاییەوە لەگەڵ ژیانی دڵ و ڕۆحیدا مامەڵە بکات. بۆ نموونە مرۆڤ گەر لە سیمای دەرەوەیدا شتێکی نەشیاو ببینێت کە سەرنجی خەڵکی بۆ لای خۆی ڕابکێشیت، یەکسەر دەیشارێتەوە. گەر یەخەی کراسەکەی لار بێت، یاخود دەرقاچەی پانتۆڵەکەی هەڵگەڕابێتەوە، یەکسەر چاکی دەکات. هەروەك ئەمانە، پێویستە مرۆڤ هەر کات بینی لە دڵیدا لاری هەیە یاخود لە ڕۆحیدا لادان لە ئامانجی سەرەکیی هاتۆتە پێش، یەکسەر دەستبەکاربێت و بکەوێتە جووڵە بۆ چاك کردن و هێنانەوە سەر ڕێی.

بۆ نموونە کاتێك لە ڕێی چاوەوە شتێك دێتە نێو دڵەوە، لە ڕێی گوێ یاخود دەمەوە پەڵەیەك لەسەر دڵ دەنیشێت. مرۆڤ دەبێت هێندەی تێکچوونی سیمای دەرەوەی، بگرە لەویش زیاتر، ئاگاداری ئەم تێکچوونانەی ناخی بێت و بەردەوام هۆشیارانە هەوڵی خۆ پاراستن بدات لێیان. کاتێك بێ ئاگایانە، بۆ نموونە لە کاتی قسەکردندا لە دەمت دەردەچێت و دەڵێیت "فلانە کەس بە چاوێکی لار تەماشای کردم" شتێك کە گەر ئەو کەسە بیبیستێت، پێی ناڕەحەت دەبێت. دەبێت یەکسەر ڕابکەیت بە شوێنیدا و پێی بڵێیت "نەمزانی لە زارمەوە شتێك دەرچوو، باسی تۆم کرد، گەردنم ئازاد بکە" هەر بە هەمان شێوە، گەر بە خەیاڵتدا گوزەری کرد "بۆچی هەوا ساردە؟" یەکسەر بە دوایدا پێویستە بڵێت

"استغفرالله، پەروەردگارا! من حەددم نیە خۆم هەڵقورتێنم لە بڕیاری تۆدا، چ سەرما بێت چ گەرما."

مرۆڤ وەك چۆن ئاگاداری پۆشاك و ڕوخسار و یەخە و دامەنی کراسەکەیەتی، هەرواش دەبێت لە ژیانی ڕۆح و دڵیدا لە بەرامبەر ئەو شتانەوە کە پەروەردگار پێی خۆش نین، لە چوارچێوەی پێوەرەکانی خۆیدا وریایانە بژیێت و مامەڵە بکات. هەندێك کەس سروشتێکی هەستیاریان هەیە. لە جل و بەرگ و شوێنی دانیشتن و نوستنیاندا هەمیشە ڕێکوپێکی بەدی دەکرێت، بەڵام لە ڕوانگەی ژیانی ڕۆحیانەوە هێندە هەستیار نین. هەندێك کەسی دیکەش هەن، شپرزەن و چواردەور و کەلوپەلیان هەمیشە پژاوە، بەڵام لە ژیانی ڕۆحیاندا لە لووتکەکاندا هاتووچۆ دەکەن. ئەمانە ڕەنگە بە یەك نەخۆن. بەڵام هەندێکیش هەن هەم لە ڕوانگەی ڕوخساری دەرەوەیان و هەم لە بواری ژیانی دڵ و ڕوحیاندا هەمیشە هەستیارن و هۆشیارن. دوا جار ڕەنگە باشترینی مرۆڤەکان ئەم جۆرە کەسانە بن. ئەو کەسەی کە لە بواری هاوئاهەنگ بوونی جیهانی دەروون و دەرەوەیدا تا بڵێی هەستیار و هۆشیارە و نایەوێت هیچ لارییەك لە ژیانیدا ببینرێت... ئەمە زۆر گرنگە، هەندێك جار ڕەنگە هەندێك شت لەسەر دڵی مرۆڤ قورس بێت، بەڵام لە بەرامبەر ئەو شتانەشەوە کە بە بیرماندا گوزەر دەکەن بە ترسی ئەوەوە کە هاوتانین لەگەڵ ڕەزامەندیی خوادا، پێویستە وەك ئەوەی گوناهمان ئەنجامدابێت مامەڵە بکەین. ئەوەی کە قورسیی ئەنجامدانی گوناە بەردەوام لە دڵدا هەستی پێ بکرێت، نیشانەی بێ گەردیی دڵی باوەڕدارە. گەر تەنها بۆ یەك جار پەڵەیەك لە سەر دڵێکی زۆر خاوێن و بێگەرد بنیشێت، پاشان پەنجاساڵیش بە سەریدا تێپەڕبێت، خاوەنی ئەو دڵە وەك ئەوەی ئەمڕۆ ئەو گوناهەی ئەنجام دابێت ئازاری پێ دەچێژێت. بەهێزترین ڕێگەی ڕووبەڕووبوونەوەی گوناهیش

هەر ئەمەیە، گەر تەنها یەك جار سەرپێچییەكی ئەنجام دابێت، بەردەوام لە ویژدانیدا وەك ئەوەی تازە بە تازە گوناهەكەی ئەنجام دابێت، ئازار دەچێژێت و دەڵێت "خۆزگە!..." ئەمە گرنگە. گەر گوناهەكەتان لەبیر بچێتەوە، ئەوا لەو دونیا دەبێتە دەردەسەری و بەلاَ بۆتان. بەخشندەیی ئەو نابێت لە بیر بكرێت بەلاَم قێزەونیی گوناهیش نابێت لە بیر بكرێت. باوەڕدار، كەسێكە كە گەر یەك جار گوناهی ئەنجامدا بەدرێژایی تەمەنێك فرمێسكی بۆ دەڕێژێت.

## لێپرسینەوە لەخۆمان، نەك لە كەسانی دی

بەداخەوە، هێشتاش بە شوێن كەموكوڕیی كەسانی دیكەدا دەگەڕێین و هێشتاش لەبەر كەموكوڕییەكانیان دەیانخەینە بەر تیری پرسیار و لێپرسینەوە. گەر یەكێك تا گەردنی نوقمی قوڕ بوویێت و تۆش بە تەنها قوڕ بەر قولەپێت كەوتبێت، مافی ئەوەت نییە بە كەسەكەی بەرامبەرت بڵێیت "ئەم هەموو قوڕە چییە پێتەوەیە؟" پێویستە لە خۆت بپرسیتەوە كە "بۆچی قوولەپێم قوڕاویی كردووە؟" نقووم بوونی كەسێكی تر لە قوڕدا تا ئاستی گەردنیشی بە تۆوە پەیوەندیدار نییە. تۆ تەنها دەتوانیت دوور لە گومانی خراپە و غەیبەت و تانە و تەشەر بۆ ڕزگار بوونی ئەو كەسە لە خوا بپاڕێیتەوە.

ئەگەر ئێمە خۆمان لە تەواوی چاوەڕوانییەكان دانەڕنیبێت و نەمانتوانیبێت ویستمان لەگەڵ ویستی جەنابی حەقدا هاوتا بكەین، واتای ئەوەیە هێشتا زۆر كارمان ماوە ئەنجامی بدەین. چۆن دەتوانین بە كەموكوڕیی كەسانی دیكەوە خەریك بین و لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بكەین، لە كاتێكدا خۆمان گرفتاری دەستی دەیان كەموكوڕیین؟

لە تەسەوفدا، مورید لە حاڵێکدا ئیدی دەبێتە موراد. واتە، ئەو کەسەی بە درێژایی تەمەنی هەر داوای ئەو دەکات و هەر ئەوی دەوێت، موریدی ئەوە و لە هێز و توانایی خۆی بێ پەروا دەبێت و ڕامی ئیرادەی "هێزی بێ پایانی ئەو" دەبێت، پاشان دەگاتە ئاستێك کە ئیدی لەوە بەدواوە دەبێتە موراد. واتە بە ئارەزووی حەقەوە تەژی دەبێت، بە تەواوەتی بە ڕووی ما سیوا الله (ئەوەی لە خوا نەبێت) دادەخرێت و جگە لە خۆشنوودی ئەو هیچ داخوازییەکی دیکەی نامێنێت. بەم حاڵەش دەبێتە ڕۆحێکی بەختیار کە مورادی حەق و مایەی نیگای ئەو و بیلبیلەی چاویەتی، جا کاتێك ئێمە مورادی "الله" نەبین، بۆچی ئەو ئەمانەتی خۆیمان پێ بسپێرێت؟

بەڵێ، دەبێت لەم بارەیەوە زۆر بترسین و بە تەواوی بوونمانەوە لەرزمان لێبێت. پێویستە پاش هەموو سەرکەوتنێك شایستەییمان بۆ ئەو کارە بخەینە سەر مێزی لێکۆڵینەوە و بە زەرەبینێکی زۆر بەهێز لە ڕەفتار و کردارەکانمان ورد ببینەوە. بەو هەستەوە کە "داخۆ لەبەرامبەر نیعمەت و ئیحسانێکی ئیلاهیی لەم شێوەیەوە توانیومانە ئەرکی وەفاداریمان بهێنینە جێ؟" لێپرسینەوە لە کەمو کوڕیی و کەلێنەکانمان بکەین. موحاسیبی بیرکردنەوەیەکی زۆر کەم سەبارەت بە کەسانی دی و ڕەخنە لێگرتنیان وەك ئەوەی بڵێیت "خۆزگە ئەو پیاوە وەها باش بووایە" بە گوناهی گەورە داناوە و بە ئازاریەوە تلاوەتەوە. نەك ڕەفتار و کردار و هەڵوێست، بگرە تەنها بیرێکی نەخوازراو کە بە مێشکدا گوزەر دەکات.

بەردەوام خەریکی لێپرسینەوە بوو لە نەفسی خۆی و وتوویەتی "گەر بیری من پاك بووایە ئەو پەڵەیە کەی بەسەر ئەوەوە دەبوو؟". ئێمەش دەبێت ئەمە دروشممان بێت و تەنها لە نەفسی لە ماسیوا دانەبڕاوی خۆمان تانە بدەین و لێپرسینەوە بکەین.

## فەراهەم نەكردنی مافی ژیان بۆ هەڵەكان

جەنابی حەق، بەردەوامیمان پێبدات لە خزمەت كردنی ئاینەكەیدا، دیار نییە لە چ قۆناغێكی ئەم ڕێی ژیانەدا پەردەكان لا دەدرێن و پێمان دەوترێت "دەی بۆ دەرەوەی ڕێگاكە!" ڕەنگە لە یەك دوو خولەكدا پێمان بوترێت "دەتانبەینە دەرەوەی ڕێگاكە." مرۆڤ كاتێك دەڕواتەوە بۆ لای ئەو، دەبێت دڵی وابەستەی ئەو بێت و تەژی لە بیری خزمەت بێت و لە سەروبەندی ئەنجامدانی كارێكی باشدا بێت.

بەڵێ، ڕەنگە هەندێك لە ساتەكانی مرۆڤ نوورانی نەبوویێت، ڕەنگە كۆمەڵێك ساتی چڵكنیشی هەبێت، بەڵام وەك پێشتر باسمان كردووە، سەرەنجامی كار زۆر گرنگە. وەك چۆن هەندێك جار، ئێستاشی لەسەر بێت یاسای پەشیمان بوونەوە كاری پێدەكرێت، كاتێك زیندانییەك بڵێت "پەشیمان بوومەوە و بڕیارمداوە و سورم لەسەر ئەوەی ببمە مرۆڤێكی باش" یاسای پەشیمان بوونەوەی بەسەردا جێ بەجێ دەكەن و لێی خۆش دەبن. لە بابەتەكانی پەیوەست بە دوارۆژیشدا پەشیمان بوونەوەیەكی لەم شێوەیە دەكرێت ببێتە هۆكاری بەخشران. بەڵام مرۆڤ پێویستە هێندەی لە دەستی دێت وریا بێت كە لاپەڕەیەكی لەكەدار لە ژیانیدا نەبێت. ئەمە بە واتا گشتییەكەی بەكاردەهێنم. مرۆڤ نابێت ڕێ بە لەكەدار بوونی بیر، ڕۆح یاخود هەستی بدات. ئەو شتانەی لە ژیانی تاكدا پێویستە كەمترین مافی ژیانیان هەبێت، هەڵە و گوناهەكانن. بەندە، گەر وەك بەشێكی سروشتیشی هەندێك جار پێی بخلیسكێت و بكەوێت، دەبێت یەكسەر هەستێتەوە و خۆی ڕێك بكاتەوە، هەروەها هەوڵبدات و ماوەی پێخلیسكان و كەوتنەكانیشی بۆ كەمترین ماوە دابەزێنێت.

گەر بەندە بكەوێت و لاڕێ ببێت، ئەوا گرینگترین شت لەو بوارەدا، یەكسەر گەڕانەوەیە بۆ لای خوا و ڕۆیشتنە ژێر چەتری "تەوبە و ئینابە و ئەوبەیە".

زۆر گرنگە مرۆڤ بزانێت پەروەردگارێکی هەیە کە لێی خۆشدەبێت، زۆر گرنگە ڕوو بکەینە ئەم خاوەنەمان و بڵێین "دووبارە کەوتم، دووبارە شیرەکەم ڕژاندەوە، جارێکی دیکەش هاروهاجیم کرد، بەڵام پەشیمانم و نوقمی شەرمەزاریم" و هەوڵ بدەین یەکسەر دوور بکەوینەوە لەو حاڵەتە پەڵاوییەی تێی کەوتویین.

بەلاتانەوە سەیر نەبێت کە ئەم بابەتە زۆر دووبارە دەکەمەوە. وەك چۆن لە سەرەنجامی خۆم دەترسم، هەرواش بۆ سەرەنجامی براکانم دەترسم و موچڕکەم پێدا دێت. باوەڕم وەهایە کە پێویستیمان بە ئاگادارکردنەوە و ورياکردنەوەی یەکدی هەیە لەم هەرە گرنگترین بابەتەدا کە بەدەستهێنانی بەختەوەریی هەمیشەییە. خوا پەنامان بدات، پێم خۆش نیە هیچ کەس ببینم کە لە کاتی هاوار کردن بەسەر یەکێکی دی، یاخود کاتێك بە ڕقە لە کەسێکی دی، بگرە کاتێك دڵی کەمێك گەردی لێنیشتووە بەرەو مەرگ هەنگاو بنێت.

ڕەنگە خوا ڕوانین و تەوەججوهی تایبەتی هەبێت بۆ ئەو کەسانەی لە ڕێگاکەی ئەودا لەوانی دی هیممەتیان زیاترە. ئەوەیە کە بەدیعوززەمان موژدەی بە ئیمانەوە ڕۆیشتنە گۆڕ بە قوتابییانی قورئان دەدات و دەڵێت کە بەهۆی ئەوەی هەمووان دوعا بۆ یەکدی دەکەن، دوعاکە هەمەکێتی (کوللییەت) بەدەست دەهێنێت. ئەوانەی لە بازنەی قورئاندان تەنها وەك یەك کەس دوعا ناکەن، بەڵکو بە ملیۆنان زار و زوبان بۆ دوعا دەوەستن.[1] کەسەکان لە چ ئاستێکدا بن، کاتێك دەوترێت "إخواننا، أخواتنا - برایانمان، خوشکانمان"، لە پەنا ئەو کەسانەی بە تەواوەتی شانیان داوەتە بەر ئەم کارە، هەموو ئەو کەسانەش کە تەنها لە گۆشە و کەنارەکانی ئەم کارەدا وەستاون دەڵێن "با گەر تەنها بە دوعایەکیش بووە، پشکی منیش لەم کارەدا هەبێت" دەڕۆنە ژێر چەتری ئەو وتەیەوە.

---

١. بەدیعوززەمان، پاشبەندی قەستەمۆنی.

دیوی دووەمی بابەتەکە ئەوەیە کە لە ڕێی ئەو وانە مەعریفیانەی ئەم بەرهەمانە کە تەفسیری قورئان لەم سەردەمەدا بە مرۆڤی دەدەن، باوەڕبوون بەخوا بە شێوەیەك دەچێتە ناخی مرۆڤ و تێیدا جێگیر دەبێت کە —إن شاء الله— دەستی شەیتان ناگات بەو کەسانەی سەر گەرمی خوێندن و لێکۆڵینەوەن تیایاندا. بەڵام داخۆ لەو خاڵەداین؟ داخۆ لە ئاستی ئەودا وەستاوین و مافی وەستانەکەمان دەدەین؟ ئەمانە کۆمەڵێك شتی جێی تێڕامان و لەسەر وەستان و ئەندێشە ئاوەرن. ئەم کارە پێویستی بە لێبڕان و وەفایە، پێویستی بە سەرڕاستییە، پێویستی بە ئیخلاسە. تا ئەو پەڕی پێویستی بە ئیخلاسە.

مرۆڤ لە کاتی نەخۆشیدا زۆر قووڵتر هەست بەمانە دەکات. پێویستە هەستی پێ بکات، لەجێی ئەوەی بکەوێتە نێو ترس و ئەندێشەی مردنەوە. هەرچۆنێك بێت ئەم ڕێبوارییە حەقە و بەری ناگیرێت، بۆیە پێویستە زۆر بە باشی دەمی تێپەڕبوونی لەم داڵانە یاخود بازدانی بەسەر ئەم کەندەڵانەدا بقۆزێتەوە. مرۆڤ دەبێت بە تەواوی بوونییەوە وابەستەی خوا بێت، تا لەو بەرەو لەو دونیا لە شوێنێکی پاك و سەلامەت بگیرسێتەوە.

## وەستانەوە لە بەرامبەر دارمانی دەرکی

لە پێکەوە بوون و بەکۆمەڵ ژیاندا ڕەحمەت و لە جودایی و پەرگیریشدا نیقمەت (بەلا و ئافات) هەیە، کەوایە نابێت جیا لە خەڵکی و بە تەنها بمێنینەوە. جیابوونەوە مەترسیدار و کوشندەیە. وەك چۆن هەموو حضورێك ڕەنگداربوون (إنصباغ)ێکی لەگەڵدایە، هەرواش بەیەکەوە بوون ڕەنگدار بوون بە ڕەنگی خوای لەگەڵدایە. لەلایەکی دیکەوە پێویستە کاتێك لە شوێنێك دەمێنینەوە یاخود بۆ شوێنێك دەڕۆین، تا دەکرێت لەگەڵ کەسێك بین کە بمانگێڕێتەوە لە خراپە،

نابێت تەنها بین و تەنها برۆین و بە تەنها بسوڕێینەوە.

نابێت تێگەیشتنمان بۆ ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا کە دەفەرموێت "تەنها شەیتانە"[١] تەنها لە چوارچێوەیەکی تەسکدا بێت، دەبێت لێکدانەوەیەکی فراوانی لەم شێوەیەی بۆ بکەین، "شەیتانییەت هەیە لە هەموو تاك و تەرابوونەوەیەکدا، لە مانەوە و ژیان لە شوێنێکدا بە تەنها تا گەڕان و ڕێ کردن بە تەنها". بەڵێ، لە تەنهاییدا جۆرێك لە شەیتانییەت هەیە. پێغەمبەری خوا، بە واتایەك بۆ دوو کەسیش هەر هەمان شت دەڵێت. چونکە بە گوێرەی ئەگەرەکان و لە بازنەی ئەگەرەکاندا ڕێککەوتنی دوو کەس لەسەر ئەنجامدانی کارێکی خراپە ئاستێکی بەرز تۆمار دەکات. پێویستە تا دەکرێت سێ کەس پێکەوە بن. ئەگەری کۆبوونەوەی سێ کەس لەسەر خراپە و بە جارێك تووشبوونیان بە داڕمان زۆر ئەگەرێکی کزە.

لە کاسەی بیرو خەیاڵماندا بەردەوام دەبێت شتێك هەبێت. بۆ نموونە کاتێك بۆ شوێنێك دەڕۆین، دەبێت ئامانجمان لە ڕۆیشتنەکەمان ڕوون بێت و بۆ کارێك بڕۆین. بەدرێژای ڕێ دەبێت بیر لەو کارە بکەینەوە کە بۆی دەڕۆین. پێش ئەوەش کە بکەوینە ڕێ دەبێت ڕوو بکەینە خودا و چاو بە حاڵەتی دەروونیمان بخشێنینەوە. پێویستە زۆر دوعا و داوای لێخۆشبوون بکەین. پەنا بۆ پەنای ئەو بەرین و بڵێین "پەروەردگارا! گەر هەزار جاریش شایان بم بەوەی پێم بخلیسکێت، تۆ مەهێڵە بکەوم." یاخود وەك جاران دەیانگوت بڵێین "ڕێ مەدە لە دەستمەوە، لە قاچمەوە، لە چاومەوە، لە گوێمەوە، لە دەممەوە یاخود لە لێومەوە شتێکی خراپ بێتە مەیدان."

پێویستە کۆنترۆڵی خۆمان بە باشی بکەین، لە بەرامبەر گوناهدا شلی

---

١. الترمذي، الجهاد ٤؛ أبو داود، الجهاد ٨٦.

نەنوێنین و بەرامبەر کەمتەرخەمی و بێخەمی داخراو بین. تەنانەت بەرامبەر شکۆ فەکردنی جوانییەکی ناخمان دمێت وەك چێژێکی ڕۆحانی تەماشای بکەین و لە جێی خۆشحاڵ بوون، بڵێین "پەروەردگارا، من وەك ئەوەی پێویستە بەندایەتیم بۆ تۆ ئەنجام نەداوە کە شنەیەکی لەم شێوەیە لە ناخمدا هەست پێبکەم. نەکا ئەم حاڵەم لە شەیتانەوە بێت؟". بەڵێ، تەنانەت پێویستە بۆ بوونی شتێکی لەم شێوەیەش داوای لێخۆشبوون لە پەروەردگار بکەین.

ئەسڵ ئەوەیە متمانە بە هیچ جوانییەکی خۆمان نەکەین، ئەوانەی لە دونیادا لە نێو ترسدا دەژین لە دوارۆژدا لە نێو ئارامی و بێخەمیدا دەبن. جەنابی "الله" (جَلَّ جَلَالُهُ) لە فەرموودەیەکی قودسیدا دەفەرموێت "ترس و بێخەمی پێکەوە کۆناکەمەوە و بە جارێك نایدەم بە کەس"[1] واتە ئەوانەی لێرەدا لە ترسدا دەژین سەبارەت بە دوارۆژیان، لەوێ بێ خەم و ئارام دەبن. ئەوانەش لێرە ئەندێشەیەکیان نیە سەبارەت بە دوارۆژ و هیچ ئامادەسازییەك بۆ ئەولایان ئەنجام نادەن، لەوێ لە ترسدا دەبن. زۆرێك لە دۆستانی حەق، لە شازەلییەوە بۆ ئیمام غەزالی، لەویشەوە بۆ مامۆستا بەدیعوززەمان، هەموو جەخت لەوە دەکەنەوە کە پێویستە تا لە ژیاندایین دەرگای ترس تا ئەوپەڕی بە کراوەیی بهێڵینەوە و لە ساتەوەختی مردنیشدا دەست بە دامەنی ئومێدەوە بگرین. نابێت بە هیچ شێوەیەك بێخەم بین و سەبارەت بە ژیانی دوارۆژمان لە دڵنیاییدا بین.

جا هەرچەندە قوتابییانی قورئان بەهۆی دوعاکردنیانەوە بۆ یەکدی و بەهۆی ئەوەی لەتیفەکانیان لە ڕوانگەی ئیمانی تەحقیقیەوە نورئەفشان بووە و ئیمان تا ئەو پنتانەی دڵیان کە دەستی شەیتانی پێناگات گەیشتووە، موژدەی بە ئیمانەوە چوونە ناوگۆڕییان وەرگرتبێت -إن شاء الله-. هێشتاش نابێت هیچ قوتابییەکی

---

١. إبن حبان، الصحيح ٤٠٦/٢؛ أبو نعيم، حلية الأولياء ٢٧٠/١، ١٨٩/٥، ٩٨/٦.

قورئان دڵنیا و بێ خەم بێت سەبارەت بە ژیانی دواڕۆژی. لەم بارەیەشەوە نابێت ئەو وتانەی لە پلەی "ترهیب و ترغیب - ترساندن و هاندان"دا وتراون لەگەڵ هێڵە گشتییەکانی ڕێگەی ڕاستدا "صراط المستقیم" تێکەڵ بکەین. بۆ نموونە ئەو فەرموودەیەی سەروەرمان کە بۆ ترساندن فەرموویەتی: ''ئەو کەسەی درۆ بکات و بەڵێن بشکێنێت و ناپاکی لە سپاردەدا بکات، مونافقێکی تەواوە''[1] یاخود فەرموودەی ''ئەو کەسەی بڵێت (لا اله الا الله) دەچێتە بەهەشتەوە''[2] کە وەك مژدەیەکی هاندەر وەهایە، دەبێت بە تێڕامان لە هۆکار و کەشی وتنەکانیان لەسەریان بوەستینەوە و لەگەڵ دەستوورە گشتییەکاندا تێکەڵیان نەکەین.

## شەیتان

خوای باڵادەست هەمووومان لە شەڕی شەیتان بپارێزێت. گەر ڕۆژی هەزار جار بڵێین ''رَبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِينِ وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَنْ يَحْضُرُونِ''، واتە " پەروەردگارا، پەنا دەگرم بە تۆ لە وەسوەسەی شەیتانەکان، لەوەی ئەوان زەفەرم پێ ببەن"[3]. چونکە شەیتان فێڵ و یاری زۆر زۆر دەزانێت. هیچ کەسێك لەو شەترەنجەدا کە ئەو دەیکات براوە نابێت، مەگەر ئەوەی یارمەتیی خوایی ببێتە هۆی ئەوەی دەستی ببەسترێت. چونکە ئەو تەنها تۆوی وەسوەسە فڕێدەداتە ناخی مرۆڤەکانەوە و دەبێتە هۆکاری شەڕ و خراپە. بەڵام خوڵقێنەر و دروستکەری شەڕ و خراپە ئەو نییە. خوڵقێنەری خێر و شەڕ و نوور و تاریکیش هەر خوایە.

کار دانەپاڵ شەیتان و وتنی ''ئەو کردی... ئەو ئەنجامی دا'' و وتنی ئەوەی

١. البخاري، الإيمان ٢٤، الشهادات ٢٨، الوصايا ٨، اللباس ٦٩؛ مسلم، الإيمان ١٠٧-١١٠.
٢. الترمذي، الإيمان ١٧.
٣. المؤمنون: ٩٧-٩٨.

کە ئەو توانیویەتی کارێك بخوڵقێنێت و جەختکردنەوە لە ڕۆڵی ئەو، ڕەنگە مەترسیدار بێت. لەم بارەدا شەیتان، وەك لە فەرموودەیەکی پیرۆزدا ئاماژەی پێکراوە، فووی تێ دەبێت و لە خۆی بایی دەبێت. ئەوەی پێویستە بیکەین ئەوەیە وەك دەربڕینی متمانە و دڵنیاییمان بە خوا، بیر لە بێ کاریگەریی شەیتان لە بەرامبەر هێز و توانای بێ پایانی خواوە و ئەوەی کە ناتوانێت هیچ زیانێك بە بەندە سەرڕاستەکانی بگەیەنێت بکەینەوە و لە بەرامبەر ئەوەوە پێ قایم و سەلامەت بوەستین. واتە پێویستە هەم لە ڕوانگەی ڕەفتاری خۆمان و هەم لە ڕوانگەی حیکمەتی دروستکردنی ئەو و فەرمانبەرییەکەیەوە تەماشای بابەتەکە بکەین.

جارێکیان لە گۆڤاری (SIZINTI-سزنتی)دا وێنەی عەجوزەیەکی شەمتا "پیرێژنێکی لە پەل و پۆ کەوتوو" بڵاوکرابوویەوە. ئەو وێنەیە زیاتر بە ئەو دێوە ترسناکانە دەچوو کە لە فیلمە خەیاڵییەکاندا هەیە، تا لە مرۆڤێك، لەسەر وێنەکە ئەم نوسینە هەبوو "ئەو هەرگیز تا ئێستا لەسەر شێوەی ڕاستەقینە و بە پێناسی خۆیەوە خۆی نیشان نەداوە، مرۆڤایەتی هەمیشە ئەوی لە ژێر دەمامکی جیاواز و شێوازی جۆراوجۆردا دیوە. وا ئێستاش دیەوێت بە بەکارهێنانی تەواوی شێوازەکان ترسناکترین یاری کە تەواوی مرۆڤایەتی لەخۆ بگرێت، ئەنجام بدات. یاری نێوان مەفیستۆ و فاوست، کە لەگەڵ بوونی مرۆڤدا دەستی پێکردووە و هێشتا تەواو نەبووە".

بەڵێ، گۆتەش لە کۆتایی فاوستدا دەڵێت "ئەم چیرۆکە تەواو نەبووە" نازانرێت فاوست براوەیە یاخود مەفیستۆ؟ فاوست گەنجێکی نەشارەزایە، بوونەوەرێکە تەمەنی خۆی بەسەر دەبات... شەیتانیش سەیر و سەمەرەیەکە کە بە تەمەنی تەواوی مرۆڤایەتی لە ژیاندا بووە. ئێوەش ئەو وێنەیە یاخود هاوشێوەکانتان دیوە.

ڕەنگە کاتێکیش ناوی شەیتان ببرێت لە هزرتاندا ئەو وێنەیە زیندوو ببێتەوە، بەڵام شەیتان زۆر جیاوازە لەو وێنەیەی لە هزرتاندا هەیە.

ئەو لەسەر وێنەی فریودەران و لە خشتەبەرانی جۆراوجۆر ڕووبەڕووی مرۆڤ دەبێتەوە. هەندێکجار دیوی ئاژەڵیی مرۆڤ بەکاردەهێنێت و ئەم هەستانە ختووکە دەدات، هەندێك جار وەك جانەوەرێکی مرۆڤ قووتدەر و هەندێك جاریش وەك ساحیرێك دێتە پێشەوە کە مێشکی مرۆڤەکان دەخوێنێتەوە و لە ڕێی ناردنی شەپۆلی کارەبایی جۆراوجۆرەوە هەوڵ دەدات کاریگەریی نەرێنی لەسەر دروست بکات، یاخود لە ڕژێنەکانی مێشکدا جێی خۆی دەکاتەوە و هۆرمۆنی جۆراوجۆر دەڕژێت و بەم شێوەیە خەونی ناخۆش بە دوژمنەکانی نیشان دەدات.

پاش ئەوەی تێبینییە مێتافیزیکییەکان لە ژیانی مرۆڤدا سڕانەوە، نەخۆشیی ڕوونکردنەوەی فیزیکییانە بۆ تەواوی بابەتەکان لە مرۆڤدا سەریهەڵدا. هەر بۆیەش مرۆڤی ئەمڕۆمان تووشی دوالیزمەیەك بووە. تەنانەت ئەو کەسانەش کە باوەڕیان بە بنەماکانی ئاین هەیە و پێیان وایە هەموو شتێکی جیهانی فیزیکی لەلایەن مێتافیزیکەوە بەڕێوە دەبرێت، تووشی نەخۆشیی ڕوونکردنەوەی حاڵەتەکان لە چوارچێوەی فیزیکدا بوونەتەوە. ئەم ڕوانگە پۆزەتیڤیستە ترسناکەی ئەمڕۆ هەندێك کاریگەریی وەهای دروست کردووە کە بە شێوەیەك لە شێوەکان سیستمی باوەڕ لە مێشکی مرۆڤەکاندا دەشێوێنێت. بگرە ئەمە هاتووەتە دی و نزیکە بڵێین کۆمەڵێك گومانی سەبارەت بە مێتافیزیك فڕێداوەتە دڵی هەموو کەسێکەوە.

ئەمڕۆ هەموو بە گومانن. ئەو گومانەش تەنها لە ڕێی خۆ بە پەرستش خەریککردنەوە دەڕەوێتەوە. چونکە ئاین پێکهاتووە لە "تصدیق بالقلب، إقرار باللسان، و أعمال بالأرکان" واتە قەبوڵکردنی حەقیقەت بە دڵ و دەربڕینی بە زوبان و پاشان کامڵکردنی ئەم دووانە بە ڕەفتار.

مرۆڤ دەبێت زۆر پەرستش ئەنجام بدات. پەرستش ببێتە لایەنێکی سروشتی ئەو. وەك کانت دەڵێت "ئەو بە عەقڵی تیۆری نایەتە ناسین". ناسینی خودا تەنها لە ڕێی ئەقڵی کردەییەوە دەبێت. بێرگسۆن لە لای خۆیەوە ویژدان و پەی پێبردن لە پێشەوەی کارەکە دادەنێت، بە واتایەك دەڵێت هەموو شتێك دەکرێت لە ڕێی ویژدان و پەی پێبردنەوە بدۆزرێتەوە. بەڵێ، مرۆڤ بە دیدێکی ئولوهییەتی هەمیشە بە دەلیل بەندەوە ناتوانێت هەرگیز خۆی لەو کێشانە ڕزگار بکات کە ڕووبەڕووی ئیمانەکەی دەبنەوە. ئیمان لە عەقڵ زیاتر پێویستە لە دڵدا جێی خۆی بکاتەوە و جێگیر ببێت. ئەمەش بەوە دەبێت هەر لە سەرەتای ڕێگەوە مرۆڤ دڵ و گیانی خۆی بە خودا بفرۆشێت، نەك بە شەیتان. دڵی بە خودای خۆی بفرۆشێت و بڵێت ئەمەم لێ وەرگرە، ئەمەماڵی تۆیە، تەختی خۆتی تێدا دابنێ.

نێوچاوانی بە سوجدە بسپێرێت و بڵێت "دڵم لە هەموو شتێکی دیکە پاك بکەرەوە بێجگە لە خۆت و سەرکەوتووم بکە تا بگەم بە بازنەی ئولوهییەتی خۆت" ، دەبێت بیست ساڵ، سی ساڵ بەم شێوەیە بپاڕێینەوە. مرۆڤ تەنها لە پاش هەوڵ و تێکۆشانێکی لەم شێوەیە ئەوجا دەتوانێت بگاتە "حق اليقين" کە ئەوە ئامانجێکە دەبێت بە ژیان و توانەوە بۆی، پێی بگەین. ئەوانەش کە دەگەنە ئەو ئامانجە، گەر هەزار شەیتان بە هەزار جۆر فێڵ و تەڵەکەوە ڕووبەڕوویان ببنەوە بە یارمەتی خوا ناتوانن زیانیان پێ بگەیەنن.

پۆزەتیڤیزم، ڕەنگە تەلیسمی زانستە تیۆرییەکان بشکێنێت، بەڵام ناتوانێت دەستی بگاتە زانستە کردەییەکان بۆیە خەڵکی عەوام لەم ڕوانگەیەوە بەختیارترن تا ئەو کەسانەی شتێك دەزانن. ئەوان باوەڕێکی سازگاریان هەیە. بە زۆریی لە مێشکی ئەو کەسانەدا کە دەخوێننەوە و کتێب هەڵاوێر دەکەن جۆرێك لە کەلێن

دروست بووە. ئەگەر ئەم كەسانە وەك چۆن سەرگەرمی بابەتە عەقڵییەكانن هەرواش گرنگی بە دڵیان بدەن و گیانیان پشتگوێ نەخەن، ئەوا لەو كەلێنانەوە ناكەونە خوارەوە. وەگەرنا لەو درز و كەلێنانەوە دەكەونە خوارەوە كە زانستە سروشتییەكان و فەلسەفە دروستیان دەكەن. لەبەر ئەم هۆیەیە لە ساڵانێكی زۆر لەمەوبەرەوە تێبینییەكم هەبووە بۆ خۆم كە لە ناخمدا ئاوم داوە و پەروەردەم كردووە، پاشانیش لە ڕێی ئەو ڕووداوانەوە كە لە چواردەورمدا ڕوویانداوە بە تەواوی باوەڕم بە دروستییەكەی كردووە، ئەویش ئەمەیە: ئەگەر بڕیار بێت فەلسەفە بخوێنرێت، بێگومان دەبێت لە تەنیشتیدا تەسەووفیش بخوێنرێت و وانەكەش لەلایەن مامۆستایەكەوە بوترێتەوە كە لەو بوارەدا بە باشی پەروەردە بووبێت و وەك چۆن شارەزای بابەتەكانە، هەرواش بە زانیارییەكانی كار بكات و لە ژیانیدا ڕەنگیان پێ بداتەوە. مەرجە بە لایەنی كەمەوە هێندەی عەقڵ گرنگی بە دڵیش بدرێت، كاری لەسەر بكرێت و گەشەی پێ بدرێت تا لە دەرئەنجامدا هاوسەنگی و هاوحاڵیی لە نێوان دڵ و عەقڵدا بێتە مەیدان. وەگەرنا ئیمانی مرۆڤەكان بە پریشكێك ئاگری بێ تین دەسووتێت و خاوەنەكەشی لە ژێر مەرجە ناهەموارەكاندا بە جارێك دەتوێتەوە و لەناودەچێت. ڕەنگە پرسیاری ئەوە بە بیردا بێت كە "بۆچی ئەم بابەتە هێندە ناسكە؟" چونكە لە دونیایەكی تاقیكردنەوەداین كە "نهێنیی بەرپرسیارێتی- سر التكلیف"ە. بێ هیممەت و تێكۆشان ناتوانین ئەم تاقیكردنەوەیە بدەین. لە نێوان كوفر و ئیماندا پەردەیەكی ناسك هەیە. گەر بە توندی ئەم پەردەیە نەگیرێت، هەموو كاتێك ئەگەری ئەوە هەیە بەهۆی جوڵەیەكی فیكرییەوە تووشی بەدبەختی كەوتنە ئەودیوی پەردەكە ببینەوە. كەوایە پێویستە زۆر بە توندی دەست بە ئەركی بەندایەتیمانەوە بگرین و پەنا بۆ خوای باڵادەست بەرین. پێویستە هەمیشە وریابین بەرامبەر ئەو

وەسوەسانەی ناوبەناو لە دەروونماندا درووست دەبن، پێویستە کورتهێنانی بیر و ئیدراکمان لە بەرامبەر هەندێك لە بابەتەکانەوە قەبوڵ بکەین و هەندێك جاریش بەم شێوەیە بیر بکەینەوە "من لە بەرامبەر خواوە دەست لەسەر سینە و ڕوو بە کەعبە وەستاوم. ئێستا من لە نێو بازنەیەکدام لە پێش منەوە ڕیزێك خەڵکی دی بازنەیان بەستووە، لەپێش ئەوانیشەوە بازنەیەکی دی و لە پێش ئەوانیشەوە هەزاران بازنە... بەم شێوەیە ملیۆنان کەس وەك بڵێی لە بەرامبەر کەعبە نوێژ بکەن، ڕوویان لە کەعبە کردووە. چەندە زۆرن ژمارەی ئەو مرۆڤە خاوەن ژیریی و بلیمەت و دەروون بەرزانەی کە بێ هیچ سڵەمینەوە و گومانێك ڕوویان کردووەتە پەروەردگار. ئەی نەزان و نەفام! مەگەر تەنها تۆی کە لە عەقڵ و بەڵگەکاری و زانست و هونەر تێدەگەیت؟!!"

## غەیبەت

قسەکردن دەربارەی هەر موسوڵمانێك کە لە کاتی بیستنەوەیدا ببێتە هۆی دڵتەنگبوونی کەسی بەرامبەر، گەر تەنها هێندەش بێت کە بڵێیت "بە لاچاوێکەوە تەماشای کردم" غەیبەتە و حەرامە. بەڵام چەندە سەیر و ئازار بەخشە کە هەندێك لەو کەسانەی دەڵێن "با خزمەتێکی ئاین و گەل بکەین" و، دەڵێن "با لە ناو ئەم دامەزراوەیەدا بم و لەگەڵ ئەم هاوڕێیانەدا هەستم و دانیشم، تا خێر و چاکەم بۆ بنوسرێت" کەچی خۆیان لە کەوتنە نێو ئەم گوناهە پیسە ناپارێزن. لە ڕاستیدا ئەم ڕەفتارە واتای قەبوڵکردنی بەشێکی ئاین و ئەنجامدانی ئەو بەشە و ڕەتکردنەوە و پشتگوێ خستنی بەشێکی دیکەیەتی. قورئانی پیرۆز کاتێك باسی هەندێك لەو کەسانە دەکات کە ئیمان لە دڵیاندا جێگیر نەبووە، دەفەرموێت "نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ" واتە "باوەڕ بە هەندێکی دەهێنن و بە هەندێکی دیکەی

باوەڕ ناهێنن"[1] ڕەخنە لە بەجێهێنانی هەندێك لە فەرمانەکانی ئاین و پشتگوێ خستنی هەندێکی تریان دەگرێت.

لەلایەکی ترەوە گەر کارێکی لەم شێوەیە بە خودی ئەرکی ئێمە دانەنرابێت، مافی ئەوەمان نییە هەڵە و کەموکورییەکانی کەسانی دی ببینین و بیکەینە ویردی زوبان و ئاگاداریان بکەینەوە تا وازی لێبهێنن. بۆ نموونە، ڕەنگە هەندێك لە هاوڕێیان حەسیر و قاڵییەکانیان هەڵگرتبێت و لەجێیاندا فەرشی بەنرخیان ڕاخستبێت. هەندێکیان ڕەنگە کورسییە تەختەکانیان فڕێدابێت و لەجێیاندا قەنەفەی گرانبەهایان کڕیبێت. لە بنەڕەتدا بۆ کەسانێك کە لە ئاستی ئێمەدا ژیان بەسەر دەبەن هیچ یەکێك لەمانە حەرام نییە. واتە، نە فەرش ڕاخستن و نە قەنەفە کڕین حەرام نییە، ڕەنگە لەسەر حەسیر نوستن و سەرینی لە خەو لە تەختە بوون، جۆرێك لە زوهد بێت. بگرە گەر ئەم حاڵەتە لە سروشتی ئەو کەسەوە هەڵنەقوڵابێت و ببێتە هۆکاری خۆنیشاندان و ڕیاکاریی بۆ خەڵکی، ئەوە ڕەنگە شتێکی زۆر مەترسیدار بێت بۆ ئەو کەسە. بۆیە کەس بۆی نییە بێت و بڵێت "مامۆستا، ئەوکەسانەی تۆ دەتناسین بوون بە مێژوو، ئەو سەردەمە هەر زۆر زوو بەسەرچوو". جاران خەڵك لەسەر حەسیر دادەنیشتن، ئێستا لەسەر فەرش و قەنەفە دادەنیشن. کاری ئەو پیاوەی حەسیر و کورسییە تەختەکەی گۆڕیوە بۆ فەرش و قەنەفەی گرانبەها حەرام نییە، بەڵام ئەم ڕەخنە و غەیبەتەی ئەم کەسەی دیکە بە هەموو شێوەیەك حەرامە. لە بەرامبەر ئەم حاڵەتەوە گوفتارێکی لەم شێوەیە کە "چیدی لەسەر فەرش دادەنیشێت و کورسییە تەختەکانیشی گۆڕیوە و خراپی لێ بەسەر هاتووە" غەیبەتە و بە هەموو شێوەیەك حەرامە.

ڕەنگە کەسێك سێ دەستە جلی هەبێت. هەبوونی شتێك لە دەرەوەی پێویستی

---

١. النساء: ١٥٠.

بەدیوێکدا ئیسرافە و بەدیوێکی تردا ئیسراف نییە. ئێمە نییەتی ئەو کەسە نازانین، ڕەنگە لەبەر پێویستی و بەرژەوەندییەك وا بە باش بزانێت کە لەگەڵ هەر چوونە دەرەوەیەکدا جلێکی جیاواز بپۆشێت. ڕەنگە بڵێت "خەڵك لە کەسێتی منەوە دینی موبینی ئیسلام دەبینن، بۆ بەرجەستەکردنی ئایینەکەم بەگوێرەی مەرجەکانی ئەمڕۆ پێویستە شیك پۆشیش بم" واتە ئەو کەسە کۆمەڵێك تێبینی دیاری هەیە سەبارەت بەو ئەرکەی ئەنجامی دەدات. بەڵێ، کاری ئەو کەسەی دۆڵابەکەی پڕ لە جلە حەرام نییە، بەڵکو ئیسرافێکی بچوکە. تەنانەت ئیسرافیش لە نێو خۆیدا لە یەك ئاستدا نییە. ئاستی جیاواز جیاوازی هەیە. ناتوانین بەشێوەیەکی یەکلاکەرەوە بەم حاڵەی ئەو بڵێین "حەرام". بەڵام ڕەخنەگرتنی کەسێکی دیکە لە شێوەی ئەوەی بڵێت "فلانە کەس تا گەردنی لە ئیسرافدا نوقم بووە" بەبێ هیچ گومانێك حەرامە و ناپەسەندە.

لە کاتێکدا پێویستە کەسانی نێو بازنەی خزمەت - کە بە بازنەی موتەقین هەژماری دەکەین - هەمیشە لە کەوسەر بخۆنەوە و کافور بکەن بە بۆوە، کەچی ئەوانیش هەندێکجار ئالودەی بیرکردنەوەی زۆر چەپەڵ دەبن و لە جێی ئاوی کەوسەر زەقوم دەخۆن و هیچ بەخۆیان نازانن. لە کاتێکدا پێویستە لە هەستان و دانیشتنندا بۆنی کافور بکەن و بۆنی کافور پەخش بکەنەوە، لە کەوسەر بنۆشنەوە و وەك بەهەشتییەکان ژیان ببەنە سەر... نابێت باسی کەس بە خراپە بکەین گەر کەسێك پەنجا جار خراپەمان لەگەڵدا بکات، ئەوا خراپەکانی ڕێگەی بە خراپە وەڵام دانەوە بۆ ئێمە ڕەوا ناکەن. خراپە خۆی لە خۆیدا خراپە، جا چ ئێمە ڕووبەڕووی ببینەوە چ نەبینەوە. بەدیعوززەمان بە "مقابل بالمثل - وەڵامدانەوە بە هەمان کاری بەرامبەر"ی وتووە "دەستووری ستەمکارانە". بەڵێ، وەڵامدانەوەی خراپە بە خراپە نیشانەی ڕەفتارێکی ستەمکارانەیە.

گەر فەرمانەکانی ئاین دەربارەی خۆڕازاندنەوە بە خووڕەوشتە جوانەکان و

دورکەوتنەوە لە خووڕەوشتە ناپەسەندەکان جێبەجێ بکرێت ئەوا بنەماکانی بە چاکی وەڵامی خراپەدانەوە و لەگەڵ خراپترین کەسەکاندا بە باشی هەڵکردن و فێرکردنی ڕێباز و ئادابی ژیانی مرۆڤانە بە مارە کوبراکان و لەبیربردنەوەی گەستنی مرۆڤ لە لایەن دووپشکەکانەوە، هەموو بەدی دێن و یەکبوون و یەکڕیزی بە تەواوی دەچەسپێت. ئەمڕۆ مرۆڤ لە توانایدایە تەنانەت دڕندەترین ئاژەڵەکانیش پەروەردە و ڕام بکات. دەی خودی ئادەمیزاد لە هەموو بونەوەرێك سازترە بۆ پەروەردە بوون. گەر لە بەرامبەر کێشەکانەوە هەموو تاکێك پێداچوونەوە بۆ خۆی بکات و لەجێی چاوەڕوانیی تێگەیشتنی بەرامبەر لە هەڵەکەی و پەشیمان بوونەوە لێی، بە نمایشکردنی ڕەفتارێکی نمونەیی خۆی هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەکە بدات، نیوەی کێشەکە کەم دەبێتەوە و بگرە چارەسەریش دەبێت.

باوەڕم نییە دوای تێگەیشتن لە موسوڵمانێتی ڕاستەقینە و بەجددی لە بواری ژیاندا ڕەنگپێدانەوەی هیچ کێشەیەك بمێنێت. کاتێك تاك تاکی موسوڵمانان وایان لێهات لە هەموو ئەو شتانەی بە دەم، چاو یاخود گوێیاندا گوزەر دەکەن "وشەی نهێنی" بپرسن، ئیدی هیچ کێشەیەکی کۆمەڵایەتی نامێنێت. خوداش یەکبوون و یەکڕیزی دێنێتە مەیدان. هێندە بەسە هەموو باوەڕدارێك ژیانی لەسەر ڕێڕەوی ئەو وتەیە بەڕێوەبەرێت کە دەڵێت "گەر بەهەشتت دەوێت هیچ گیانێك ئازار مەدە".

## شیرکی پەنهان

لە فەرموودەیەکی پیرۆزدا کە ئەبو لەیسی سەمەرقەندی لە کتێبی "تنبيه الغافلين" و لە باسی ئیخلاسدا هێناویەتی، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لە موسنەدەکەیدا دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خودا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) فەرموویەتی "ئەو شتەی کە

زۆرترین ترسم هەیە لە بارەیەوە بۆتان، شیرکی بچووکە“، هاوەڵە بەڕێزەکان پرسیان ”شیرکی بچووك چییە؟“ سەروەر لە وەڵامدا فەرمووی ”ڕیا“ لە ڕیوایەتێکیشدا لە جێی شیرکی بچووك، "شیرکی پەنهان"ی هاتووە. چییە هاوەڵدانانی شاراوە و پەنهان بۆ خودای گەورە؟ ڕیا و نمایشە، گەرچی بچووك و کەمیش بێت. خۆدەرخستن و نیشاندانی خودە بە شێوەیەکی ویستمەندانە. ئەگەر لە نوێژدا هەندێك هەست لە دەرەوەی ویستی مرۆڤەوە بێنە ناخەوە و بەم هۆیەوە مرۆڤ دەنگی لێوە بێت، ڕەنگە ببەخشرێت. بۆ نموونە، بەندەیەك وەها لە نوێژەکەیدا ڕۆچووە کە هەستی هەروەك ئەوەیە سەری لە بەر ئەژنۆی خوای گەورەدا دانابێت. جەنابی حەق لە ئەژنۆ و سەر و قاچ پاك و بێ بەرییە، بەڵام وەك لالانەوەی "خودایە پێیەکانت لە کوێن؟"ی ڕەجاییزادە، ئەمانەش بە گوفتارکردنی هەستێك و حاڵێکی قووڵی بەندەن.

بەڵێ بەندە کاتێك لە نێو هەستێکی قووڵ و حاڵێکی لەم شێوەیەدا بێت گەر بە دەنگێکی بەرزی وەهاش بڵێت ”الله“ کە گەرووی بدرێت، هەر بەخشراوە. چونکە مرۆڤ کە لەو حاڵەدا بێت ئاگای لەوە نییە چی دەڵێت و چی ئەنجام دەدات، گەر هەواڵی پێ بدەن دەربارەی ئەو کارەی دەڵێت ”من ئاگام لەو شتە نییە، بیرم نایەتەوە“. بنەمای بابەتەکەش هەر ئەمەیە. گەر لە حاڵێکی وەهادا نەبێت، مافی ئەوەی نییە لە دەرەوە شتێك بە ویستی خۆی تێکەڵ بە پەرستشەکان بکات. ئەوە دەبێتە هەڵبەستنی درۆ و پیسکردنی کارێکی سازگار. بەڵام خاڵێکی گرنگی تر هەیە، ئەویش ئەوەیە کە ئێمە هەر شتێك لە کەسێکی دیکەدا ببینین مافی ئەوەمان نییە بڵێین ”ڕیا ئەنجام دەدات“. سەنگێکی مەحەکی لەو شێوەیەمان لا نییە کە بتوانین ڕیاکەی نیشان بدەین یاخود لە ڕیانەکردنی دڵنیا ببینەوە.

مافی ئەوەمان نییە لێپرسینەوە لە خەڵکی دی بکەین و بە خەیاڵماندا

بهێنین یاخود بڵێین "ئایا ئەمە پەیوەندییەکی لەگەڵ خوادا هەیە کە وا دەڵێت، ویستمەندانە وا دەڵێت، یاخود لەدەرەوەی ویستی خۆیەوەیەتی؟ ئایا ئەمە ناڵەی عەشق و هەیەجانیەتی؟ یاخود بۆ خۆنیشاندان و سەرنجی چواردەور ڕاکێشان هاوار دەکات؟ ڕاستە قورئان دەخوێنێت بەڵام ئایا بە مەبەستی خۆ پێشخستن دەیخوێنێت یاخود بۆ ڕەزامەندیی خوایە؟" ڕەنگە خەڵکی لە چواردەوەرماندا دەنگی جیاواز جیاوازیان لێ بەرزببێتەوە، ڕەنگە بەجۆرێك بێت ئێمە نارەحەت بکات، بەڵام ئێمە مافی ئەوەمان نییە گومانی خراپیان پێ ببەین. ئەو دەرگایە بە ڕووی ئێمەدا داخراوە. ئەگەری هەیە ئێمە تێنەگەین و ئەو مرۆڤە شتانێکی زۆر جیاواز هەست پێ بکات کە لە ڕۆحییەوە بەرزببنەوە و بەر گەرووی بکەون و دەنگە ژێیەکانی بلەرێنەوە و ئەمیش وەك چۆن عودێك یان کەمانێك بە لەراندنەوەی ژێیەکانی دەنگیان لێ بەرزدەبێتەوە دەنگی لێ بەرزببێتەوە. سەبارەت بە کەسانی دی بەم شێوەیە بیردەکەینەوە. بۆ خۆشمان زۆر ڕەق و بە کۆت و بەند دەبین و گەر بچووکترین نرکە یاخود نزمترین نووزەمان لێوە بێت لە خۆمان خۆش نابین.

بەڵێ، نابێت ئەم دوو شتە لەگەڵ یەکدی تێکەڵ بکەین، نابێت بکەوینە تێگەیشتنی هەڵەوە. وەك چۆن لە زیکر و فیکردا بەم شێوەیە، دەبێت لە هەڵسوکەوت و ڕەفتارەکانی دیکەشدا هەمیشە ئەرێنیانە سەبارەت بە کەسانی دی بیر بکەینەوە و گومانی باشیان پێ ببەین، بۆ خۆشمان دەبێت هەمیشە بازنەی ڕەخنە و تێبینیی بە کراوەیی بهێڵینەوە و بپرسین "داخۆ ئەمەش تەڵەیەکی نوێیە لە نەفسمدا؟"

سەرباری نەخۆشی و بێ حاڵیم، لەبەر خاتری بابەتێکی گرنگی وەك یادکردنەوەی جەنابی حەق، گەر بە زۆریش بوویێت ئەم تۆزقاڵە شتەم وت. بەڵێ، زیکر بریتییە لەوەی لە بەرامبەر نیعمەتە ئاشکراو پەنهانەکانی جەنابی حەقەوە، بانگەواز بۆ ناوی ئەو بکەیت لە لای ئینس و جینن و هەموو بوونەوەران. ئەمە

بۆ باوەڕداران لە ئاو و هەوا گرنگترە. هەم هێندە گرنگە کە گەر ئەم بانگەوازە بوەستێت، ئیدی حیکمەتی بوونی زەویی و بوونەوەرانی سەر ڕووی نامێنێت. بەم هۆیەشەوەیە کە پێغەمبەری خودا نەمانی ئەو کەسانەی "الله، الله" دەڵێنەوە لەسەر زەویدا، بە یەك لە هەواڵهێنانی قیامەت هەژمارکردووە.

## بە شوێن گەشەکردنەوە بوون

باوەڕداران پێویستە تا دەکرێت لە ژیانی ئیمانیاندا قووڵ ببنەوە. وەگەرنا ڕەنگە لە نێو ژیانی کۆمەڵایەتیدا زەبریان بەر بکەوێت و بریندار ببن و درز و کەلێن لە بیر و هەستیاندا بێتە مەیدان. پێویستە لە ڕوانگەی هەستە ئاینییەکانمانەوە زۆر پتەو و تەندروست بین. گەر بەهۆی گوناهە گەورە و بچووکەکانمانەوە نەخزێینە کونجی ژوورەکەمان و فرمێسك نەڕژین، ئەوە لە ژیانی دڵماندا زۆر شتمان لێ ون بووە. گەر ئازاری هەڵەکانمان بۆ ڕۆژان و مانگان و ساڵان ناچێژین واتای ئەوەیە ڕۆحمان بەرگریی خۆی لەدەستداوە.

یەکێك لە نیشانەکانی دروستیی جەستە ئەوەیە لە بەرامبەر ڤایرۆس و میکرۆبە جیاجیاکانەوە پلەی گەرمیی بەرزببێتەوە گەر لەش ئەم ئاماژەی بەرگرییەی نەمێنێت، ئەوە واتای ئەوەیە حاڵی زۆر ترسناکە. ئەمە نیشانەری ئەوەیە توانای بەرگریکردنی بەرامبەر زەبرێکی زۆر کەم و بێ هێزیش نەماوە. هەر بە هەمان شێوە، گەر لە بەرامبەر سەرپێچییەکانەوە کاردانەوەیەکی دەروونی نەبێت و ویژدان بە گوناهـ "نەخێر" نەڵێت، واتای ئەوەیە ڕۆح مردووە. لەبەر ئەمەش پێویستە لەلایەکەوە لە بەرامبەر خراپە و نەرێنییەکاندا دوور لە کوشتنی ڕۆحمان کاردانەوە و خاوەن بڕیار بوونمان نیشان بدەین، لە لایەکی دیکەشەوە چاومان ببڕینە ئاسۆ دوورەکان و بەردەوام بە شوێن گەشەکردن و بەرەو پێش چوونەوە بین.

# ژیانی دڵ و ڕۆح

## خاکیبوون

مرۆڤ پێویستە خۆی بە "سیفیر" بزانێت. تەنانەت "سیفیر"یش نا، چونکە بزرۆکەی نێوان پیتەکان تۆنێکی توندی خۆنوزنیان بە "سیفیر" داوە. باوەڕداری ڕاستەقینە نابێت تەنانەت ئەو هێندەیەش نەفسی وە پێش چاوان بخات.

ئەو کەسەی وەهمی بوونی شتێك لە خۆیدا بکات خەسارەتمەندە. هەندێك ڕۆحی نەخۆش هەن کە ئەگەر وەك بەخشیش و تاقیکردنەوەی ئیلاهی هەندێك شتیان پێ نیشان بدرێت، یاخود خەونێکی باش ببینن، هەڵدەستن بە گێڕانەوە و پشك بۆ خۆدانان تێیاندا. ئەمە ڕێیەکە زۆر مەترسیدارە. لەمەش مەترسیدارتر ئەوەیە بڵێیت "بەهۆی کۆڵەواریمانەوە خوا ناوبەناو لوتفی لەم شێوەیەمان لەگەڵ دەکات." و لەم ڕێیەوە مەیل بۆ ئەنانییەت و ڕیاکاریی لە بەرگی خاکیبووندا حەشاردراو بنوێنێت. گەر کەسێك بفرێت و بڕواتە سەر لقی بەرزی دارێك، پاشان بێت و ئەمە لەملاولا بگێڕێتەوە، تێدەگەین کە ئەم کەسە خاڵی و پوچە. من بۆ هێشتنەوەی ڕێز وەها دەڵێم، وەگەر نا ئەو کەسە پوچی پوچە. چونکە دۆستانی حەق، نهێنییەکانی جەنابی حەق ئاشکرا ناکەن. ئەم جۆرە لوتفانە نهێنیگەلێکی

سەر بە ئولوهییەتن، نابێت ئاشکرا بکرێن. ئەو کەسانەش کە نهێنییەکانی خوا ئاشکرا بکەن، چیدی نهێنییان پێ نیشان نادرێت لەلایەن خواوە، هەندێك لوتف و هەندێك نهێنی ئامرازی تاقیکردنەوەن، وەك پارەیەکی وردە وەهان کە لە شوێنێکی مەترسیدار و پێویست بە بێدەنگیدا کە نابێت بهێڵێت هەستت پێ بکرێت، لە گیرفانتدا بن. جا گەر پارە وردەکانت زرِیان بێت دوژمنەکانت پێت دەزانن و لێت دەدێوێن، بۆیە بترسە لەوەی بتپێکن.

بەندە تایبەتییەکانی خوا هەرگیز خۆیان بە شت نازانن. ئەوەی لە پلەی "قطب" دایە هەمیشە بەردەمی خۆی تەمومژاوی دێتە پێش چاو. ئاسۆی لێ ڕوون نیە. هەمووان ئەو لە لوتکە بەرزە کەس پێنەگەیشتووەکاندا دەبینن، بەڵام ئەو وا گومان دەبات کە لە نێو چاڵەکاندا بێت.

با پێیەکانت هەمیشە لە زەویدا بن بۆئەوەی کە کەوتیت ئازارت پێ نەگات و هیچ شوێنێکت نەشکێت. گەر لەو دونیایەوە کە بە وەهمەکانت وا هەست دەکەیت لە بەرزاییەکانیدایت، گەر بکەویت دەکەویتە قوڵترین چاڵەکانەوە و هیچ شوێنێکت بە ساغی نامێنێتەوە. وریابە گەر پایەت ئەو شوێنە نەبێت کە بیری لێ دەکەیتەوە، کەوتنیشت ڕێ پێ نەگیراوە.

### دڵنیایی

مرۆڤ لەم دونیایەدا نابێت دڵنیایانە بژی. هەرگیز نابێت متمانە بە خۆی بکات و لە خۆی دڵنیابێت. بەندە دەبێت لە دونیادا بەردەوام بە ترسەوە "خوف" بژی. هەردەم لە ترسی پاشەڕۆژی لەرز دایبگرێت. لە هاوسەنگی ترس و ئومێددا ژیان بەسەر بەرێت و سەرئەنجامی کاریش هەر بۆ خوا جێبهێڵێت. وتنی

"من کافرم، من مونافیقم" دروست نیە. بەڵام دەبێت هەمیشە ئەم ترسە لە نێو دڵی موسوڵماندا هەبێت، وەك ئەوەی "ئایا لە مندا نیشانەی مونافیقی هەیە؟" ئەم هزرە لە لای حەزرەتی عومەری مەزنیش هەبوو، ئیدی بۆ لای ئێمە نەبێت؟! حەزرەتی عوسمان کە دەڕۆشت بۆسەر گۆڕستان هێندە دەگریا کە خەریك بوو هەناسەی بوەستێت. کاتێك نوێژ دەکەین دەبێت باوەڕمان وەها بێت کە قەبوڵ بووە. بەڵام دەبێت خەمیشمان لێی بێت و بڵێین "تۆ بڵێیت کەموکورییەك لە نوێژەکەمدا نەبێت، تۆ بڵێیت نەدرێتەوە بە چاومدا؟"

بەلای زۆرێك لە لێکۆڵەرانەوە کە ئیمامی غەزالیشیان تێدایە، مرۆڤ دەبێت ژیانی هەمیشە لە ژێر چارۆکەی "خەوف - ترس"دا ببات بەڕێوە و کاتێکیش گەیشتە لێواری مردن، دەست بە پەتی "رجا - ئومێد"ەوە بگرێت. واتە لەو ساتانەدا کە بڕیارە ڕووی بە ڕووی جیهانی دوارۆژدا بکرێتەوە، گومانی باشی بەرامبەر جەنابی حەق هەبێت و پەنا بۆ ڕەحمەتی بەرێت و لە نێو هەستی ئومێددا بڵێت "ئیدی شتێك نەماوە من بتوانم ئەنجامی بدەم. لە ئێستا بەدواوە بە تەواوی خۆم تەسلیمی ڕەحمەتی تۆ دەکەم". ئیمامی شافیعی لە سەرەمەرگدا دەیوت "جَعَلْتُ الرَّجَا لِعَفْوِكَ سُلَّمًا"، واتە "پەروەردگارا! ئومێدم کردووەتە پەیژە بۆ گەیشتن بە بەخشینی تۆ"[١].

## ئیستیقامەتی دڵ

مرۆڤ، هەموو کاتێك پێویستی بە جەنابی الله (جَلَّ جَلَالُهُ) هەیە. زیاد لە پێویستیی بۆ نیعمەتەکانی، پێویستی بە عینایەت (یارمەتی و چاکە) و ریعایەت

---

١. إمام الشافعي، ديوان؛ إبن عساكر، تاريخ دمشق ٣٣١/٥٠، ٤٣٠/٥١.

(چاودێری و پاراستن) ی ئەو هەیە. مرۆڤ کە پێویستی بە شتانێکی وەك ئاو و خواردن هەیە، لەم پێویستیە ماددیانە زیاتر پێویستی بە خۆراکێك هەیە کە ئیستیقامەتی دڵ و ڕۆحی بۆ بهێنێت. بەندەیەکی سەر ڕاست پێویستە داوای ئیستیقامەتی دڵ و ڕۆح لە پەروەردگاری خۆی بکات.

بیر و ڕەفتاری بەندە کە دەربڕی ئەوە بێت "هەرچۆنێك بێت من لەم ژینەدا هێڵی خۆمم دۆزیوەتەوە" وەك بڵێیت بە واتای ئەوە دێت لە شوێنێك بەدواوە ئیدی پێویستی بە یارمەتی خوای باڵادەست نەماوە. ئەم ڕەفتارە، هەڵەیەکە کە نابێت هەرگیز بکەوینە ناوی و سەرەنجامەکەشی ئیلحاد (دارمانی باوەڕ)ە، چونکە هەموو شتەکان لە تەواوی کاتەکاندا پێویستیان بە ئەوە. گەر مرۆڤ چەندین ساڵیش لە نێو پەرستش و گوێڕایەڵیدا بەسەربەرێت هێشتاش ڕەنگە حاڵەتێکی ئیستیقامەتبەخش لە ڕۆحیدا دروست نەکەن. ئەوەی لەسەر بەندە پێویستە ئەوەیە سەرباری هەموو شتێك دووبارە بە وتە و ڕەفتار و کرداری پەنا بەرێتە بەر جەنابی حەق و داوای ئیخلاس و ئیستیقامەتی لێ بکات. لەم بابەتەدا دەبێت زۆر سەرڕاستانە و لە دڵەوە نزاگۆو داواکار بین.

مرۆڤ گەر تەمەنی شەست حەفتا ساڵ بێت و تا ئەوکاتە ژیانێکی هێندە باشی بەسەربردبێت کە جێی حەسودی بووبێت، هێشتاش ڕەنگە نزیکی هەڵە بکەوێتەوە، بگرە ڕەنگە هەڵە بکات. هەر بۆیە مرۆڤێکی باوەڕدار دەبێت بە تەواوی بوونیەوە و تا ڕادەی دەرچوونی گیانی ڕوو لە پەروەردگار بنێت و لە بەردەمیدا بکرۆزێتەوە و بڵێت "پەروەردگارا! بۆ ساتێك لە هیدایەتی خۆتت دوورم مەخەرەوە. لە وتە و ڕەفتار و قسەکردن و جوڵەی دەست و پێ و بگرە لاسایکردنەوەکانیشمدا ڕێگەی بچوکترین هەڵەم پێ مەدە. گەر بۆ ساتێك تووشی لادان بووم یەکسەر ئەمانەتەکەشتم لێ وەربگرەوە. بۆ نموونە کەسێك قورئانی پیرۆز دەخوێنێت، بە

دڵێکی پاك و بێ ڕیاوە دەستی پێکردووە، بەڵام بۆ ساتێك بیرێکی لەم شێوە بە مێشکیدا گوزەر دەکات ''ئەگەر ئەو خەڵکەی دەرەوەش گوێیان لێبێت، شتێکی باشە''. ئا لێرەدا گەر ئەو کەسە خاوەن دڵ بێت، دەبێت قورئان خوێندنەکەی ببڕێت، بەخۆی بڵێت ''مونافق''. سەر لە زەوی بنێت و داوای لێخۆشبوون بکات. نابێ ڕێبدات درزێکی بچوك یاخود هێندەی مویەك لە ڕێ لادان دزە بکاتە نێو پەرستشەکانیەوە. چونکە پەرستش و گوێڕایەڵی تەنها بۆ خوا ئەنجام دەدرێت. پێویستە هێندەی لە دەستی دێت، بە تایبەت پەرستشەکانی دەرەوەی فەرزەکان نابێت بە هیچ کەس نیشان بدرێن و هیچ کەسیان لێ ئاگادار بکرێتەوە. گەر لە کاتی ئەنجامدانی ئەو پەرستشەدا بەشێوەیەکی سروشتی چەند کەسێك ئاگایان لێبێت و ببیستن، ئەوە زۆر بۆ بەندە گرنگ نیە، بەڵام ئەو خۆی هێشتاش دەڵێت ''خۆزگە نەیانبیستایە''. بۆئەوەی بە ئیستیقامەتەوە بژین و نەکەوینە نێو هەڵەوە، دەبێت وەك "مضطر - کەسێکی تەواو بێچارە و بێ دەرەتان" دوعا بکەین و پەنا بۆ خوا ببەین. پەرستشەکانیش دەبێت هەروەك بێ چارە و بێ دەرەتانەکان بەجێبگەیەنین، وەك ئەوەی لە "بریسکەکان"دا دەیخوێنینەوە، حەزرەتی یونس (عَلَيْهِ السَّلَام) کاتێك فڕێ دەدرێتە ناو دەریاوە ماسییەکی گەورە قووتی دەدات و لە ناوەڕاستی دەریایەکی زریاناوی تاریکدا هەر چوارلای بە نائومێدی دادەپۆشرێت. هۆکارەکان بە تەواوی دەستەمۆ دەبن. ئیدی لەو شوێنەدا کە شەو و دەریا و ماسی هەموو لە دژی دەوەستنەوە، حەزرەتی یونس پەنا دەبات بۆ ئەو زاتە تاقانەیەی هەموو ئەمانە لە ژێر فەرمانی ئەودان و دەتوانێت ڕزگاری بکات بەرەو کەناراوی سەلامەتی. ئەوەبوو لەو جێیەدا کە بە "عين اليقين" بینی جگە لە سازێنەری هۆکارەکان "مسبب الاسباب" هیچ پەناگەیەکی دیکە نیە و پەنای بۆ ئەو برد، ئیدی سیرڕی ئەحەدییەت (نهێنی یەکتایی ئەو) لە نێو نووری تەوحیدا بەدەردەکەوێت.

هەر بە هەمان شێوە بەندەیەکی سەرڕاست و دڵسۆز بە هەستی ئەوەوە کە هیچ شتێکی چواردەوری ناتوانێت ببێتە دەرمان بۆ دەردی ئەو و بە هانایەوە بێت، دەبێت ناڵەی "الله" لە دڵیەوە بجۆشێت. وتنی "الله" لەم حاڵەدا هیچ جۆرە مەبەستێکی دیکەی لە پشتەوە نابێت. ئەو مرۆڤەی ئومێدی لە هەموو شتێك بڕیوە و بە ئومێدی گوشادبوونی ڕووی لەو تاقانە دەرگایە کردووە، سیرڕی ئەم ئەحەدییەتە لە نێو نوری تەوحیددا بە ڕووی ئەویشدا دەکرێتەوە.

ئەوەتا قورئانی پیرۆز بە تەواوی مەزنیی خۆیەوە بانگەواز بۆ ئەم حەقیقەتە دەکات:

﴿ أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَآءَ ٱلْأَرْضِ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴾ (النمل: ٦٢)

واتە: "ئایا کێیە جگە لە زاتی پەروەردگار کە بێت بە هانا و هاواری لێقەوماو و بێ دەرەتان و بێ دادەوە، کاتێك نزا دەکات و لێی دەپاڕێتەوە، ئەوسا بەڵاو ناخۆشییەکان لادەبات و دەتانکاتە نیشتەجێ و جێنشین لە زەویدا، ئایا ڕەوایە لەگەڵ ئەو زاتەدا خوای تر هەبێت؟! کەمێك یاداوەری وەربگرن و تێفکرن و بیربکەنەوە."

گوزەرێك بکەن بە نێو یادەوەرییەکانتاندا، گەر بیرتان کەوتەوە کە زۆرجار کاتێك دووچاری تەنگانە و سەختی بوونەتەوە و هاوارتان کردووە "پەروەردگارا!" یەکسەر بە هاناتانەوە هاتووە و فریاتان کەوتووە، ئەوە ئێوە وەڵامی ئەم پرسیارە بە تەواوی بوونتانەوە دەدەنەوە و دەڵێن "الله".

بەڵێ مرۆڤ پێویستە بەردەوام بە خۆیدا بچێتەوە، هەڵە و کەموکورتیەکانی ببینێت و بۆ چاککردنەوەشیان لە نیەت و عەزم و هیممەتی خۆی زیاتر متمانەی

بە خوا هەبێت و خۆی بداتە دەستی ئەو و بە هیچ شێوەیەكیش بیری نەچێت كە چەندە بوونی كەسانی دی بێتە نێو كارێكەوە هێندە بیری ڕەزامەندیی خوا كەلێنی تێدەكەوێت و شەق دەبات.هەروەک چۆن پێشتر ئاماژەم پێكرد، بۆ نموونە، كەسێك بە تەنها لە باڵەخانەیەكدا خەریكی دوعاكردنە و بەدەم گریانەوە دەكڕوزێتەوە و دەڵێت "پەروەردگارا"، گەر لەم كاتەدا هەستێكی لەم شێوەیە بە خەیاڵیدا گوزەر بكات كە "ڕەنگە ئێستا كەسێك لە دەرگاوە خۆی بكات بەژووردا گوێی لە من بێت و بڵێت تەماشای ئیخلاسی ئەو پیاوە بكە!" دەبێت یەكسەر دوعاكەی ببڕێت و گریانەكەی كۆتایی پێ بهێنێت و لەجێی ئەوەی ئەو لاپەڕە پاكە پیس بكات نیوەی بە نەنوسراوی جێبهێڵێت.

مرۆڤ دەبێت چاوكراوانە و ئامادەباشانە ژیان بەسەربەرێت. هەموو بیرێكی وەك ئەوەی كە "پێم لەسەر زەویەكی پتەو داناوە و بە ئاسانی دەتوانم ڕێی بەندایەتی تەی بكەم و شەیتان كاریگەریم لێ ناكات." دەبێت بە چاوكراوەیی خۆی ڕاست بكاتەوە و بڵێت "نەخێر، شتەكان ڕەنگە بەم شێوەیە دەربكەون بەڵام هەموو ساتێك ئەگەری ئەوە هەیە خاكی ژێر پێم ڕۆبچێت، هەموو ساتێك ئەگەری ئەوە هەیە پێیەكانم هێزیان تێدا نەمێنێت، یاخود شەیتان لە شوێنێكەوە ڕێی خۆی بدۆزێتەوە و دزە بكاتە نێو هەستەكانم و پیسیان بكات". بۆ نموونە؛ هەروەك كەمێك پێش ئێستاش باسم كرد، كاتێك كەسێك لە تاریكایی شەودا لە ڕاستیدا گەر تەماشای ژیانی پێشینانمان بكەین زۆر نموونە دەبینین كە ئەم پێوەرەمان پێ نیشان دەدەن. بۆ نموونە؛ ئیبراهیمی كوڕی یەزیدی نەخەعی كاتێك قورئان دەخوێنێت لە دەرگا دەدرێت، ئەویش لەپێشدا قورئانەكە هەڵدەگرێت و دەیخاتەوە شوێنی خۆی پاشان دەڕوات دەرگاكە دەكاتەوە. كە خێزانەكەی لێی دەپرسن بۆچی وەها دەكات، لە وەڵامدا دەڵێت ئەگەر بەو شێوەیە بمبینن

وا گومان دەبەن کە هەمیشە قورئان دەخوێنم. وە دیمەنێکی لەو شێوەیە بە ڕیا قەبوڵ دەکات.

ڕەنگە بە بیردا گوزەر بکات کە هەستیاری تا ئەم ڕادەیە دەبێتە وەهم و وەسوەسە. بەڵام لەسەر باوەڕدارێکی بە ئیخلاس پێویستە کارکردن و ژیانی تەنها لە پێناو ڕەزامەندیی خوادا بێت و ئەمە بە مەسەلەی ناموسی بزانێت. مرۆڤێك کە باوەڕی بە دوارۆژ هێناوە، دەبێت تا ڕادەی گەیشتن بە وەسوەسە هەستیار بێت لە یەکلایی کردنەوەی پەرستش و گوێڕایەڵیدا بۆ خوای گەورە، دەبێت ئەمە بەلایەوە وەك مەسەلەی شەرەف و ناموس بێت. کاتێك باشترین قسە دەکات، گەر وتەیەك یاخود ڕەفتارێکی ڕیاکارانە و شیرك ئامێز تێکەڵی قسەکانی بوون، دەبێت یەکسەر قسەکانی ببڕێت. گەر تەنانەت لەو کاتەدا کە قەڵەمەکەی دێڕگەلێکی ناوازەی وەك مەزامیری حەزرەتی داود دەهۆنێتەوە، گەر پەڵەیەك بەر نیەتی بکەوێت، دەبێت هەر لەوێدا قەڵەمەکەی بشکێنێت. بەڵێ دەبێت بیشکێنێت، چونکە ئەو داخوازی ئەبەدییەتە، کەسێکیش کە داخوازی ئەبەدییەت و ژیانی هەمیشەیی بێت، دەبێت لە پێناوی ئەم ئامانجەیدا هەوڵ بدات بەدرێژایی ژیانی بیر و هەستەکانی بە پاکی و سازگاری بهێڵێتەوە.

## ئاوێنەی مرۆڤ

قەڵەمڕەویی مرۆڤ بەسەر ڕۆحیدا و زاڵ بوونی بەسەر تواناکانی ڕۆحیدا هەمیشە بە واتای بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی ئیلاهی نایەت. زاڵ بوون و دەستگرتن بەسەر تواناکانی ڕۆحدا لە ڕوانگەی مەعریفەی ئیلاهی (ناسینی خوا)وە خاوەن گرنگیە، وەگەر نا ئەو شێوەیەی یۆگیەکان ئەنجامی دەدەن لەم ڕوانگەوە سوودێکی نیە. بەرگە هەوا و گۆی زەویش هەریەکە ئاوێنەیەکن، لە

خۆیاندا بە تەواوی تەجەللی ئیلاهی دەدەنەوە. مرۆڤیش تەنها ئاوێنەی بەهەستی بوونەوەرە. ناسینی زاتی ئولوهییەت، تەنها لە ڕێگای ئاوێنەیەکی بەهەستی وەك مرۆڤەوە دەبێت. مرۆڤ ئاوێنەیەکی زۆر ڕوونە بۆ نیشاندانی ئەو بەڵام وەك لە وتەیەکدا وتراوە "لە میرئاتی ئاوێنەی موحەممەدەوە الله دەبینرێت"، هەردەم سەروەری ئەنبیا ئاوێنەی ئاوێنەکانە بۆ هەموو تەجەللیەك. ئەگەر لەو ئاوێنەیەدا تەجەللیەکان نەدرەوشانایەتەوە، هەموو شوێنێك و هەموو بوونەوەرێك لەنێو تاریکی نوتەکەچاودا دەمایەوە. خواوەند بمانگێڕێت بەو شوێنکەوتووانەی داواکاری خۆشنوودی ئەون. هەروەها هەم هیدایەت و هەم ئیستیقامەتیشمان پێ ببەخشێت.

## "قەبض و بەسط" لەگەڵ "خەوف و ڕەجا"

وەك لە کتێبی "لوتکە زومرودیەکانی دڵ"یشدا باسکراوە، لەکاتێکدا "خەوف و ڕەجا - ترس و ئومێد" هەڵوێستێکی ئیرادییە و بۆ سالیکانی ڕێی حەق وەك مەنزڵ و خاڵی دەستپێکە، "قەبض و بەسط - دەروون تەنگی و دەروون گوشادی" مامەڵەیەکی نهێنییە کە لە کۆتا سنوردا لە دەرەوەی هۆکارە ئیرادییەکانەوە ڕێ بە ڕێبواری ڕێی حەق دەگرێت یاخود باڵی پێ دەدات و بەرەو بەرزاییەکان پەروازی پێ دەکات.

گەر ترس و ئومێد بریتی بن لە کۆمەڵێك هەستی ئەندێشەئاوەر یاخود هەستگەلێکی ئومێد بەخش سەبارەت بە ڕووداوە خۆش یاخود ناخۆشەکانی داهاتوو، ئەوا دەکرێت بڵێین قەبض و بەسط حاڵەتی ڕەق بووی دڵ یاخود لێدانی پڕ تامەزرۆیی دڵن لە حاڵی ئێستادا کە لە دەرەنجامی کاریگەریی کۆمەڵێك شەپۆلی ڕەنگ و شێوە جیاوازەوە دێنەدی. نابێت ترس و ئومێد لەگەڵ قەبض

و بەسطدا تێکەڵ بکرێن. یەکێکیان دەرئەنجامی چاوەڕوانی و باوەڕی مرۆڤە. ئەوەی تریان، کاتی ئێستایە و حاڵێك کە دەکرێت لە هەموو قۆناغ و وێستگە و پلەیەکدا بەسەر بەندەدا بێت و تایبەتمەندییەکە بەردەوام پەیوەندیی بە ڕێبواری ئەم ڕێیەوە هەیە.

## جێنەهێشتنی دەرگای ئیلاهی تەنانەت لە حاڵی قەبضیشدا

کاتەکانی قەبض "دەروون تەنگی" دەکرێت درێژ یاخود کورتخایەن بن. ئەمە هەندێك جار ئاوابوونێکە کە لەگەڵ دوورکەوتنەوە لە خواوە هاتووە. گەر بەهۆی گوناهەوە بێت، دەکرێت بە تەوبە و داوای لێخۆشبوون ماوەکەی کەم بکرێتەوە. هەندێك جار کە قەبض ماوەیەکی زۆر بخایەنێت، دەبێتە هۆی نائومێدی و مرۆڤ لەم حاڵەتەدا وەك بڵێیت هیچ تروسکاییەکی ڕووناکی بەدی ناکات. جا هەرچەندە کەم یاخود زۆر بخایەنێت و لە ئاستی هۆکارەکاندا گوناه و نافەرمانیی مرۆڤ ڕۆڵیان هەبێت لە هاتنیدا، ڕاستییەك هەیە کە بەگوێرەی ئایەتی "وَاللهُ يَقْبِضُ وَيَبْسُطُ "، واتە "ئەو کەسەی کە قەبض دەهێنێت و دەشیگۆڕێت بە بەسط هەر خوایە"[1]. هاتنی قەبض و ماوەکەی و گۆڕانی بۆ بەسط هەموو لە دەستی قودرەتی خوادایە.

مرۆڤ سەرباری هەموو شتێك پێویستە هەردەم بە ڕاستگۆیانە ڕوو لە دەرگای ڕەحمەتی ئەو بنێت. هەم قەبض و هەم بەسط وەك دوو تاقیکردنەوە تەماشا بکات کە لەلایەن خواوە بۆی هاتووە و لەم کاتەشدا کە دەروونی تەنگ دەبێت و دڵی دەگیرێت هەر بەردەوام بێت لە تەقەدان لەو دەرگایە و چاوەڕوانی لەو ئاستانەیەدا.

---

١. البقرة: ٢٤٥.

## هۆشیاربوون لە قەبضدا

هەندێك جار كە دەكەونە چنگی قەبضەوە، چاوتان چەندە زۆریش بە ڕووی حەقیقەتدا كرابێتەوە و چەندە بەرزیش موشاهەدەی جیهانە باڵاكانتان كردبێت، هەمووتیان لەبیر دەچێتەوە و هیچ لە هزرتاندا نامێنێت. بەردەم و دوای خۆتان هەموو لە نێو تاریكیدا دەبینن، هەموو دیمەنە جوان و دڵ واڵاكەرەكان لە بیرتاندا دەسڕێنەوە. لێرەدا پێویستە وەفا بكەنە داردەست و بۆ گۆڕینی ئەم حاڵە بە بەسط و ئاسودەیی، سەرتان لەو ئاستانەیەدا دابنێن و بەهیچ شێوەیەك ئەو دەرگایە بەجێنەهێڵن.

پێویستە بێ ئەوەی بۆ ساتێك چاوتان لەو دەرگایە كەلای بكەن، چاوەڕێ بن. مرۆڤ بەردەوام لە نێو تاقیكردنەوەیەكی لەم شێوەیەدایە. ئەو كەسانەش كە لەم ڕێیەدا نەبن و ژیانیان لە نێو كایە پوچەكانی دونیادا بەسەر بەرن هێندە هەستیار نەبن كە بتوانن ئەم بابەتە لە یەكدی جیابكەنەوە. هەرگیز ناتوانن لەم جۆرە مامەڵەیەی نێوان مرۆڤەكان و خواش تێبگەن.

لەلایەكی دیكەوە بوونی حاڵەتی بەسط بەشێوەیەكی بەردەوام و بێ دابڕان دەكرێت مەترسیدار بێت. هەندێك جار لە دەروونندا كرانەوەیەك بەدەستدێت كە مرۆڤ مەیلی یاری كردن دەكات. ناخی پڕ دەبێت. لە هەستێكی مەعییەت (لە پەنا ئەودا بوون) كە هۆكارەكەی نادیارە و وای لێ دێت ناتوانێت لە شوێنی خۆیدا بوەستێت و جێ بەخۆی بگرێت.

من پێشنیاری تەوبە و ئیستیغفار دەكەم بۆ هاوڕێیانم گەر ئەم حاڵەتەیان لە خۆیاندا بەدی كرد. چونكە لەم جۆرە بێ ئاگاییانەدا مرۆڤ ڕەنگە بكەوێتە نێو هەڵەوە و هەموو شتێك بە هی خۆی بزانێت و وا گومان بەرێت كە سەرچاوەی كرانەوەكان لە خۆیەوە هەڵدەقوڵێت. لەكاتێكدا كە پێویستە بەندە تەنانەت لە كاتی

سەرکەوتنەکانیشیدا تەوبە بکات و هەروەك ئەو کاتانەی کە گوناهـ ئەنجام دەدات، ڕوو لە خوا بکات. بەڵێ، ڕوو لە خوا بکات تا سەرکەوتنەکانی بەهی خۆی نەزانێت و جەنابی حەق نەیانگۆڕێت بە دۆڕان و شکست.

یەکەم تایبەتمەندی کە پێویستە لە باسی ڕێگاکانی ڕزگاربوون لە قەبضدا پێشچاو بخرێت، ئەو تایبەتمەندییەیە کە لە ئایەت و فەرموودەکاندا ئاماژەی پێکراوە کە گەر پاش ئەوەی کارێکی خراپە، گوناهێك یاخود هەڵەیەك ئەنجام دەدەیت یەکسەر بەشوێنیدا کارێکی باشە ئەنجام بدەیت.. -إن شاء الله- ئەم کارە باشەیە ئەو خراپەیە دەسڕێتەوە و لەناوی دەبات.

## "قەبض و بەسط" و کەسایەتیی مرۆڤ

دەکرێت پەیوەندیی لە نێوان کەسایەتیی مرۆڤ و "قەبض و بەسط"دا هەبێت. هەندێك لە ڕۆحەکان لە قەبضەوە نزیکترن. هەندێك لە مرۆڤە هەستیارەکان تەنانەت لە بەرامبەر حاڵەتی بەسطەوە کە پێیان دەبەخشرێت دەڵێن "مەگەر من چیم کردووە وا پاداشتێکی لەم شێوەیەم پێدراوە". تەنانەت بەسطیش بۆ ئەمانە دەبێتە هۆکاری کێشەیەکی زۆر گەورە. ئەم کەسانە هەستیارییەکی زۆر قووڵیشیان بەرامبەر ڕووداوە جۆراوجۆرەکان هەیە. پێشتریش لە باسی ڕۆحە خۆپەرستەکاندا باسم کردبوو خۆپەرستەکان دەڵێن "ئاگر ئەو شوێنە دەسوتێنێت کە تێی دەکەوێت". ئەم وتەیە وتەی ڕۆحە خودبین و خۆپەرستەکانە. وتەی "ئاگر بکەوێتە هەرکوێیەك، چواردەورەکەشی دەسوتێنێت"یش گوفتاری ئەو ڕۆحانەیە کە یەکپارچە خەمخۆری کەسانی دین. گەر بێینە سەر وتەی "ئاگر بکەوێتە هەر کوێیەك، ناخی من دەسوتێنێت". ئەمە ئیدی زایەڵەی ویژدانی ڕۆحە کامڵەکانە.

بەڵێ، ئەو ڕۆحەی هەستەکانی تا ئەو ڕادەیە قوڵن کە لە هەر کوێیەکی دونیا ڕووداوێك ڕوویدات ئەو بۆخۆی واتایەکی لێ هەڵگۆزێت، زۆرجار دەکەوێتە چنگی ئاسنینی قەبضەوە و سەختی دەچێژێت. ئەو ڕووداوانەی لە دەرەوە ڕوودەدەن لە ناخی ئەودا زریان بەرپا دەکەن و بگرە کار لە بونیادی جەستەییشی دەکەن. وەك چۆن هەندێك کێشەی ڕۆحی دەبێتە هۆکاری کۆمەڵێك نەخۆشی سایکۆسۆماتیك (نەخۆشی جەستەیی بەهۆی کێشەی دەروونی و ڕۆحیەوە)، هەرواش ئەو ڕووداوە ناخۆشانەی لە شوێنە ناخۆشەکانی دونیادا دەگوزەرێن وەك نەخۆشییە سایکۆسۆماتیکەکان لەسەر جەستەی ئەو کاریگەری دادەنێن. وای لێدێت قاچی ئازار دەکات، ملی دەئێشێت، ددانی ژان دەکات... دەتوانن بەم جۆرە ناڕەحەتیانەی ئەم کەسە بڵێن نەخۆشی "دونیاسۆماتیك" یاخود "نەخۆشییە جیهانسۆماتیك"ەکانی ڕۆحە جیهاننوماکان (ئەوانەی وێنەی جیهان تیایاندا ڕەنگی داوەتەوە).

## سنورەکانی قەبض و بەسط

قەبض و بەسط دوو دراوسێی هاوسنوری یەکترن. لەو جێیەدا کە یەکێکیان تەواو دەبێت، ئەوی تریان دەست پێدەکات، خاڵی دەستپێکی ئەمیان کۆتا خاڵی ئەوی تریانە. قەبض دەکرێت کەم بخایەنێت و دەکرێت زۆر زۆریش بخایەنێت. هەندێك جار دەکرێت قەبض هێندە سەخت بێت کە تەنانەت پێغەمبەریش (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بخاتە ئەوپەڕی دڵتەنگییەوە. پەیامبەری خوا بۆ باوەڕنەهێنانی دوژنراوەکانی هێندە ناڕەحەت دەبوو کە دەکەوتە نێو شیوان و ئەم دۆڵ و ئەو دۆڵی دەکرد. هەندێکیش هەن گەر دونیا گڕی تێبەربێت، باوەشێك گیای ئەمان ناسوتێت. لەمڕۆدا دونیا پێویستی بە کەسانێکە کە هێندە هەستیار بن لەهەر کوێ

ئاگر بکەوێتەوە ناخی ئەمان بسوتێنێت. نازانم حاڵی کام منداڵە مەزڵومەی پشت کام چیایە، یاخود نێو کام دۆڵە دەبێتە پریشکێك ئاگر و دەکەوێتە ناخی مرۆڤایەتییەوە...

## چەند مروارییەک

ڕووکردنە خوا، ڕووکردنی ئەو بە ڕووی ئێمەدا لەگەڵ خۆی دەهێنێت. گەر تۆ تەماشا بکەیت تەماشات دەکرێت. گەر بتوانیت وەك ڕوانینی گوڵ بۆ خۆر تەماشای خوا بکەیت و ڕوو لەو بکەیت، دەبیتە دوێندراوی تەجەللییەکانی ئەو. ئەوەی لێرەدا بنەمای کارە، ڕوولێکردن (تەوەجووهی) تەواوی دڵە. گەر نەتوانیت ئاوازی دڵت بە بەندەگیت دەربڕیت، مەحاڵە تەجەللییەکانی ئەو بە ڕووتدا بکرێنەوە. پێویستە قیبلەنومای دڵت ڕووی لە ئەو بێت و دڵسۆزیی خۆت بۆ ئەو یەکلایی کردبێتەوە. تێگەیشتن لەمە جگەرێکی پارەپارەبوی دەوێت، وەگەرنا بێ هودەیە...

نابێت تێگەیشتنمان هەڵە بێت بۆ سودمەندبوون لە چێژە ڕێپێدراوەکان. داواکردنی هەموو ڕێ پێدراوێك نازانرێت مرۆڤ بەرەو کوێ دەبات. مرۆڤ پێویستە بترسێت لەوەی سەرەنجامی بە خراپە کۆتایی بێت. ڕەنگە هەموو چێژێکی ڕێپێدراو بۆ هەموو کەسێك گونجاو نەبێت وەك چۆن لە هەموو گوناهێکەوە ڕێیەك بەرەو کوفر هەیە، ڕەنگە لەهەموو چێژێکی ڕێپێدراویشەوە ڕێیەك بەرەو گوناه هەبێت، پێویستە چاوکراوە و وریا بین.

هەموو ڕۆژێك سوکایەتی بە "خوا" و بە "کیتاب" دەکرێت، بە ئاشکرا و پەنهان جوێن بە پێغەمبەرەکەی دەدرێت، هەندێك کەس تەنانەت تاڵە مویەکیشیان

نالەرێتەوە. بەڵام گەر کەسێك بەحاڵ دەست بۆ غرووریان بەرێت و تۆزقاڵێك بیانڕەنجێنێت، تا درەنگانی شەو خەو لە چاوانیان دەتۆرێت و چەندین ڕۆژ ناڕەحەتی دەچێژن.. بۆیە نیشانەیەکی چۆنیەتی و ئاستی پەیوەندیمان لەگەڵ پەروەردگاردا سەرچاوەی ئەو ناڕەحەتی و سەختییانەیە کە دەیانچێژین.

لە تێڕوانینی مندا، ئەوەی بتوانن وەکو "یونس ئەمرە"ی شاعیر لە یەك دوو دێڕدا زایەڵەی ناختان دەرببڕن، بەنرخترە لەوەی وەك فیردەوسی داستانێکی درێژ و ڕازاوە بهۆننەوە. بۆ باوەڕداران ئەوەی لە کوفر ترسناکتر و هاوشێوەی شیرکە "ڕیایە". گەر قسەیەك لە ناختەوە و لە قوڵترین پنتی دڵتەوە هەڵنەقوڵابوو، تکا دەکەم مەیڵێ! بێدەنگ بە! بەو هەستانەی کە لە ناخەوە هەڵنەقوڵاون، بە ئامانجی بینین و بیستنی کەسانی دی درۆ مەکە و خۆت مەخەرە ئاستی درۆزنانەوە. لە پەرستشەکانی دەرەوەی فەرزەکاندا، کاتێك سوننەت ئەنجام دەدەیت، گەر بچوکترین هەست بۆ خۆنیشاندان و بینران لەلایەن کەسانی دیکەوە لە ناختدا دەرکەوت، سەلام بدەرەوە و واز لە نوێژەکەت بهێنە! ئەوە باشترە. پێویستە وەك هەڵهاتنمان لە شەیتان، لەو ڕەفتار و گوفتارانەی بۆنی شیرکیان لێ دێت هەڵبێین. هەروەها پێویستە زۆر ڕاستگۆ و سەرڕاست بین.

## مەشیئەتی ئیلاهی و جیهانەکانی عەدەم

وشەی "مشیئة - مەشیئەت" لە بنەڕەتدا عەرەبییە. ئەم وشەیە کە "مصدر - چاوگ"ی کرداری "شاء"مە بە واتای "ویستی ئەنجامدانی کارێك" دێت. یەکێکە لە زۆرترین ئەو وشانەی لە قورئاندا هاتوون. "مەشیئەت" لەو ڕوانگەوە کە ویستی جەنابی حەقە پەیوەندیی بە بابەتی قەدەرەوە هەیە. بەهۆی ئەم پەیوەندییەشەوە ڕەهەندێکی جیاوازی قەدەر نیشان دەدات. تەواوی گۆشە ئەرێنی

و نەرێنییەکانی ژیانمان بە دیوە سودبەخش و زیانمەندەکانییانەوە بە تەواوی پەیوەستن بە ویست و مەشیئەتی خ واوە. خواوەند چی بوێت ئەوە ئەنجام دەدات. ئەو پێویستی بە پرسیارکردن لە کەس نییە بۆ ئەنجامدان یاخود ئەنجام نەدانی کارێك. خۆ ئەو فەرموودەیەش کە دەفەرموێت "گەر خوا بیەوێت شتێك ببێت دەبێت و گەر نەشیەوێت شتێك ببێت هەرگیز نایێت." دەستورێکی چەسپاوە لەم بوارەدا. خوا (جَلَّ جَلَالُهُ) ویستی لەسەر ڕوودانی هەر شتێك بێت، ئەو شتە "کەینونەت" بەدەست دەهێنێت و ڕوودەدات، هەر شتێکیش نەیەوێت ڕوویدات ئەوا ڕوونادات. لێرەدا شتێك هەیە پێویستە لێی ڕابمێنین. ئەویش پەیوەندیی مەشیئەتی جەنابی حەقە بە عەدەم و "نەبوون"ەوە. واتا خواوەند ویستی لەسەر ڕوودانی چ شتێك بێت ڕوو دەدات، ویستی لەسەر ڕوونەدانی چ شتێکیش بێت ڕوونادات. بەڵێ مەشیئەتی ئیلاهی پەیوەندی بە "بوون" و "نەبوون"ی هەموو شتێکەوە هەیە و بڕیاردەری سەرەتا و کۆتاییە تیایاندا. گەرنا وەك هەندێك دەڵێن، بیرێکی وەها کە "گەر مەشیئەتی خوایی پەیوەندی بە شتێکەوە هەبێت ڕوودەدات و پەیوەندیی و کاریگەریشی لەسەر نەبێت ڕوونادات" بیرێکی نادروستە. واتە ناکرێت و شتێك نییە بە ناوی نەبوونی پەیوەندی و کاریگەریی مەشیئەتی ئیلاهی لەسەر شتەکان. چونکە "نەبوون"یش هەر وەك "بوون" لە ژێر دەستی مەشیئەتی ئەودا هەویرەکەیان دەشێلدرێت.

گەر موعتەزیلە و جەبریە ئەم وردەکارییەی فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا تێبگەیشتنایە نەدەکەوتنە نێو ئەو گێژاوەوە کە تێیکەوتوون. چونکە لە هەردوو بارەکەدا سەروەرمان مەشیئەت بە "کەینونەت"ەوە دەبەستێتەوە. لە بواری ئیمان و هیدایەتیشدا مەشیئەت هەموو شتێکە. ئەوانەی لەم گۆشەیەوە لەم بابەتە لە پێناسەی ئیماندا وتوویانە "ئیمان، ئەو نوورەیە کە بە بەکارهێنانی ئیرادەی

مرۆڤ خوا لە ناخیدا هەڵی دەکات". تۆ هەوڵ دەدەیت و خواش ئەو نوورە لە ناختدا دروست دەکات. بەڵێ، تۆ خۆت ناتوانیت ئەو نوورە هەڵبکەیت یاخود دوای هەڵکردنی یا هەمیشە بە کراوەیی بیهێڵیتەوە. ئەو نوورە تەنها گەر خوا بیەوێت لە ناختدا دەگەشێتەوە و ڕووناکیی دەروون تەنها گەر ئەو بیەوێت بە دەست دێت. ئەو کەسانەی دەیانەوێت ببنە هۆکاری هیدایەتی کەسانی دی، دەبێت زۆر بە باشی بیر لەم تایبەتمەندییە بکەنەوە و پاش ئەنجامدانی ئەرکەکانی سەرشانیان ئەنجامی کارەکە، واتە گەشانەوەی نووری ئیمان لە دڵی دوێندراوانیاندا بۆ خوا جێبهێڵن و چاوەڕوانی ئەو بن. گەر ئەم ئەنجامەش هاتە دی هەموو شتێك بگێڕنەوە بۆ خاوەنی ڕاستەقینەیان و خۆیان بە دوور بگرن لە کەوتنە نێو شیرکەوە. بەڵێ، جارێکی تر دەبێت بیهێنمەوە یاد، کە لە جێی وتنی "گەر خوا نەیەوێت، نابێت" وتنی "گەر خوا ویستی لەسەری نەبێت، نابێت" ڕاسترە، گەر وەها بگوترێت ئەوەش دەردەبڕدرێت کە مەشیئەتی ئیلاهی بە جیهانی عەدەمیشەوە وابەستەیە و کاریگەری لەسەر هەیە. داخۆ ئەو شتانەی کە نەبوون بەهۆی ئەوەوەیە نەبوون کە هێز و ویستی ئیلاهی پەیوەندی پێیانەوە نییە و کاریگەری نییە لەسەریان؟ گەر وەها نییە، داخۆ لەو ڕوانگەوە پێیان دەڵێن "نەبوو" کە کاریگەریی هێز و ویستی ئیلاهی نەبوونیان دەخوازێت؟ لێرەدا بۆ نیشاندانی ئەم جیاوازییە پێویستە زۆر باش لە فەرمووده پیرۆزەکە تێبگەین و بەم شێوەوە وەرگێڕانی بۆ ئەنجام بدەین "ئەوەی خوا بیەوێت ببێت، دەبێت. ئەوەش نەیەوێت ببێت، نابێت"

حەزرەتی مامۆستا بەدیعوززەمانیش دەربڕینی "جیهانەکانی عەدەم" بەکار دەهێنێت. زانستی جەنابی حەق هەمەگیرە و دەوری هەموو شتێکی داوە. زانستی ئەو پەیوەندی و کاریگەری لەسەر "واجب" و "مومکین" و لە هەمان

کاتدا "عەدەم" یش هەیە[١]. هێز و ویستی جەنابی حەقیش لەسەر "مومکین" کاریگەری دادەنێت. خۆی لە خۆیدا هاتنی عەدەم بۆ نێو وجود شتێکی مومکینە. هەر بۆیە جیهانەکانی عەدەمیش بە مەیدانی کاریگەری هێز و ئیرادەی جەنابی حەق هەژمار دەکرێن. زانستی جەنابی حەق ئەزەلییە، لە هەمان کاتدا ئەبەدیشە. ئەزەل لە هەمان کاتدا بە واتای ئەبەدیش دێت. بە واتای بێ زەمانی و بێ مەکانی دێت. زانستی جەنابی حەق لە ئەزەلەوە بۆ ئەبەد بۆ هەموو شتێك لە خاڵێکی دیاریکراوەوە دەڕوانێت، هەموو شتێك لەخۆ دەگرێت و هەموو شتێکی لا زانراوە. لە کاتێکدا کە هیچ شتێك نەبووە، زانستی جەنابی حەق دووبارە زانیاری بەو نەبووانە هەبووە. کۆمەڵێك شت هەبوون کە ئەوان لە دواتردا دەهاتنە مەیدان، (ممکن الوجود) بوون. دەی خۆ لە بەرامبەر ئەمانەدا "واجب الوجود" هەبووە. واتە وەك چۆن ئەو شتانەی ئەمڕۆ دێتە مەیدان لە بازنەی کاریگەریی هێز و توانای خوا دان، ئەو شتانەش کە لە ئێستادا نین، دەکرێت لە داهاتوودا بێنە بوون، بۆیە ئەوانیش دەکرێت بێنە نێو بازنەی قودرەت (هێز) و ئیرادە (ویست) و "مەشیئەت"ەوە.

ناتوانین زۆر لە شتەکان بە عەقڵ دەرك پێبکەین. لە هەندێك بابەتدا بە شێوەیەکی گریمانەیی بیرێك دادەڕێژین. بەڵام ئەم بابەتە ڕەنگە لە خودی خۆیدا ڕاست بێت.

**پرسیار:** ئەو شتانەی بەهۆی پەیوەندی و کاریگەری "هێز" و "ئیرادە"ی ئیلاهییەوە دێنە مەیدانی بوونەوە، دەکرێت بە نەمانی ئەو پەیوەندی و کاریگەرییە توشی نەبوون ببن؟

**وەڵام:** پێویستە زۆر بە وریاییەوە دەربارەی مەشیئەتی ئیلاهی بدوێین.

١. بەدیعوززەمان، مەکتووبات (مەکتووبی پازدە).

هەندێك جار بێئاگا دەبین لەوەی قسەکانمان سەر بۆ کوێ دەکێشن. پرسیارێکی لەم شێوەیەش کە "ئایا نەمانی پەیوەندی و کاریگەریی دەستی خوا لەسەر شتەکان دەبێتە هۆی نەبوونیان؟" بە واتای ئەوە دێت کە وەك بڵێین شتێکی نەبوو بە نەمانی هۆکارەکانی سەری نامێنێت و ئەمەش تێڕوانینێکی هەڵەیە. وەك هەموو شتێکی دی لە نەمانی شتەکانیشدا هۆکاری سەرەکی "عیللەتی تاممە" کاریگەری و بڕیاری مەشیئەتی ئیلاهییە.

هۆکاری سەرەکی لە بابەتەکانی پەیوەندی بە هەڵسوکەوتی مرۆڤدا لە پەنا کاریگەریی ئیرادەی کوللی، ئیرادەی جوزئی مرۆڤەکانیشە. مەسەلەی خەڵق کردن تەنها تایبەتە بە خواوە. جیاوازی ماتوریدییەکانیش لێرەدا ئەمەیە: واتە کارێك کە خوا ویستی لەسەر بێت فەرمانی دروستبوونی دەدات. پاشان ئیرادەی مرۆڤیش پەیوەندی پێوە دەبەستێت و ئەو شتە ڕوودەدات. کە دەڵێت ڕوودەدات ناشێت وەك ڕوودانێکی زۆرەملێ و (جەبر) تێبگەین، خواوەند دروستی دەکات و لەو کارەشدا مەشیئەتی ئیلاهی بناغەیە. ئەو شتەی خوا بڵێت "ببە" دەبێت. گەر هۆکارەکان هەموو دەست بدەنە دەست یەك و هۆکاری سەرەکی بزوێنەری کارەکەش بکەوێتە گەڕ و تەجەللی بکات، گەر مەشیئەتی ئیلاهی نەبێت، خوا خواستی لە بوونی ئەو شتە نەبێت، ئەو شتە نایەتە دی. گەر وەك جەبرییەکان و موتەصەویفە جەبرییەکان بڵێن "مرۆڤ ناتوانێت هیچ شتێکی بوێت جگە لەو شتەی خوا دەیەوێت". ئەوە لە بنەڕەتدا ڕاستتان وتووە. لە ڕوانگەی بیر و باوەڕی ئێمەوە بەم شێوەیە. بەڵام سوننەتێکی ئیلاهی هەیە کە هەندێك جار شتێك کە ئێوە دەتانەوێت و خۆشی دەیەوێت، ئەنجامی دەدات. گەر نەیشیەوێت ئەنجامی نادات. بۆ نموونە کەسێك دەیەوێت خراپەیەك بەرامبەر ئێوە ئەنجام بدات، خواوەند ڕێگە بەم کارەیان نەدات. جا لەکاتێکدا ئەم کارە هۆکارێکی سەرەکی بۆ خۆی

هەیە، بەڵام ئەوە خوایە کە ڕێ بە دروستبوونی ئەم کارە نادات. واتە وتنی "گەر هۆکارەکانی جۆربن، بێگومان ئەو کارە پێکدێت" وە نیشاندانی جەنابی حەق وەك دەستەوەسانێك لەم بوارەدا هەڵە دەبێت. لە کاتێکدا مرۆڤ وەك دەستەوسان نیشان دەدەین، بێ ئەوەی هیچ ئاگامان لە خۆمان بێت لە لایەکی دیکەوە زاتی ئولوهیەت وەك ناچار بە ئەنجامدانی ئەو کارە نیشان دەدەین.

"عیللەتی تامە" بەو شتە دەوترێت کە پێویستی تەواوەتی بە بوونی مەعلوول هەیە. واتە بە بوونی خودی مەعلولل دێتە دی. بەڵام وتنی ئەوەی "عیللەتی شتێک کە خوا ناچار بە ئەنجامدانی ئەو کارە دەکات. گەر شتێک هۆکارەکان بۆی جۆربێت، جەنابی حەق ناچارە بە ئەنجامدانی." بیرکردنەوەی هەڵەی موعتەزیلەیە. باوەڕێکی لەم شێوەیە کە "گەر ئێوە هۆکارەکان بە تەواوی بگرنە بەر -حاشا- خوا ناچارە بە بەدیهێنانی دەرئەنجام" هەڵەیەکی زۆر گەورەی موعتەزیلانەیە. لە لایەکی دیکەشەوە وتنی "مرۆڤ بژاردەیەکی نییە بۆ داواکردنی شتەکان و هەر کارێک ئەنجامی دەدات بەزۆر پێی دەکرێت. مرۆڤ وەک گەڵایەکە لابەر ڕەشەبایەکدا." سەر لێ تێکچوون و لادانی جەبرییەکانە. یەکێکیان "افراط"ە و ئەوی دیکەیان "تفریط".

## گومانباشی بەرامبەر پەروەردگارمان

پێویستە هەمیشە وا بڕوانین کە خوای پەروەردگار هەموو شتێکی بە سوودی ئێمە بەرنامەڕێژی کردووە و شتەکانی بۆ ئەوە دروستکردووە تا لە ڕێیانەوە ئێمە ڕزگار بکات و بۆ خۆی ڕامان بکات و بەرە و لای خۆیمان کێش بکات. نوێژ، ڕۆژوو، حەج، زەکات، وەستانی پتەو و بێ لەرزینمان لە بەرامبەر بەڵاو چەرمەسەرییەکان، سەختی مانەوە و چاوەڕوانیکردنمان لەم ژیانەدا سەرباری

ئارەزووی ڕۆشتنمان بۆ ئەو دونیا، هەر لەبەر گوێڕایەڵی بۆ فەرمانی ئەو، بەڵێ دەبێت هەموو ئەمانە وەها ببینین کە بۆ سوودی ئێمە بەرنامەڕێژ کراون. بگرە دەبێت حاڵی خۆشمان لە بابەتی دیداری ئەودا لەسەر ئەم هێڵە ڕێك بخەین.

دەبێت بڵێین گەر بۆ قووڵتربوون و شیرینتربوونی دیدارەکانمان خواستی تۆ وەها دەفەرموێت کە "من لێرە بمێنمەوە" ئەوا من بەرگەی ئەم فیراقەت دەگرم و بە وەصلت دەڵێم "کەمێکی دیکە ڕاوەستە"، کەشی خنکێنەری ئەم دونیایە بە نیعمەت دەزانم. بەڵێ، دەبێت هەموو ئەمانە بە شتانێکی سودبەخش بۆ خۆمان لێك بدەینەوە. ئەمە گومانباشی دەبێت بەرامبەر پەروەردگاری میهرەبان.

تێگەیشتنمان بۆ فەرموودەی "بەندەکەم چۆن گومان بە من بەرێت، من بەو شێوەیەم"[١] نابێت لە چوارچێوەیەکی تەسکدا بمێنێتەوە. "من پەروەردگارێکی بەخشەرم هەیە، پەروەردگارێکی لە گوناه خۆشبووم هەیە، پەروەردگارێکم هەیە ڕێنموویم دەکات بۆ سەر ڕێگەی ڕاست" ئەمانە گومانی باشن، بەڵام لە تەواوی لاپەڕەکانی ژیانماندا ئێمە بە بناغە دانراوین لە هەموو شتێکدا ئێمە بە یەکەی کار لەسەرکردن دانراوین.

خودا ڕەنگە ئێوە بخاتە ڕەهەندییەوە، کەسێکی دی بخاتە زیندانەوە، یەکێکی دیکە بخاتە ژێر تاقیکردنەوەیەکی ترەوە، دەبێت لە هەموو بارەکاندا گومانی باش بەرین. ئەو غەددار (زاڵم و ستەمکار) نییە. حاشا ئەو ناوێکی نییە بە ناوی "غەددار"ەوە. ناوێکی نییە بە ناوی "خطار"ەوە.

ناوی "قهار"ی ئەو بۆ لەناوبردن و بەربادکردنی هەندێك لە شتەکانە. بۆ نموونە لەناوبردن و دەرەقەتهاتنی کوفر و بیرەکانی کوفر لەڕێی تەجەللی بوونی ناوی

---

١. البخاري، التوحيد ١٥، ٣٥؛ مسلم، الذكر ٢، ١٩، التوبة ١.

"قەههار"ەوە دەبێت. وەگەرنا بە شێوەیەکی گشتی خوا "رحمن و رحيم - بە سۆز و بەخشندەیە" لە بەرامبەر بەندەکانییەوە. رحمن و رحيم... لە تەسبیحاتدا چی دەڵێین "یا جمیل یا الله، یا قریب یا الله، یا مجیب یا الله..." لە شوێنێکدا دەڵێین "یا قهار یا الله" بەڵام یەکسەر بەشوێنیدا کۆتا ناو دێت، ئەو کەسەی کە دەرگای دڵەکان دەکاتەوە و فەتحیان دەکات "یا فتاح یا الله".

بەلای هەندێکەوە لە کۆتا پلەی سەیر و سلوکدا زیکری ناوی «قهار» دەکرێت. ئەم زیکر و دوعایە لێرەدا بۆ ئەوە دەکرێت تا هەموو هەست و بیرێکی ماسیوا (هەر شتێك بێجگە لە خوا) و هەموو پەیوەندییەك بە دونیاوە ببڕدرێت و لەناو بچێت. بە دەربڕینێکی دی، بۆ نەهێشتن و بەرباد بوون و پارچە پارچە بوونی بەربەست و زیکرەکانی نێوان دڵ و خوا ئەم ناوە یاد دەکرێتەوە. لە سێبەری ئەم ناوەوە زریانێك هەڵدەکات، بەڵام ئەو زریانە تۆوەکان لەگەڵ خۆی هەڵدەگرێت و دەرفەتی سەوز بوونیان فەراهەم دێنێت.

بەڵێ، زۆر گرنگە هەست بە دروستکردنی هەموو شتەکان بە خاتری ئێمە بکەین و گومانی باشمان بە پەروەردگارمان هەبێت، پێویستە ئەومان زۆر خۆشبوێت. مرۆڤ گەر شێتانە عاشقی ئەو بێت، دروستترین کار لە ژیانیدا ئەنجام دەدات. دەربارەی موسوڵمانان نەوتراوە "الضَّالِّينَ" و نەوتراوە "مَغضُوبِ عَلَيهِمْ" بەڵکو وەك ئەو کەسانە پەسند کراون کە "الَّذِينَ أَنْعَمتَ عَلَيهِمْ"[1]ن. داوامان لێکراوە ئەمە هەم وەك دوعا و داواکاری بڵێینەوە و هەم لەڕێی ئەمەوە ئامانجێکمان پێ نیشان دراوە "ئامەمان، بە هیچ شێوەیەك لە ڕێی هیدایەت لانەدەن" نزیك ئەو شتانە مەکەون کە نابێت نزیکیان بکەونەوە. دەرفەتی "اهدِنَــا الصِّرَاطَ المُستَقِيمَ۞صِرَاطَ الَّذِينَ أَنعَمتَ عَلَيهِمْ"[2]یش لە کیس مەدەن.

---

١. الفاتحة، ٧.

٢. الفاتحة، ٦-٧.

کتێبەکەی ئێمە بە "بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ" دەستپێدەکات. لە هەندێك لە ئاینەکاندا وێنایەکی زۆر ڕەق و خاوەن زەبر و تووڕە بۆ خوا دەکرێت. بەهۆی ئەوەوە کە ڕووداوەکان تەنها بە ڕووکاری دەرەوەیان هەڵدەسەنگێنرێن یاخود تەنها لە یەك ڕووەوە بۆ بابەتەکان دەڕوانرێت و لێکدانەوەی هەڵە دەکرێت بۆ شتەکان، تەنها بە زانیاری دەربارەی دیوێکی بابەتەکان ناتوانن هەڵسەنگاندن بکەن بۆ کارەکانی خوا. بۆ ئەوەی بتوانین لە هۆکاری شتەکان و چۆنیەتیی تەجەللی کردنی دادپەروەری ئیلاهی تیایاندا و ویستی ئیلاهی لەسەریان تێبگەین دەبێت ڕووداوەکان هەموو بەیەکەوە لەبەرچاو بگرین و لێکدانەوەیان بۆ بکەین.

## گومانی باش بردن و پەنا بردن بۆ ڕەحمەتی ئەو

پرسیار: مامۆستا، ڕەنگە کەسێك لە ئەسفەلی سافیلیندا بێت، بەڵام کەسانی دی ئەو کەسە لە ئەعلای عیللییندا ببینن. ئایا لەم بوارەدا مامەڵەی جەنابی حەق بە گوێرەی گومانی باشی مرۆڤەکان دەبێت؟

وەڵام: دەشێت جەنابی حەق گومانە باشەکانی مرۆڤەکان وەك دوعایەك قەبوڵ بکات. ئەوەتا پێغەمبەری سەروەرمان (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) مژدەی ئەوەی داوە کە ئەو کەسەی چل (تەنانەت لە ڕیوایەتێکدا سێ)[1] پیاوی بۆ خوا صوڵحاو بەشداری لە ناشتنیدا بکەن دەڕواتە بەهەشتەوە. واتە شایەتی باشی ئەو کەسانە بۆ ئەو کەسە دەبێتە شەفاعەتکار و دەیباتە بەهەشتەوە.[2]

لەگەڵ ئەمەشدا پەنا بردن بۆ ڕەحمەتی خوا و وتنی "هەر دەرگای تۆ شك دەبەم" زۆر گرنگە. ئەوە نییە بەسەرهاتێك دەگێردرێتەوە کە زاتێك کۆمەڵێکی زۆر قوتابی دەبێت و خەریکی پێگەیاندنیان دەبێت. قوتابییەکان پاش ماوەیەك کە

---

١. الترمذي، الجنائز ٤٠؛ أبو داود، الجنائز ٣٨.

٢. مسلم، الجنائز ٥٩؛ أبو داود، الجنائز ٤٠؛ أحمد بن حنبل، المسند ١/٢٧٧.

ئاسۆی بەرچاویان دەکرێتەوە دەبینن کە مامۆستاکەیان لە قوطبی "شەقاوەت-خراپەکاریدا" ناوی تۆمارکراوە. ئیدی هێواش هێواش لێی دووردەکەونەوە و بەجێی دەهێڵن. تەنها یەك موریدی گیان پڕ لە وەفا لە لای دەمێنێتەوە. بیر دەکاتەوە "باشە مامۆستا هیچ شتێکی پێچەوانەی لەگەڵ ئایندا هەیە؟" هیچ شتێکی پێچەوانە لەم زاتەدا کە بەوپەڕی ڕێکوپێکی فەرمانەکانی ئاین جێبەجێ دەکات و لە ژێر چەتری نبووەتدا هەڵسوکەوت دەکات، نابینێت. بۆیە سەرباری ئەوەی هەمووان بەجێیدەهێڵن ئەم لەلای مامۆستاکەی دەمێنێتەوە ڕۆژێك ئەم دۆستی حەقە دەپرسێت "ئەوە هاوڕێکانت بۆ ڕۆیشتن و تۆ بۆ نەڕۆیشتوویت؟" پاش ئەوەی پێداگری زۆری لەگەڵدا دەکات قوتابییە بە وەفاکەی وەڵامی دەداتەوە "قوربان، ئەوان بەهۆی ئەو شتانەوە کە دەربارەی ئێوە بینییان و لەبەر ئەوەی لە تۆماری ژیانی بەرزەخدا بە "شەقی" ناوتان تۆمار کرابوو وایان بە باش زانی کە بەجێتبهێڵن". بەڵام من لە لای ئێوە چاوم بە ڕووی حەقیقەتدا هەڵهێنابوو، نەمدەتوانی بێوەفاییتان بەرامبەر بکەم. جەنابی شێخ لە وەڵامدا پێیدەڵێت "کوڕم من چل ساڵە ئەو ن وسراوە بەو شێوەیە دەبینم، بەڵام ئایا دەرگایەکی دیکە هەیە پێمی نیشان بدەیت تا ڕوو لەوێ بکەم؟" پاش ئەم قسەیە ئیدی نوسراوی "شەقی" دەسڕێتەوە و دەگۆڕێت بە "سعید - بەختەوەر"

بۆیە نابێت دیوی تاقی کردنەوە لەم بابەتەدا پشتگوێ بخەین. ئێوە سەرتان لەو پێش دەرگایە دادانێن و ڕەنگە بۆ ماوەی چل ساڵیش چاوەڕێ بکەن بەڵام هێشتاش قەبوڵ نەکرێن. کەسێك گەر نوێژیش بکات و ڕۆژووش بگرێت و هەزار و یەك پەرستش و بەندایەتیش بەجێبهێنێت، هێشتا بە ڕەحمەت و بەخشندەیی خوا دەتوانێت بەهەشت بەدەست بهێنێت. گەر ئەو بیەوێت هەموو مرۆڤایەتی دەخاتە دۆزەخەوە و کەسیش ناتوانێت هیچ شتێك بڵێت. موڵکی خۆیەتی و هەرچۆنێکی

بوێت وەهای لێدەکات. ئەو زاتە بە لەبەرچاوگرتنی ئەم شتانە بۆ ساتێکیش سەری لەسەر ئەو ئاستانەیە بەرز ناکاتەوە و بەردەوام بە وەفاوە دەجولێتەوە. خوا لە کەسێتی ئەم زاتەدا وێنەیەکی باڵامان نیشاندەدات تا بە نموونەی وەربگرین. چل ساڵ دەستی دوعای لە خزمەتی پەروەردگاریدا کراوە بووە و جگە لەو دەرگایە ڕێی دەرگایەکی دیکەی شك نەبردووە تا لە سەرەنجامدا بووەتە پاڵەوانی وەفادارێتی.

بەڵێ، ئەم وەفایە زۆر گرنگە. هەندێك جار وتەیەك، ڕەفتارێك، هەڵسوکەوتێك لە لای حەق زۆر بە گەورە دادەنرێت. نازانین بە دەربڕینی خەڵکی ئەرزەڕۆم "خوای بەهانە" بە چ بەهانەیەك لە کێ خۆشدەبێت. ئەوەی لەسەر ئێمەیە ئەوەیە بەوپەڕی ڕاستگۆییەوە وابەستە بە ئەو ژیانمان بەسەربەرین. دەبێت هەم لە ناخماندا و هەم لە هەموو دەرفەتێکیشدا دووبارەی بکەینەوە "کە بێ هەموو شتێك دەتوانین، بەڵام بێ ئەو ناتوانین".

پێشتر کاتێك دەربارەی بریسکەی حەڤدەهەممان دەخوێندەوە باسم کردبوو، مامۆستاش هەمان شت دەڵێتەوە "جگە لە دەرگای تۆ دەرگایەك نییە کە پەنای پێ ببرێت" ئەمە وتەیەکی گشتییە. ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەمیش هەمان ئاوازی هۆنیوەتەوە لە شیعرە بەناوبانگەکەیدا:

| | |
|---|---|
| هَجَرْتُ الْخَلْقَ طُرًّا فِي هَوَاكَا | وازم لە خەڵك هێنا بە ئارەزووی تۆ |
| وَأَيْتَمْتُ الْعِيَالَ لِكَيْ أَرَاكَا | منداڵم هەتیو خست بۆ دیتنی تۆ |
| وَلَوْ قَطَّعْتَنِي فِي الْحُبِّ إِرْبًا | گەر لەم ئەوینەدا پارچە پارچەم بکەیت |
| لَمَا حَنَّ الْفُؤَادُ إِلَى سِوَاكَا | دڵ مەیل ناکات بۆ کەس غەیری تۆ |
| تَجَاوَزْ عَنْ ضَعِيفٍ قَدْ أَتَاكَا | لە لاوازێك خۆشبە کە پەنای هێناوە بۆ تۆ |
| وَجَاءَ رَاجِيًا يَرْجُو نِدَاكَا | تکاکارانە هاتووە و دەکات بانگی تۆ |

| | |
|---|---|
| وَإِنْ يَكُ يَا مُهَيْمِنُ قَدْ عَصَاكَا | گەرچی ئەی موهەیمین کردوویە سەرپێچی تۆ |
| فَلَمْ يَسْجُدْ لِمَعْبُودٍ سِوَاكَا | بەڵام سوجدەی نەبردووە بۆ کەس غەیری تۆ |
| إِلٰهِي عَبْدُكَ الْعَاصِي أَتَاكَا | ئیلاهی بەندەی سەرپێچیکارت هاتووە بۆ لای تۆ |
| مُقِرًّا بِالذُّنُوبِ وَقَدْ دَعَاكَا | دانی بە گوناهی ناوە و دەیکات دوعای تۆ |
| فَإِنْ تَغْفِرْ فَأَنْتَ أَهْلٌ لِذَاكَا | گەر لێی خۆشبییت ئەهلی ئەویت تۆ |
| فَإِنْ تَطْرُدْ فَمَنْ يَرْحَمْ سِوَاكَا | گەر دەریکەیت کێ بێ ڕەحم بکات غەیری تۆ |

بەڵێ، دەڵێت "هەرچەندە تەواوی ژیانم بە تاوانیشەوە گوزەرابێت، بەڵام سوجدەم بۆ کەس نەبردووە جگە لە تۆ." ئەم هەستە لەباری ئیلاهیدا زۆر پێگەی مەزنە. لەم هەستەدا توانەوە بەدی دەکرێت. قەبوڵ کردنی سەرپێچییەکان بەدی دەکرێت. بینینی بچوکترین لادانەکان وەك گەورەترین لارێ بوون و مەزنترین ڕوخێنەر بۆ دونیای خۆی. بەڵام لە هەمان کاتدا پەنا بردنە بەر ڕەحمەتی فراوانی خواش بەدی دەکرێت.

## ئاست

سەبارەت بە نەسخ بوونەوە و هەڵگیرانی حوکمی ئایەتی "لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَإِنْ تُبْدُوا مَا فِي أَنْفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُمْ بِهِ اللَّهُ فَيَغْفِرُ لِمَنْ يَشَاءُ وَيُعَذِّبُ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ" بە واتای "هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لە زەویدا هەیە هەر خوا خاوەنیانە و ئەگەر ئەوەی لە دڵ و دەروونتاندا جێگیر بووە، دەری بخەن، یان بیشارنەوە خوا دەربارەی لێتان دەپرسێتەوە، ئەوسا لە هەر کەس بیەوێت خۆش دەبێت و هەرکەس بیەوێت سزای دەدات و خوایش بەسەر هەموو

شتێکدا دەسەڵاتی هەیە"[١]، کۆمەڵێك ڕیوایەت هەیە. کاتێك بە شێوەیەکی گشتی بیری لێبکەینەوە، دەبینین کە ئەمە پەیوەندی بە ئاستی کەسەکانەوە هەیە. هەندێك مرۆڤ ڕەنگە بۆ گوزەرکردنی شتێك بە ناخیاندا بەرپرسیار بن. بەڵام ئەو کەسەی لە ئاستێکی بەرز و دیاریکراودا پەیوەندیی لەگەڵ پەروەردگاردا هەیە، ئەو کەسەی بڕیاری داوە هیچ خەیاڵێك جگە لە خەیاڵی ئەو بە دڵیدا گوزەر نەکات، گەر بیرێکی خراپ بە سوچی خەیاڵیدا بێت بەهۆی ئەوەی کە هزری پیس کردووە، ڕەنگە بکێشرێتە بەر لێپرسینەوە. موحاسیبی لە کتێبی "الرعاية لحكم الله" دا ئەم بابەتە بۆ هەشت ئاست جیا دەکاتەوە. لای ئیمامی غەزالیش شتێکی هاوشێوە هەیە. بە پوختی ئەمە بابەتێکە پەیوەستە بە ئاستەوە.

پەیوەندیمان لەگەڵ پەروەردگارمان لە چ ئاستێکدا بێت، حاڵ و ڕەفتار و کردار وبگرە بیرکردنەوەکانیشمان بە گوێرەی ئەو ئاستە مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێت. بۆ هەندێك لە بەندە تایبەتییەکانی خوا تەنانەت بیرێکی ناجۆریش کە بە هزریاندا گوزەر دەکات، بە بێ ڕێزی بەرامبەر خوا دێتە هەژماردن. تەنانەت هەندێك لە سوارچاکانی ئاستبەرزی ئەم ڕێیە، پەرژین بێت، خۆ کردنەوە و زۆر دەرکەوتنی نێو سەرئاویشیان بەلاوە پێچەوانەی شەرمکردن بووە. ئەبو موسای ئەشعەری دەڵێت "کاتێك لە تاریکی شەودا خۆم دەشۆرد، شەرمم دەکرد لەوەی پشتم ڕێك بکەمەوە و لە ترسی ئەوەی شوێنێکم دەرکەوێت خەریك بوو دەچووم بە ناخی زەویدا."[٢]

بەڵێ، ئەمانە پەیوەستن بە ئاستەوە. ئەگەر بەندەیەك لە ئاستێکدا بە پێویستی بزانێت بەم شێوەیە ڕەفتار بکات، پەیوەندی لەگەڵ پەروەردگاردا لەم ئاستەدا بێت،

١. البقرة: ٢٨٤.

٢. إبن أبي شيبة، المصنف ١/١٠٠؛ أبو نعيم، حلية الأولياء ١/٢٦٠.

ناکرێت هەڵسوکەوتەکانی لەو ئاستە بهێنێتە خوارەوە. بۆ نموونە گەر کەسێك بکەن بە بەرپرسی سەربازی و ئەو بڵێت "من بەرپرسیارێتی هەڵناگرم و وەك کەسێکی ئاسایی دەمێنمەوە" ئەوا پلەکەی لە پلەی کەسێکی ئاساییش زیاتر دادەبەزێنرێت. جەنابی الله (جَلَّ جَلَالُهُ) بەندەی لە چ ئاستێکدا دانابێت، پێویستە ئەو بەندەیە بە گوێرەی ئەو ئاستە مامەڵە بکات. لەبەر ئەوەیە مامۆستاش لە شوێنێکدا دەڵێت "گەر لە قەڵای ئیخلاسەوە بکەونە خوارەوە، ئەگەری هەیە بکەونە نێو چاڵێکی قوڵەوە"[١]. واتە لەسەر زەوی خۆتان ناگرنەوە "بحسب المغنم المغرم" ئەو دەسکەوتەی بە دەستی دەهێنیت، بە گوێرەی ئەو سەختی و مەترسییانەی ڕووبەڕووی دەبیتەوە زیاد یاخود کەم دەکات.

واتە گەر مرۆڤ بە لوتف و چاکەی خوا بەرز کرابێتەوە بۆ خاڵێکی دیاریکراو و پاشان مافی ئەو شوێنە نەدات کە تێیدایە، ئەوا ناکەوێتە ئاستی کەسانی سادە، بەڵکو دەکەوێتە شیوێکی زۆر قوڵترەوە.

بۆ نموونە کەسی وا هەیە گەر بیرێکی لەم شێوەیە بە خەیاڵیدا گوزەر بکات کە "تا ئێستا خزمەتێکی زۆری گەل و نیشتیمانم کردووە و هەوڵم داوە و زۆر سەختیم چەشتووە، داخۆ گەر واز بهێنم..." تەنها گوزەرکردنی بیرێکی لەم شێوەیە، نەك وتنی بە دەم، بگرە تەنها بە گۆشەیەکی خەیاڵدا گوزەرکردن بۆ ئەو کەسە نشوستێکی زۆر گەورە دەبێت. بۆیە پێویستە ڕەفتارەکانی بە گوێرەی ئەمە ڕێکبخات. بەڵام لەولاوە کەسێك کە هێشتا لەبەر دەرگاکەدایە، لە دالانەکەدایە، بگرە لە واتای خەباتکردن بۆ نیشتیمان و هەوڵدان بۆ سودگەیاندن بە گەل و ژیان لە پێناوی کەسانی دیش تێناگات، بۆیە لەبەر ئەم جۆرە خەیاڵ و بیرانەش لێپرسینەوەی لەگەڵدا ناکرێت. بە گوێرەی ئاستەکەت لە بەردەم دەرگاکەدا نیت، لە

---

١. بەدیعوززەمان، بریسکەکان (بریسکەی بیست و یەك، دەستووری چوارەم).

دالآنەکەشدا نیت، لە ژووری میوانیشدا نیت، بەڵکو لەنێو حەرەم و لە پەنا سەرینی سوڵتان دایت، سوڵتانیش بە گوێرەی ئەو ئاستە مامەڵەت لەگەڵدا دەکات. "قرب سلطان اتش سوزان بود" واتە "نزیکی لە سوڵتان ئاگری سۆزانە". ڕەنگە ئەوەش بە بیردا بێت "پەیوەندی لەگەڵ پەروەردگار لە ئاستێکی بەرزدا ترسناکە، بۆیە با پەیوەندییەکەم لە ئاستێکی نزمدا بهێڵمەوە" ئەمە شتێك نیە لە دەستی مرۆڤدا بێت گەر دڵ بە مەعریفەت ئاو بدرێت، بخوێنێتەوە و ڕابمێنێت، ئاسۆی زانست و عیرفانی فراوان بکات، قووڵ بێتەوە لە بابەتەکاندا، باش پەروەردگاری بناسێت، ئیدی لە دەستی خۆیدا نامێنێت. ئیدی لەم حاڵەدا دەرفەتی بەرزبوونەوە و هاتنە خوارەوە بەو کەسە نادرێت.

پوختەی قسە: بە ئیلهام وەرگرتن لە کتێبەکەی "موحاسیبی" دەتوانین بڵێین "الرعاية لحقوق الله على سوية الناس" واتە "ڕەچاوکردنی مافەکانی خوا بە گوێرەی ئاستی مرۆڤەکانە".

## ئارەزووی ڕوممان

لە وتار و ئامۆژگارییەکاندا بەسەرهاتێك دەگێردرێتەوە: لە چلەخانەیەکدا دەروێشگەل ڕۆژگاریان بە پەرستشەوە بەسەر دەبرد. ئەربەعینێك، دوو ئەربەعین، سێ ئەربەعین... دەستووری ئەوێیە. هێندەی ئەوەی نەمریت، بخۆیت و بخۆیتەوە، تەنها خەریکی پەرستش و بەندایەتی بیت و هێندەی دەکرێت نەڕۆیتە دەرەوە. دەست و پێ، چاو و گوێ، زمان و لێو تەنها بە پەرستشەوە سەرگەرم دەکرێن، خەویش کەم دەکرێتەوە. لەڕۆژێکدا تەنها هێندەی کاتژمێرێك سەر دەنرێتەوە بۆ پشوودان، هەر هێندەی پێویستیی خەو نەمێنێت، بێگومان بەهۆی ئەوەی زۆر ناخۆن و ناخۆنەوە بە شێوەیەکی ئاسایی خەویشیان کەمە.

له ناخی یەکێك له ئەهلی چلەخانەدا ئارەزووی ڕوممان (هەنار) دروست دەبێت، هەرچی دەکات ئەم ئارەزووەی بۆ کەنار ناخرێت. له بناغەدا هەنار، خوا له نارەکەی تری (دۆزەخەکەی) بمانپارێزێت، میوەیەکی خۆشتامە بەڵام تا ئەو ئاستەش نییە که دڵ بەخواداوێك خانەی لەگەڵ ئەودا بوونی بۆ جێبهێڵیت. بێگومان دەتوانین له شوێنی هەنار بیر له شتانی دیکەش بکەینەوە. ئەم پیاوە هەڵدەستێت بڕواتە دەرەوە بۆ هەنار خواردن، دەرگاکە دەکاتەوە و خەریکە بڕواتە دەرەوە که پیاوێك دەبینێت له لای دەرگاکەوە بێ هێز و تین کەوتووە و هەر هێندەی نیوە گیانێکی تێدا ماوە. نیوە گیانێکی تێدا ماوە بەڵام له حاڵی خۆی زۆر ئاسوودە و سوپاسگوزارە و له ڕوخسارییەوە خۆشحاڵی دەبارێت و هەر "الحمدالله" دەڵێتەوە. پیاوەکەش که باسمان کرد لێی دەپرسێت "باشە بەم حاڵەتەوە ئەم هەموو سوپاس و ستایشەت له چی؟" وڵامی دەداتەوە و دەڵێت "سوپاس بۆ خوا هەرگیز بۆ ئارەزووی ڕوممان ڕەحمانم جێنەهێشتووە و له حضوری دوور نەکەوتوومەتەوە" دەروێشەکە که ئەمە دەبیستێت دێتەوە سەرخۆی و دووبارە دەگەڕێتەوە بۆ چلەخانەکە.

داخۆ چەند جار ئارەزووی ڕوممان بە شوێن خۆی خستووین؟!! کامڵ بوون ئاسان نییە. خوا مرۆڤی بە توانایییەکانییەوە دروست کردووە، بوونە مرۆڤی ڕاستەقینەشی بەستووتەوە بە ویست و هەوڵ و هیممەت و عەزمی مرۆڤەکانەوە، مرۆڤە بێ عەزمەکان، بەندە ئارام نەگرەکان، ناتوانن بگەنە ئەم ئامانجە.

## واز له دونیا هێنان له دڵدایە، نەک له دەستخستندا

پێناسەی زوهد بریتییە له واز هێنان له دونیا له دڵدا، نەك له دەستخستندا. پێوەری ئەمەش بەوە دەبێت که بۆ له دەستچوونی دونیا خەمبار نەبیت و له کاتی دەستخستنییشیدا خۆشحاڵ نەبیت .

## ڕۆزی لە دەستی خوادایە

لە بەسەرهاتێکدا دەگێڕنەوە: حەزرەتی سولەیمان پرسیار دەکات کە مێروولەیەك بەدرێژایی ساڵ چی دەخوات. پێی دەڵێن "دەنکە گەنمێك" ئەویش بۆ تاقیکردنەوە مێروولەیەك دەخاتە نێو دەفرێکەوە، دەنکە گەنمێکیشی بۆ تێدەکات و سەرەکەی دادەخات. پاش ساڵێك کە سەری قوتووەکە هەڵدەداتەوە دەبینێت مێروولەکە تەنها نیوەی گەنمەکەی خواردووە. لێی دەپرسێت "مەگەر تۆ لە ساڵێکدا دەنکێك گەنمت نەدەخوارد؟" لە وەڵامدا مێروولەکە پێی دەڵێت "ئەی سولەیمان! ئەوە کاتێك بوو کە خوای بەخشندە و ڕۆزیدەر ڕۆزیمی دەدا، بەڵام کاتێك وای لێهات ڕۆزییەکەم بەهۆی تۆوە بگاتە دەستم، ئیدی دڵنیا نەبووم تۆ لە داهاتوودا چی دەکەیت، بیرم کردەوە و وتم ئەی ئەگەر منی لەبیر بچێت؟. کە تۆ ڕەنگە لەبیرت بچێت، بەڵام پەروەردگارم هەرگیز هیچ یەکێك لە دروست کراوەکانی بیر ناچێت. لەبەر ئەم هۆیە منیش بە وریاییەوە مامەڵەم کرد و پاشەکەوتم لە ڕۆزییەکەم کرد".

## گۆزەی شکاو

حەزرەتی مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی داستانێك دەگێڕێتەوە: سەردەمانێك سوڵتانێك ژیاوە، خەڵکی ئەو سەردەمەش زۆریان خۆشویستووە کە زانیویانە ئەم سوڵتانە نەك تەنها حوکمی زەوی بەڵکو حوکمی دڵانیش دەکات. خەڵکەکە هەموو ئارەزووی ئەوەیان هەبووە کە لە لایەن ئەم کەسە باشەوە بناسرێن و خۆش بویسترێن، بۆیە هەندێك لە ڕۆژەکان دەڕۆشتنە بەغداد بۆ خزمەتی سوڵتان و دیارییان پێ دەبەخشی.

لە کاتێکدا دەوڵەمەند و دەست ڕۆیشتووەکان دیاری بەنرخیان پێشکەش بە

سوڵتان دەکرد، ڕۆژێکیان هەژارێك، بیردەکاتەوە کە دیارییەکی شایان بە سوڵتان بدۆزێتەوە و بۆی ببات. کاتێك هیچ شتێکی بەنرخ نادۆزێتەوە، گۆزەکەی ماڵی خۆیان کە لایەکی شکاو دەبێت، دەکەوێتەوە بیری. دەڕوات لە کانیاوی سازگاری بەفرئاسای دێیەکەیان پڕ لە ئاو دەکات و بەڕێدەکەوێت. پاش کەمێك لە ڕێگە بە کەسێك دەگات، پرسیاری لێ دەکات چی دەکات و بۆ کوێ دەڕوات. پیاوە هەژارەکە نیازەکەی پێ دەڵێت، ئەویش بەشێوەیەکی گاڵتە ئامێز پێی دەڵێت "مەگەر نازانیت سوڵتان لەسەر سەرچاوەی ئاوەکە دانیشتووە؟ هەروەها ئەو کانیاوەی ئێوەش هەر هی خۆیەتی؟" پیاوە هەژارەکە سوور دەبێتەوە، تفی بۆ قوت ناچێت و وشەکان لە گەروویدا گیردەکەن، بەڵام دەڵێت "با وەهاش بێت، لە سوڵتان سوڵتانی و لەگەداش گەدایی دەوەشێتەوە. گەر دیارییەکی تایبەتیشم بۆ سوڵتان نەبێت. دڵێکی هێندە تامەزرۆ و لە خۆشەویستی ئەو پڕم هەیە کە ئاوەکەی خۆی پێشکەش دەکەمەوە". بە گۆزە شکاوەکەیەوە دەچێتە خزمەتی سوڵتان، سوڵتانیش بەشێوەیەکی شایان بە سوڵتانییەکەی مامەڵەی لەگەڵ دەکات و بەخشندەیی خۆی لەگەڵ دەنوێنێت، وە کاتێکیش دەگەڕێتەوە فەرمان دەکات و دەڵێت "بە هەرچییەکەوە هاتووەتە لای ئێمە گرنگ نییە، وە بە دەستی خاڵی مەیگێڕنەوە و گۆزەکەی بۆ پڕ بکەن لە ئاڵتوون".

مەولانا زۆر جوان لەم جۆرە بابەتانە ورد بووەتەوە و هەڵیسەنگاندوون. لە ڕێی گێڕانەوەی ئەم بەسەرهاتانەوە پێمان دەڵێت " ئەگەر چی سەرمایەکەمان بێ نرخ بێت، بەڵام ئەم دەرگایەی ڕوومان تێکردووە دەرگای خوایە".

هاوڕێیانی ئێمەش هەر بەم تێبینییەوە ناوی «گۆزەی شکاو»یان لە پەڕەکانی ئینتەرنێت داناوە[1]، حەزرەتی بەدیعوززەمانیش لە وتەی بیست و چواردا

۱. مەبەست لەو ڕوویەڕانەی ئینتەرنێتە کە هەفتانە وتاری نوێی مامۆستا فەتحوڵڵای تێدا بڵاو دەکرێتەوە.

کاتێك باسی"نیەتی هەمەکی" دەکات دەڵێت "بۆ نموونە، وەك کاتێك پیاوێك بە دیارییەکی کەمنرخی پێنج قرووشیەوە دەڕواتە خزمەت پادشا. دەبینێت لەوێ چەندین دیاری لە لایەن چەندین کەسی بەرزو پەسەندکراوەوە کە نرخیان دەگاتە ملیۆنان ڕیزکراون. بەدڵیدا گوزەردەکات و دەڵێت "دیارییەکەی من هیچ نییە، چی بکەم؟". پاشان ڕوودەکاتە پادشاو دەڵێت "ئەی گەورەم هەموو ئەودیارییە بەنرخانەت بە ناوی خۆمەوە پێشکەش دەکەم، چونکە تۆ شایەنی ئەوانەیت. ئەگەر دەستم بڕۆشتایە هێندەی ئەمانە دیاریم پێشکەش دەکردیت" واتە دەڵێت "ئەی پادشای پادشاکان! ئەی سوڵتانی سوڵتانەکان! ئەم خەڵکە ئەم دیارییە بەنرخانەیان بۆ تۆ هێناوە، منیش هەر ئەمەم لە دەستدایە. ئەگەر لە دەستم بهاتایە و بۆم بهێنرایە، دیارییەکم پێشکەش دەکردیت، هێندەی تەواوی ئەم دیارییانە نرخی ببوایە".

بەڵێ، لەم بابەتەدا نیەت زۆر گرنگە. چونکە نیەت قوڵی ڕاستەقینەی پەرستش و گوێڕایەڵی مرۆڤ پێکدەهێنێت. پەرستش و گوێڕایەڵی کارێك، ڕەفتارێك، جوڵەیەکە لە پێناو خوادا، قوڵیە ڕاستەقینەکەشی لە نیەتی مرۆڤ و دڵسۆزانە ئەنجامدانیدا خۆی دەبینێتەوە. لەگەڵ ئەمەدا پێویستە بەندە هەرگیز ئەوەی ئەنجامی دەدات بە زۆری نەزانێت و نەکەوێتە ئەو غەفڵەتەوە وا بزانێت ئەوەی کردوویەتی بەسە، بەڵکو بنەمای کار ئەوەیە، ئەوەی کردوویەتی بە کەمی بزانێت و هەوڵ بدات زیاتر و زیاتر ئەنجام بدات، بەڵێ بە کەس ناڵێین "هەزار ڕکات نوێژ بکەن" بەڵام گەر کەسێك بێت و بڵێت "هەزار ڕکات نوێژ دەکەم ئێوە پێتان چۆنە"، من پێی دەڵێم "گەر لە دەستت دێت هەزار ڕکاتی تری بۆ زیاد بکە و دوو هەزار ڕکات نوێژ بکە".

گەر ئەمە نەڵێم ڕەنگە لە بەر ئەم هۆیە بێت کە پێغەمبەری خوا فەرموویەتی:

"ئاین بە تەواوی لەسەر ئاسانکاری بونیادنراوە. گەر سەختی بکەن و وەهای لێبکەن کە نەتوانرێت بە ئەنجام بگەیەنرێت لە ژێریدا دەکەون و ئەو کەسانەش لە ئاینەکە دوور دەخەنەوە کە داخوازیەکانی ئاین بە جێ دەگەیەنن. منیش بۆ ئەوەی نەکەومە هەڵەیەکی سەختکارانەی لەم شێوەیەوە ناڵێم "زیاتر نوێژ بکە". بەڵام گەر ئەو کەسە لە ڕوانگەی مافی پەروەردگار بەسەرمانەوە ئەم پرسیارەم لێ بکات، پێویستە نەک هەزار بەڵکو سێ هەزار ڕکات نوێژیش بکات، پێویستە بڵێم "زیاتر نوێژ بکە".

ئەبو هورەیرە لە ڕۆژێکدا دوانزە هەزار جار دەیوت "سبحان الله" لە هۆکارەکەیان دەپرسی، لە وەڵامدا دەی وت "زۆرم نەوتووە، هەر هێندەی ژمارەی گوناهەکانمە". دەکرێت بپرسن "مەگەر گوناهی چی بوو؟" دەکرێت بە بیرتاندا گوزەر بکات،"داخۆ چی ئەنجامدەدا؟" بەڵام من باوەڕم نییە ئەو شتێکی ئەنجام دابێت. کە لە سوففە دەمایەوە، خۆی بۆ پێغەمبەری خوا تەرخانکردبوو، لە ماوەی سێ ساڵدا زانستێکی بەدەستهێنا کە بە بیست ساڵ بەدەست ناهێنرێت، هەر بەو ماوە کەمە هاتە ئاستی هاوەڵە زاناکانەوە. من ئەگەر بۆ گوناه ئەنجامدانی کەسێك دانانێم کە هاوەڵەکانیشی گەواهی ئەومیان بۆ داوە جگە لە لوتف و چاکەیەك لە خواوە بۆی هاتبێت بە ڕووی هەموو شتێکی دونیایدا داخراوبووە.

ئەگەری هەیە وەك کەمێك پێش ئێستا باسم کرد، بە هەستی خەجاڵەتیی ئەوەی نەیتوانیوە سوپاسی شایان بۆ لوتفەکانی خوا پێشکەش بکات و لە کاتێکدا هەموو سێ یەك و چوار یەك و پێنج یەك و دە یەکی چرکەیەك لە ژێر ڕێژنەی ڕەحمەتی ئەودا بەسەر دەبات، شوکرانەبژێری تەواو دەربڕێت؛ بتلێتەوە بە "سبحان الله" کردن ئەم خەجاڵەتیەی دەربرێت. ئەگەری هەیە لێپرسینەوە لەگەڵ خۆیدا بکات و بڵێت "ساتێکم لێ گوزەراوە" و داوای لێخۆشبوون بکات.

## لە خۆ پرسینەوە و گومانی باش بردن

بابەتێکی گرنگی تر ئەمەیە: کاتێك من دەربارەی خۆم بیردەکەمەوە دەبێت بڵێم: خوێندنی تەسبیحاتەکان بە درێژی پاش هەموو نوێژێك و خوێندنەوەی بەشێك لە دوعاکانی "مجموعة الاحزاب" و تەرخانکردنی کاتژمێرێك دوو کاتژمێر بۆ زیکر و فیکر، هەرگیز بۆ کەسێك لەم حاڵەی مندا بێت بە بەجێگەیاندنی شوکرانەبژێری دانانرێت. بەم تۆزقاڵە ئەوراد و ئەزکارەمەوە گەر شتێك بە من بوترێت دەبێت "تەمبەڵ" یاخود "داماو و کۆڵەوار" بێت. بەڵام کاتێك بیر لە هاورێکانی نێو خزمەتی ئیمانی و قورئانیم دەکەمەوە، گەرچی جا با ئەوان وەك هەر کەسێکی ئاسایی تر، پاش نوێژەکان تەنها تەسبیحاتە زانراوەکانی وەك "سبحان الله، الحمد لله، الله أكبر" بخوێنن. یاخود بە وتنەوەی زیکرەکانی "یاجمیل یا الله" ناوەکانی پەروەردگار بە دوور و درێژی بژمێرن، پێویستە بڵێم "ان شاء الله" ئەوان ئەرکی بەندایەتییان لە چوارچێوەی باری گشتی و گونجانی مەرجەکاندا بەجێ هێناوە، بۆ ئەوان وا پێویستە گومانی باشم هەبێت، بۆ خۆشم نابێت هێندەی گەردیلەیەك رێگە بە گومانی باش بدەم.

وەگەرنا، وەك کەمێك پێش ئێستا باسم کرد، گەر بیرکرنەوەیەکی لەم شێوەیەم دەربارەی مرۆڤەکان هەبێت کە "هیچ کەسێك ئەرکی سەرشانی لە ئاستی خۆیدا بە جێ ناگەیەنێت" ئەوە گومانی خراپم بردووە.

گەر بڵێم "ئەمانە ئەرکی زیکرکردن و بیرکردنەوە و سوپاسگوزارییان بە باشی بەجێناهێنن" لە گومانی خراپەوە گلاوم، ئەوەش مەترسی دارە و دۆڕان و خەسارەتمەندیی لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت.

با ئەمە ببەستمەوە بە تێبینییەکەوە کە هەمیشە دووبارەی دەکەمەوە. پێویستە لەگەڵ خۆماندا وەك لێکۆڵەرێکی یاسایی مامەڵە بکەین کە هەمیشە بە شوێن

هەڵەدا دەگەڕێت و هەڵەکان دەدۆزێتەوە و لێپرسینەوەکان زۆرتر و فراوانتر دەکات. بەڵام بۆ کەسانی دیکە وەك پارێزەرێکی فەخری بین و هەمیشە لە سەریان بکەینەوە و پارێزگارییان لێ بکەین. دەربارەی کەسانی دی هەمیشە گومانی باشمان هەبێت و دەربارەی خۆشمان بەردەوام لێپرسینەوە بکەینە بناغەی مامەڵەکردنەکانمان.

دەمەوێت پەراوێزێکی بچوکی دی لێرەدا دابنێم: گەرچی من نابمە پێوەر، بەڵام هەندێك شت هەیە زۆر نارەحەتم دەکەن. بۆ نموونە لە نوێژدا هەندێك کەس لە پشتی ئیمامەوە دەنگ دەردەکەن. یەکێك لە جێی خۆیدا وەستاوە و وەك بڵێی گەرووی بگوشن دەڵێت "الله اکبر" دەڵێت "ئەتتەحییاتو وەسسەلاتو لیللاهی..." لە ئایندا بەرپرسیاریەتییەکی لەم شێوەیە نیە. مرۆڤ پێویستە دەنگی هێندە بەرز بکاتەوە کە خۆی بیبیستێت و لێی تێبگات. گەر لە گۆشەیەکەوە تەماشای ئەمە بکەن ڕەنگە بڵێن "ئەمە جۆرێکە لە ڕیا" لەڕاستیدا بەو جوڵانەی بۆ ئاگادارکردنەوەی کەسانی دی دەکرێت، دەوترێت "سومعە" ئەو جوڵانەش کە بۆ خۆنیشاندان و دەرخستنی خود بێت لە لای خەڵکی دی پێیان دەوترێت "ڕیا".

دەی لە بەرامبەر کارێکی لەم شێوەیەی کەسێکەوە، ڕەنگە بە بیرماندا گوزەر بکات کە ئەو کەسە "سومعە". بۆ نموونە شەو زوو هەڵدەستێت، بە توندی دەرگاکان دەکاتەوە و دایان دەخات. کارێك دەکات دەنگی دەستنوێژگرتنەکەی بێتە گوێمان. ئێمەش ڕەنگە ئەوە بێت بە خەیاڵماندا کە "داخۆ ناکرێت بێدەنگانەتر ئەم کارە ئەنجام بدات؟ ناکرێت ئەم ڕێبوارییە کە بەرەو خوا ئەنجامی دەدا بە بێدەنگی بێت، گەر زۆر گیانی ناسکە ئایا نابێت ئەم ناسکییەی هێندە ڕەق نیشان نەدات کە کەسانی دی لە بارەیەوە گومانی خراپ بەرن؟" ئەمە لایەنێکی بابەتەکەیە. لایەنێکی دیکەی ئەوەیە بپرسین "بۆچی ئێمە لە بارەی ئەم پیاوە بەم شێوەیە بیر دەکەینەوە؟" چونکە گەر مرۆڤ بەشێوەیەکی ئیرادی کۆمەڵێك شت

بخاتە سەر بەندایەتی و پەرستشەکەی کە لە کاتی دیاری کردنی ئەو بەندایەتی و پەرستشە لە لایەن خواوە فەرمانی پێ نەکرابێت، ئەوا ئامانجێکی دیکەی تێکەڵ بە کارەکەی کردووە. لە ئاییندا، نەهاتووە کە لە پشتی ئیمامەوە وەك ئەوەی قورِگت بگوشن دەنگ دەربکەیت. ئەوە نەهاتووە کە لە کاتی بەندایەتی و پەرستشدا دەنگت لێوە بەرزبێتەوە. هەموو ئەمانە لە ڕوانگەی ئاینەکەمانەوە بە سومعە دادەنرێن، هەر بۆیە بە چاوی ڕیا و سومعەوە لەم جۆرە کارانە دەڕوانرێت.

گەر لە دڵی مرۆڤدا هەر بەڕاستی ناسکبوونەوەیەکی وەها نەبێت کە تێکیشکاندبێت، هەر بەڕاستی کەشی مەعنەوی بەو جۆرە نەبێت کە گەرووی گوشرابێت، کاتێك دەڵێت "الله" حاڵی نەگۆڕێت و هەر لەسەر ڕەوتی خۆی بەردەوام بێت، ئەوە مافی ئەوەی نییە خۆی وەك بەندەیەکی زۆر باش نیشان بدات. ئەو مرۆڤی ئەو ئاست و پایەیە نییە تا لە ناو خەڵکدا ناڵەی "الله"ی لێ بەرز ببێتەوە. گەر بەویست و پاش بیرکردنەوە ئەوە بڵێت، لەکاتێکدا دەتوانێت ڕێی لێبگرێت، ڕێگر نەبێت و بیڵێت، ئەوە واتای ئەوەیە ڕیا و سومعەی ئەنجامداوە.

ئەمە واتای تێکەڵ کردنی شتێکە بە پەرستشەکان کە لە بنەڕەتدا شتی لەو شێوەیەی تێدا نییە. لەبەر ئەوەیە پێغەمبەری خوا دەربارەی ڕیا پەسنی "دبیب النمل"ی بەکارهێناوە. واتە وەك جێ پێی ئەو مێروولە وەهایە کە لە تاریکیدا ڕێ دەکات. پێی نازانن، تێکەڵ بە پەرستشەکانتان دەبێت و پێی نازانن.

## گەنجینەی شاراوە (کنز المخفي)

ئایا مرۆڤ دەتوانێت حەقیقەتی حەقیقەتەکان بزانێت و هەستیان پێبکات؟ زۆر شت هەیە کە مرۆڤ پێویستە بیزانێت، ببینێت و هەستی پێبکات. بەڵام

گرنگترینی ئەمانە بێ هیچ گومانێك حەقیقەت و حەقیقەتی حەقیقەتەکانە، چ حەقیقەت و حەقیقەتی حەقیقەتەکان و چ ئەو شتانەی لە خوارەوەی ئەمانەوەن هەموو دەشێت لە لایەن مرۆڤەوە بزانرێن و هەست و دەرکیان پێ بکرێت و بدۆزرێنەوە. بەڵام زۆر هۆکاری ڕێگریش لە بەردەم ئەمەدا هەیە. بەدەربڕینێکی دی مرۆڤ لە سەر ماهییەتێك دروستکراوە کە توانای دەرك کردن و تێگەیشتنی ئەم شتانەی هەیە. بەڵام ئەو شتە دژ و پێچەوانانەی لە خودی ماهییەتیدا هەن دەکرێت ببنە ڕێگر لە بەردەمیدا. بۆ نموونە، جەنگی دەرەکی و ناوەکی مرۆڤ لەگەڵ شەیتان و نوێنەرانی بیری شەیتانی، یاخود بەربەرەکانێی نێوان دڵ و نەفس، بە واتایەکی گشتگیرتر بەریەککەوتنی ئەو هەستە پێچەوانانەی لە سیستەمی نەفس و دەروونی مرۆڤدا بوونیان هەیە. دەی تەنها سەروەرمان توانیویەتی بەسەر ئەم ڕێگرانەی گەیشتن بە حەقیقەتدا سەر بکەوێت. کاتێك ئەو دەربارەی خۆی دەڵێت "نەفسم تەسلیمی من بووە" هەواڵی سەرکەوتنی دڵیمان پێ دەدات و بە یادمان دەهێنێتەوە کە نەفسی ئەو لە بەرامبەریەوە شکستی هێناوە. بەڵام دەستگەیشتنی هەموو کەسێکیش بەمە، شتێکی ئاسان نییە.

## ئایا نەفسی ئێمە و نەفسی سەروەرمان هەریەک خاوەنی تایبەتمەندی جیاوازن؟

ڕەنگە... ئەو نەفسێکی تایبەت بە خۆی، نەفسێکی زاکیە (هەمیشە پاك و پاکیزە)، نەفسێکی زەکییە (بە تەواوی واتا پاك و سازگار و بێ خەوشی)ی هەبوو، بە تەواوی تایبەت بە ئەو... دەکرێت بەم شێوەیەش لێکدانەوە بکەین: ڕەنگە نەفسی ئەو تەواوی تایبەتمەندییەکانی نەفسی لە خۆ گرتبێت بەڵام ئەو تایبەتمەندییانە لە بەرامبەر ئیرادەی سەرورەرمانەوە هەر زوو چۆکیان داداوە و خۆیان داوە بە دەستەوە.

گەر ئەو تێڕوانینی نوور و تاریکییەی لە زەردەشتیەت و براهمانیەت و هەرمەتیزمدا هەیە قەبوڵیشی نەکەن، ڕاستییەك هەیە کە دەبێت دەربارەی بدوێین: مرۆڤێك هەیە کە هەم لایەنی شەیتانی و هەم لایەنی فریشتەیی تێدایە. نەفسی ئەممارەش (ئەو نەفسەی بەردەوام هانی مرۆڤ دەدات بۆ خراپە) لە ناو ناخی ئەم مرۆڤەدا وەك دەسکیسەی شەیتان کاردەکات. تا ئەو نەفسە وەك نەفسی ئەممارە بمێنێتەوە، بوونەوەرێك دەبێت بەردەوام لە ناخی مرۆڤدا سیخوڕی بۆ شەیتان دەکات و بەردەوام ڕێنماییەکانی ئەو جێ بەجێ دەکات. تا ئەو کاتەش مرۆڤ خۆی لێ رزگار نەکات ناتوانێت نزیکیی شەیتان لە خۆیەوە بنەبڕ بکات. تا ئەو کاتەش مرۆڤ لە شەیتانەوە نزیکە -گەرچی خوا لە شادەماری مرۆڤ نزیکتریش بێت لێوەی- هێشتا مرۆڤ لە خواوە دوورە.

## ئایا دەکرێت بەسەر ئەم بارە سەختەدا سەربکەوین؟

ئەم بارە بارێکی زۆر سەختە و مرۆڤ تەنها بە یەك مەرج دەتوانێت بەسەریدا سەربکەوێت ئەو مەرجەش "سەیر و سلوکی ڕۆحانییە" کە دەتوانین وەك پەروەردەکردنی رۆح ناوی بنێین، جەزب و ئینجیزاب و نیشاندانی کۆڵەواری و هەژاری لە بەرامبەر خوا و ڕوتێکردنیەتی. بە پێچەوانەوە ئەو مرۆڤە، هەردەم لە خواوە دوور دەبێت. وەك کەمێك پێش ئێستا عەرزم کردن خوا لە شادەماری مرۆڤ نزیکترە لە مرۆڤەوە، بەڵام مرۆڤێکی لەم جۆرە فەرسەخ فەرسەخ لە خواوە دوورە چونکە بە دەربڕینی قورئان شەیتان بووەتە "قرین - دۆستی زۆر نزیك "[1]ی لەم ڕوانگەوە مرۆڤ دەبێت زۆر بە باشی شارەزای ئەو شتانە بێت کە لە خوا دووری دەخەنەوە یاخود لە ئەو نزیکی دەکەنەوە. لە بنەڕەتدا مرۆڤ

---

١. الزخرف: ٣٦.

بەو تایبەتمەندییانەوە کە لە دڵیدا هەیەتی، بە لەتیفە ڕەببانییەکانیەوە، بە فوئاد و سیرڕ و خەفایەوە نوێنەر و کۆتەڵی فراوانییە. ئەوانەی لەم ڕوانگەوە لە مرۆڤ دەڕوانن، ئەو بەرزتر لە فریشتەکانیش دەبینن. چونکە ئەو بوونەوەرێکە هەم بە ڕووی مولکدا کراوەتەوە هەم بە ڕووی مەلەکووتدا. پارچەیەکە لە کتێبی گەردوون و بگرە نموونەی هەڵبژاردە و ناوەڕۆکی ئەم کتێبەیە. هەر بۆیە ئەوەی ئەو بخوێنێتەوە تەواوی گەردوونی شیتەڵ کردووە. بەدەربڕینێکی تر ئەوەی دەیەوێت کتێبی گەردوون بخوێنێتەوە بە تەماشاکردنی ئەو مرۆڤەی بە ناوەڕۆکی کتێبەکە دادەنرێت، دەتوانێت بە جارێك چاو بخشێنێت بە هەموو ئەو شتانەدا کە لەم کتێبە مەزنەدا بونیان هەیە.

بەڵێ، مرۆڤ خاوەنی ماهییەتێکی لەم شێوەیە. بەڵام لە هەمان کاتدا مرۆڤ تەنها بە گەردوونەوە سنووردار نییە. بەڵکو ئەویش تێدەپەڕێنێت. بوونەوەرێکە "ماهییەتی لە مەلائیك بانتر و عەوالیم تێیدا پەنهان و جیهانیان لەودا کۆ کراوە". بگرە بە زیادەوە ئەمەش تێدەپەڕێنێت وەك بڵێیت ئاسمانەکان و زەوی بە تەواوی واتا و ناوەڕۆك و بەرینییانەوە کۆکراونەتەوە و خراونەتە شێوەی کتێبێك و پاشان وێنەیەکی لەبەرگیراوەی مەزنی لە مرۆڤدا پیشاندراوە.

## ماهییەتی مرۆڤ لە فریشتەکان باڵاترە

باسی ئەوەمان کرد کە مرۆڤ بەو تایبەتمەندییانەوە کە هەیەتی لە فریشتەکان پلەی باڵاترە، بەڵێ، فریشتە بەڕێزەکان لە ڕوانگەی پلە یاخود ئەو ڕەهەندەوە کە تیایدا دەژین دەکەونە دەرەوەی ئەو جیهانە فیزیکییەی ئێمە دەیزانین. دەکرێت دەست بخەنە نێو دنیای فیزیکەوە، دەکرێت ڕەنگدانەوەیان هەبێت یاخود وەك ئاوێنە بدرەوشێنەوە، بەڵام ئەوان لەدەرەوەی ئەم جیهانەن. ئێوە ناتوانن بە یاساکانتان

بوونی ئەوان بسەلمێنن، هەڵسەنگاندنیان بۆ بکەن، واتایان پێ ببەخشن، شیتەڵ یاخود شیکاریان بۆ ئەنجام بدەن.

ڕۆحانیەکانیش هەر بەهەمان شێوەی فریشتەکانن. هەروەك ئەم فریشەتە و رۆحانیانە خاوەند ژمارەیەکی نەبڕاوە لە "جنود-سەربازَ"ی هەیە لەگەردووندا کە هێندەی ژمارەی گەردیلەکان دەبن. گەر بێینە سەر مرۆڤ ئەوا ئەو لە جیهانی فیزیکیدا ژیان بەسەر دەبات بۆیە دەتوانێت دەستی لە کارە فیزیکییەکانی بوونەوەردا هەبێت. بەڵام بە هۆی فرەلایەنی بوونیەوە دەتوانێت ئەم جیهانە فیزیکیە تێبپەڕێنێت و لەگەڵ جیهانە جۆراوجۆرەکانی تردا پەیوەندی بگرێت.

بۆ نمونە جیهانی ئەسما (ناوەکانی جەنابی حەق) هەیە ئەو جیهانە پەیوەندی بەم جیهانەوە، واتە بە جیهانی فیزیکەوە هەیە. لە نێوان بوونەوەرە خاوەن هەستەکانیشدا تەنها مرۆڤە کە دوێنراوی ئەم جیهانەیە. جەنابی حەق سیفاتی سوبحانییە و ئەسمای ئیلاهییەی هەیە و لە نێو ئەمانەشدا ئەوانەی دەیزانین زۆر زۆر کەمترن لە چاو ئەوانەی نایانزانین، لە نێو ئەمانەدا کۆمەڵێك ناو و سیفاتیش هەن کە کەس - بەدەربڕینی فەرموودەکە - نایانزانێت. لە نەزدی ئولوهییەتدا ئیستیسار کراون، واتە "جەنابی حەق خۆی تایبەتمەندی کردوون و لای خۆی پاراستوونی". هەندێك لە مرۆڤ بە پەیوەندی لەگەڵ جیهانی "ئەسماء و صیفات"دا دەتوانن بگەن بە ئەو ناو و سیفاتانەی کە لای هەموو کەس زانراو نییە، بەم شێوەیەش مرۆڤ ئەم جیهانی فیزیکە تێدەپەڕێنێت و دەڕواتە ئەو دیوی ئێرەوە.

ئەم حاڵەتە بۆ ئەو شتانەش کەلەدەرەوەی ئەسماء و سیفاتن هەر دەگونجێت روویدات. بۆ نموونە کاتێك مرۆڤ لە ئاسۆی "فوئاد - دڵ"ەوە دەڕوانێتە بوون و ئەودیوی بوون، جیهانی جەبەروت دەبینێت. لەوێدا حەقیقەتی تەواوی سیفەتەکان

دەبینێت، دەبینێت و دەگاتە ئاسۆی سیرڕ "ئاسۆی نهێنییەکان". ئەم جارە دەرفەتی موشاهەدەکردنی جەنابی حەق بەدەست دەهێنێت و لە نێوان خۆی و ئەودا جۆرێك مامەڵە دێتە بوون. ئەمە جۆرێك لەبەهرەوەرکردن و چاکەی ئیلاهییە.

بۆ نموونە دەگونجێت جەنابی حەق بە سوبوحاتی ڕووی خۆی دەموچاوی ئەم کەسە ڕۆشن بکاتەوە، لەم لاشەوە کاتێك خوا بە سوبوحاتی ڕووی لە بوونەوەر بڕوانێت هەموو شتێك لە هەستی سالیك "ڕێبواری ڕێی حەقیقەت"دا دەبێتە خۆڵەمێش و لەناو دەچێت. تەنها "ئەو" دەمێنێتەوە. ئەو کەسەش دەگاتە ئەم ئاستە ڕەنگە وەك موحێدینی عەرەبی بڵێت "لا موجود الا هو". وتەیەك کە بابەتێکی کەسی و بەستراوە بە تاکەوەیە.

## لا موجود الا هو

حەزرەتی محێدینی عەرەبی دەڵێت "لا اله الا الله - هیچ پەرستراوێك نییە جگە لە خوا" تەوحیدی عەوام؛ خەڵکی گشتییە. "لاموجود الا هو - هیچ شتێك نیە جگە لە خوا تەوحیدی خەواس؛کەسانی تایبەتی خوایە" ئەمە بابەتێکە پەیوەستە بە حاڵێکەوە. سەرەنجامی موشاهەدەیەکە ئەو بەگوێرەی نیگای ئەو جێو پایەی تێیدایە ئەمە دەبینێت و دەبیستێت و باسی ئەوە دەکات کە دەیبینێت و دەیبیستێت. نایەوێت توشی دوفاقێتی بێت لەگەڵ خۆیدا. ئەوەی کە وەها ببینێت و وەها ببیستێت و شتێکی لەوە جیاواز بڵێت، ئەوە بۆ کەسانێکی وەك محێدینی عەرەبی مەحاڵە.

## ئایا خوا لە دڵدا دەدۆزرێتەوە

مرۆڤ وەك توانایی، خاوەنی ماهییەتێکی لەم شێوەیەیە. گەر بتوانێت بەو ئاستانەدا کە باسکران بەرزببێتەوە و بوونی بە فراوانی وەها بگەیەنێت کە هەموو گەردوون لە خۆیدا جێ بکاتەوە، ئەوا دەتوانێت "کنزا" خوا لەدڵیدا هەست پێبکات. لەمەشدا مەبەستمان لەو فەرموودە قودسییەیە کە خوا فەرموویەتی "کنت کنزا مخفیا فخلقت الخلق لیعرفونی" واتە "من گەنجینەیەکی شاراوەبووم، بوونەوەرم بەدیهێنا تا بمناسن".

حەزرەتی ئیسماعیل حەققی بورصەویش لە دانراوەکەیدا بە ناوی "کنز المخفي" ڕوونکردنەوە لەسەر ئەم بابەتە دەدات.

## گەنجینەی شاراوە (کنز المخفي)

خواوەند هەمیشە بە زانستی خۆی خۆی ناسیوە. بەهێز و تواناییەکەی کۆمەڵێك کاری دیاری هەبووە، بەڵام ئەو جیهانانە، جیهان گەلێکی جیاواز بوون، پاشان ویستی لە جیهانێکی پێکهاتوو لە ماددەدا ئەوەی کە پێی دەڵێن جیهانی فیزیکی ئێمە خۆی نیشان بدات و خۆی بناسێنێت. هەر بۆیە دەکرێت وەك دەربڕینێك بۆ حاڵی پێش تەجەللی کردنی خوا لە جیهانی فیزیکدا هەڵسەنگاندن بۆ "کەنزی مەخفی" بکەین. بەڵام دەبێت ئەوەش بڵێین، کە ئێمە لەبەر کورتهێنانی وشەکانە کە دەربڕینی "پێشتر" و "دواتر" بەکار دەهێنین. وەگەرنا بۆ خوایەك کە لە دەرەوەی کات و شوێنە و بێ پەروایە لێیان پێشتر و دواتر جێی باس نین.

کەواتە ئەم کەنزی مەخفییە، وەرز و کاتێکی دیاریکراوە. جەنابی حەق لە

بەرزەخیشدا خۆی نیشاندەدات. لەوێشدا بوون هەم لە چاوی خۆیەوە دەبینێت و هەم لە چاوی ئەوانەوە کە دەبینن. لە پاشان جیهانی لێپرسینەوە و پاداشت دروست دەکات. لەوێشدا دەبینێت و نیشاندەدات، ئەم جیهانەش جیهانێکی سەربەخۆیە کە هیچ شتێکی لەم جیهانەی ئێستامان ناچێت و دیارنیە کە چەند دەخایەنێت.

بۆ نموونە ئێمە لێرە دەڵێین ئەتۆم، پرۆتۆن، نیوترۆن؛ ڕەنگە لە دوارۆژدا دژە ئەتۆم، دژە نیترۆن، دژە پرۆتۆن و دژە پارتیکڵ هەبێت و خوا لەوانە جیهانێکیان دروست بکات و تێیدا تایبەتمەندیەکانی زات و سیفاتی سوبحانی خۆی نمایش بکات، چونکە ئاشکرایە هەموو زاتێکی خاوەن هونەر دەیەوێت هونەرەکەی نمایش بکات. پاشان ئەم ئاشکراکردن و نمایشکردنەی لە بەهەشتیشدا هەر بەردەوام دەبێت.

خۆنیشاندانی جەنابی حەق لەسەر شێوازی جیاواز لە جیهانە جیاوازەکاندا بە واتای گۆڕان و جیاوازبوون "تبدل و تغیر" نایەت. لای جەنابی حەق گۆڕان و جیاوازبوون و ڕەنگ و شێوە بوونی نییە. بەڵام ئەو نیعمەتانەی کە لە بەهەشتدا بە مرۆڤ دەبەخشرێن گۆڕان و جیاوازبوونیان تێدا دەبێت و ڕەنگ و شێوەی جۆراو جۆریان دەبێت. بەڵێ لەوێ هەردەم لەگەڵ شتانێکی تەواو جیاوازدا ڕووبەڕوو دەبینەوە.

## لەم جیهانەشدا "حیکمەت - دانایی" لە پێش "قودرەت - دەسەڵات و توانایی"ـەوەیە

ئێمە لەم جیهانەشدا ئەم جۆرە گۆڕانانەمان بەسەردا دێت لە عالەمی "الارواح - جیهانی ڕۆح"دا بووین، کەوتینە نێو "ڕەحمی مادەر - دایك"ەوە و بە

دەسەڵات و توانای بێ پایانی پەروەردگار لە یەکگرتنی تۆوێك و هێلکەیەکەوە بوونە بوونەوەرێك کە پێی دەڵێن "من". ئەو شتانەی لەم جیهانەدا ئەنجام دەدرێن بە هۆی دەسەڵاتی ئەوەوەیە بەڵام حیکمەت دوو هەنگاو لە پێش "قودرەت - دەسەڵات و توانایی" نیشاندانەوەیە چونکە هەموو ئەمانە -بەواتایەك لە واتاکان- دەبێت ببەسترێنەوە بە کۆمەڵێك یاسای نەگۆڕەوە.

دەبێت ئەو ڕێسایانە دابنرێن کە پێیان دەڵێن "عاداتی سوبحانی" بۆ ئەوەی ئەو مرۆڤەی جێنشینی دروستکراوە، کاتێك دەست وەردەداتە شتەکانی ئەم جیهانەوە سەرسام و دەستەوسان نەبێت و دەستی بەیەکدا نەیەت.

چونکە گەر بۆ نموونە یەکگرتنی دوو توخم ئەمڕۆ ماددەیەك دروست بکات و سبەینێ ماددەیەکی تر دروست بکات، ئێوە ناتوانن هیچ شتێك لە بواری زانستدا بخەنە مەیدان. بۆیە حیکمەت لەم جیهانەدا دوو هەنگاو لە پێش قودرەتەوەیە. بە دەربڕینێکی دی هەموو شتێك بە قودرەت دروست دەکرێت بەڵام هەموو شتەکان لەسەر ڕێڕەوی حیکمەت دەڕۆن بەڕێدا. گەر دەربڕینەکە دروست بێت حیکمەت دەڵێت "لێرە قسەی من دەخوات".

# هەندێک لەو سەرچاوانەی سوودیان لێ وەرگیراوە


١- عبد إبن هميد، إبن نصر أبو محمد: المسند.

٢- عبدالرزاق، أبو بكر عبدالرزاق بن همام: المصنف.

٣- أحمد إبن حنبل، أبو عبدالله الشيباني: المسند.

٤- آلوسي، أبو سينا شهاب الدين محمود إبن عبدالله: روح المعاني في تفسير القرآن العظيم.

٥- بەدیعوززەمان، سەعیدی نورسی: سەرجەمی پەیامەکانی نوور.

٦- البيهقي، أحمد إبن حسين: السنن الكبرى.

٧- البزار، أبو بكر أحمد إبن عمر إبن عبدالخالق: المسند.

٨- البخاري، أبو عبدالله، محمد إبن إسماعيل: صحيح البخاري.

٩- الجرجاني، سيد شريف علي إبن محمد: التعريفات.

١٠- الدارمي، عبدالله بن عبدالرحمن: السنن.

١١- الديلمي، أبو شجاع بن شيرويه بن شهردار: فردوس الأخبار بمأثور الخطاب.

١٢- أبو داود، سليمان بن أشعث السجستاني: السنن.

١٣- أبو نعيم، أحمد إبن عبدالله الأصفهاني: حلية الأولياء و طبقات الأصفياء.

١٤- أبو يعلاء، أحمد إبن علي إبن مثنى الموصلي التميمي: المسند.

١٥- محمد فەتحوڵلا گولەن: القلوب الضارعة.

١٦- الحكيم، أبو عبدالله محمد بن عبدالله النيسابوري: المستدرك على الصحيحين.

١٧- إبن عبدالبر، أبو عمر يوسف بن عبدالله النميري: جامع بيان العلم، التمهيد.

١٨- إبن عساكر، أبو القاسم ثقة الدين علي بن حسن بن هبة الله: تأريخ مدينة دمشق.

١٩- إبن أبي شيبة، عبدالله إبن محمد: المصنف في الأحاديث و الأثار.

٢٠- إبن الحجر، أحمد إبن علي إبن جعفر العسقلاني: فتح الباري بشرح صحيح البخاري.

٢١- إبن حبان، أبو هيثم محمد إبن حبان إبن أحمد التميمي:صحيح إبن حبان.

٢٢- إبن ماجة، محمد بن يزيد القزويني: السنن.

٢٣- بن الجوزي، عبدالرحمن بن علي بن محمد: كشف المشكل من حديث الصحيحين.

٢٤- ابن الأثير، عز الدين أبو الحسن الجزري: أسود الغابة.

٢٥- مالك بن أنس، أبو عبدالله الأصبهاني: الموطأ.

٢٦- المناوي، محمد المدعوف بن عبدالرؤف: فيض القدير شرح الجامع الصغير.

٢٨- مسلم، أبو الحسين الحجاج النيسابوري: صحيح المسلم.

٢٩- النسائي، أبو عبدالرحمن أحمد بن شعيب: السنن الكبرى.

٣٠- النووي، أبو زكريا يحيا إبن الشريف: شرح صحيح المسلم.

٣١- الرازي، أبو عبدالله فخرالدين محمد بن عمر بن الحسين: مفاتح الغيب.

٣٢- السخاوي، أبو الخير شمس الدين محمد بن عبد الرحمن: المقاصد الحسنة،

٣٣- السيوطي، عبد الرحمن بن الكمال جلال الدين:الدر المنثور الإتقان في علوم القرآن.

٣٤- الشافعي، أبو عبدالله محمد إبن إدريس: الأم.

٣٥- الطبراني، أبو القاسم سليمان بن أحمد: المعجم الأوسط، المعجم الكبير.

٣٦- الطيالسي، أبو داود سليمان بن داود: المسند.

٣٧- الترمذي، أبو عيسى محمد بن عيسى بن سورة: الجامع الصحيح.

# گۆزەی شکاو

محمد فەتحوڵڵا گولەن

"گۆزەی شکاو" نموونەی بیری میانڕەوە. بە دەربڕینێکی ڕوونتر نموونەی بەرجەستەبووی "ڕێگە ڕاستەکە"مان دەخاتە پێش چاو. بانگمان دەکات بۆ ئەوەی لە سەر تا پێ چاو بە خۆدا بخشێنینەوە و موحاسەبەی نەفسمان بکەین.

لە لایەک بە موژدەکانی هەوێنی تاسەمەندیی خزمەت لە گیانماندا دەنێتەوە و لە لایەکی دیکەوە بیرمان دەخاتەوە و دڵمان ڕادەچڵەکێنێت کە دادگای ئیلاهی لێپرسینەوە لەگەڵ یەک بە یەکی مرۆڤەکاندا دەکات. ئەو مردن و زیندووبوونەوانەی لە نێوان ترس و ئومێددا بەسەرمان دێت، زیاتر لە پەروەردگارمان نزیک دەکاتەوە؛ ئەمانە دەبنە هۆی ئەوەی ئێمە پەناببەینە بەر شەفەقەت و میهرەبانی و کۆمەکی ئەو. ئەو ئاسودەییەی کە لە پەنابردنە بەر ئەوەوە دەست دەکەوێت لە نێو دێڕەکانی ئەم کتێبەوە دەڕژێت بەسەر دڵە برینداراکانماندا و بەرەو ئاسۆ نوێیەکان دەمانبات.



9 649750 000536
Kırık Testi-1

نرخی ٣٠٠٠ دینارە

İRFAN PUBLISHING